# چین چۆن بیردەکاتەوە؟

نووسینی

مارک لیونارد

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە

بەختیار عام شێخ



## دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

- **چین چۆن بیر دەکاتەوە**

- **نووسینی:** مارک لیۆنارد
- **وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە:** بەختیار مام شێخ
- **نەخشەسازیی ناوەوە:** گۆران جەمال ڕواندزی
- **بەرگ:** وریا بوداغی
- **ژمارەی سپاردن:** ٩٣٢
- **نرخ:** ٢٥٠٠ دینار
- **چاپی یەکەم** ٢٠١٠
- **تیراژ:** ٧٥٠ دانە
- **چاپخانەی خانی (دهۆک)**

**زنجیرەی کتێب ([illegible])**

## ناوەڕۆک

## نووسەری ئەم کتێبە

### مارک لیۆنارد Mark LEONARD

بەڕێوەبەری ڕاپەراندنی ئەنجوومەنی پەیوەندییە ئەوروپاییە کە یەکەمین دەزگای بیرمەندی ئەوروپاییەکە نووسینگەی لە بەرلین، پاریس، سۆفیا و وارشۆ هەیە. پێشتریش لە سەنتەری چاکسازی ئەوروپی کاریکردووە و دامەزرێنەر و بەڕێوەبەری سیاسەتی دەرەکییە. ماوەیەکی لە واشنتۆن بەسەر بردووە وەك لێکۆڵەرەوەیەکی هەردوو بەری زەریا "Transatlantic" لە کۆمەڵەی ئەڵمانی مارشاڵ " German Marshall Fand" لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ماوەیەکیش لەبەیین وەك مامۆستا و لێکۆڵەرەوەی "Visiting Scholar " لە ئەکادیمیای چینی بۆ زانستە کۆمەڵایەتییەکان. یەکەمین کتێبی نووسەر بۆ چی ئەوروپا سەدەی ٢١ بەڕێوە دەبات.

"Why Europe Will Run The Zlst Century"

بۆ ١٨ زمان وەرگێڕدراوە. نووسین و لێکۆڵینەوەکانی مارك لە ئەمریکا و ئەوروپا بلاو بوونەتەوە لە:

The Guardian,The Financial Tiwes,The Spectator,The Sun,Liberation,Die Welt and The Wall Street Journal.

# سوپاس و پێزانین

دوا به دوای پانزده‌ی سێپتەمبر گفتوگۆیەکی گەرم لە ئارادا بوو سەبارەت بە پەیوەندی نێوان ئەوروپا و ئەمریکا. وا دەردەکەوت کە جیهانی رۆژئاوا بوو بوون بە دوو بەش و نوێنەرایەتی دوو نموونەی جیاوازی سیستەمی جیهانیان دەکرد. ئەمریکییەکان لە مەریخ و ئەوروپییەکانیش لە ڤینۆس.

لە لایەك ئەمریکییەکان دەیانویست بالاَ دەستی سەربازیان بەکار بهێنن بۆ ئەوەی هەر خۆیان بە زلهێز بێننەوە بۆ بنیادنانی سیستەمی جیهانی لیبرال بە دیدی ئەمەریکی. لە لایەکی تریش یەکیتی ئەوروپا نوێنەرایەتی سیستەمێکی تاسیش دەکرد لە رێگای پشت بەستن بە بەستنەوەی نێوان سیاسەت و ئابووری هەروا چارەسەری کێشەکانیش لە رێگای یاسا بێت نەك هێز.

ئەم جۆرە گفتوگۆیانە کە جێگای نیگەرانییە بوون بە هاندەرم تا یەکەم کتێبم لە ژێر ناونیشانی (بۆ چی ئەوروپا چەرخی ۲۱ بەرێوە دەبات) بنووسم کە تیایدا باس لە گرنگی و لەدایکبوونی نموونەی ئەوروپی دەکەم و بە دەستکەوتێکی گرنگ و مێژوویم لە قەڵەم داوە. لە وێدا پێشبینی ئەوەم کردووە کە تا ئێستاش باوەڕم پێ هەیە کە چۆن نموونەی ئەوروپی لە وانەیە ببێتە کاریگەرترین سیستەم لە جیهان تا کۆتایی ئەم سەدە. ئەمڕۆش ئەم جیابوونەوەی نێوان ئەوروپا و ئەمریکا زیاتر ئاڵۆز بووەتەوە هێرشە ئایدۆلۆژییەی کە کێ بڕکێ و ململانێ لەگەڵ هەردوو لایاندا دەکات کە ئەلتەرناتیڤێکە لەو دیوی ئەوروپای رۆژئاوا دەشەکێتەوە.

بیروباوەری سەروەری دیموکراسی (Sovereign Democracy) روسی و خەونی ئیسلامی بۆ سیستەمێکی ئایین (سیوکراتی) حاڵی حازر کێشەی گەورەیان دروستکردووە، ئەگەر چی رەنگە دیاردەیەکی کاتی بن. بەڵام چین بە قەبارە مەزنەکەی بە ئابوورییە زیندووەکەی و توانای سیاسی سەرکردەکانی لایەنێکی بە هێز

پێکدێنن بۆ سەروەری کردنی جیهان لەمەودا دوورا. هەرچەندە بە دەرزەن کتێب سەبارەت بە بووژانەوەی چین بلاو کراونەتەوە،

بەلام زۆربەی نووسەران وەك هێزێك یان بلۆکێکی ئابووری، سیاسی و سەربازی مامەڵەی لەگەڵ دەکەن لە جیاتی ئەوەی وەك ماڵێکی پڕ لە بیرو بۆچوون کە کاریگەری لەسەر هەموو جیهان دەبینێت ببینن.

شتێکی زۆر کەم دەزانن سەبارەت گفتوگۆی نێوان بیرمەندانی چینی "Chinas Lntellctual debates"یانیش سەبارەت ئەو کێبڕکێیە ئایدۆلۆژییەی تێگەیشتن لەو بیرۆکانەی گەر سیاسەتدارێژەرانی ئەورووپی پێویستیان دەبێت گەر بیانەوێت بانگەشەو بانگەواز بۆ دیدی خۆیان بۆ جیهان بکەن.

ئەم کتێبەم وەك ئەوەی پێشترم لەسەر ئەورووپا رووناکی نەدەدیت بەبێ یارمەتی وەکیلەکانم (Agents) ماگی پێرستاین (Maggie Pearstine) و جەیمی کراوفۆرد (Jamie Craw Ford). بەلام ئەو بوونی کتێبەکە ئەنجامی پێشبینی سەرنواری هاورێی بە توانای روبن هارڤی (Robin Harvie). بە ژیری و وریایی بوون بە هاندەر و یارمەتیدەرم بۆ ئەوەی چاکتر بنووسم. بە سەبرو تەحەمولێکی زۆر و زۆر بە هەستی ناسك و زیرەکی بێ هاوتا.

من زۆر منەتباری زۆر لەو بیرمەند و نووسەر و کارمەندی دەوڵەت و هی تری چینیم. کە کاتیان تەرخانکرد بۆ ئەوەی قسەیان لەگەڵ بکەم. نووسینەکانیان خستە بەردەستم لە سەفەرەکانم بۆ چین ژمارەیان یەکجار زۆرە کە باسیان بکەم، بەلام من چەند کەسێکیان ناو دەهێنم کە زۆر یارمەتیدەرم بوون.چوشوو لۆنگ chu shulong, چیوی زهیایان Cui Zhiyuan، فان گانگ Fan Gang،فانگ ننگ Fang Nang،فیگ زهوگپینگ ، گانگ یانگ Gan Yang،هان د گیانگ Han Degiang، هی زینگك He Zengke، هس لیو Hs Liu، هوئانگانگ Hu Angang، هوانگ پینگ Huang Ping، جیانگ زیاو جولن Jinag Xiaojuan، جن کانرۆنگ Jin Canrong، کانگ شاوۆ یانگ Kang

Shaobang، لای هـایرۆنگ Lai Hairong، لی داوز کیـوی Li Daokui، لی جینگهـاوه Li Jinghua، لی جونرِوو Li Junru، لیـو گیـانفی Liu Jian Fei، مازهینـگانگ Ma Zhengang، پان ویی Pan Wei، پانگ زهونگیانگ Pang Zhongying، پان یووی Pan You، کن گانگ Qin Gang، کن هیـوی Qin Hui، کن یاکینگ Qin Yaging، روان زۆنگزی Ruan Zongze، شـین دنگلـی Shen Dingli، شین دۆنگ Shen Dong، شی ینهۆنگ Shi Yinhong، سونگ خینیگ Song Xinning، وانگ هووی Wang Hui، وانگ گـسی Wang Jisi، وانگ شاوز گانگ Wang Shaoguang، وانگ خیاو دۆنگ Wang Xiaodong ، وانگ یووی Wang Yiwei، وانگ یاز هوو Wang Yizhou، یـووی بایـایی Wu Baiyi، یووی جیانمن Wu Jianmin، خیانگلن خوو Xianglin Xu، یـان خیوتۆنگ Yan Xuetong، یانگ جیمان Yang Jemian، یانگ یـاوز Yang Yao، یوو جیا فوو Yu Jiafu، یوو کیپـینگ Yu Keping، یـوو یۆنگـدینگ Yu Youngding، زهـا داوز جیـونگ Zha Daojiong زهـانگ ویینـیگ Zhang Weiying، زهاوز تنگ یـانگ Zhao Ting Yang، زهیـنگ بیجیـان Zhen Bijian، زهاوز هۆنگ Zhou Hong، .

من سوپاسگوزاریی تایبەت ئاراستەی هاوڕێکانم و برادەرانم لە ئەکادیمی چینی بۆ زانستە کۆمەڵایەتییەکان دەکەم کە چەندین جار میوانداریان کردم لە سەفەرە زۆرەکانم بۆ بەیکین، بە تایبەتی کە وەك لێکۆڵەرەوە Scholar لە هـاوینی ۲۰۰٦ پێشوازیان لێکردم.

کاری ژمارەیەك لە شارەزایان و چاودێرانی چین بوو بە هانـدەر و یارمەتیـدەرێکی زۆر چاك بۆ من لە وانەش: ولیم ئیهـرمن William Ehrwann ئـارون فریـد بـیرك Aaron Friedberg، جۆزێف فیوسمیس Joseph Fewsmith، کریستۆفەر هـام Christopfer Hum، رۆد ماکفـارکر Rod Mac Farquhar، لولتیـا و مـاتیی میهالکـه Lolita and Mattei Mihalca، جیمس میـاز Jemes Miles،

ئیبرهـارد ساندشـنیدەر Eberhard Sandschneider، ئـیـن سـیکینگتۆن Ian Seckington، و دیڤید شامبۆ David Shambaugh، .

کۆهلس چاوەکانی کردمەوە تـا چـینی جیـاواز ببیـنم.ڤولکـەر سـتانزیل شـوێن هەڵگرێکی چـاك و ڕێ نیـشاندەرم بـوو، زۆر سـەخی بـوو لەگـەڵم، هەمیـشە ژەمـە نیوەڕۆی چاکی بۆ ئامادە دەکردین لە گەڵ میوانەکانم چ لـە ماڵـەوە و چ لـە دەرەوە، نیوەڕۆ یان ئێوارە بە بەردەوامیش یارمەتی دەدام تا لە شتەکان بگەم بە دەرئـەنجامی باش بگەم لە سەفەرەکانی ناو چین. ڕۆبەرت کاگان Robert Kagan، و گاری شمت Gary Schmitt، دوو هاوڕێ زۆر باش بوون، بوو بـوون بـە باڵـەکانم لـە فـڕین بـۆ بەیگین لە سەفەرە زۆرەکانم بۆ بەیگین، شەنگهای و تایپی Tai Pei، کەسانێکی زۆر و برادەرانم یارمەتییەکی زۆریان داوم تەنانەت ڕەنگە بەخۆیشیان پێی نەزانن. دەبێـت سوپاسێکی تایبەت ئاڕاستەی ڕۆب بلاکهێرست Rob Blackhurst، ریچارد گـوولن Richard Gowan، تـۆبی گـرین Toby Green، فیـوب گـریفس Phoebe Griffith، ساندێر کـە تواڵـە Sunder Katwala، ئـادام لاری Adam Lury، جێف مۆلگان Geoff Mulgan، و شونە ماکالستەر Shauna McAllister.

زۆربەی لێکۆڵینەوەکانی ئەم کتێبە لە کاتێك ئەنجامـدراوە کاتێـك لـە سـەنتەری ئەورووپی بۆ چاکسازی کارم دەکرد. من زۆر منـەتباری (چارلـس گرانت) م، هاوڕێـیەکی ژیر، نموونەی خاوەن کار و بەڕێوەبەری باشە، هەر لە سەرەتای دەستکردنم بە نووسینی ئەم کتێبە یارمەتیدام چەندین جار بواری بۆ ڕەخـساندووم تا پشوو وەرگـرم بـۆ ئـەوەی کار لەسەر ئەم کتێبە بکەم، هەروەها چەندین جار لەگەڵم هاتووە بۆ چین.

سندووقی پرۆژەی مارشـالی ئـەڵمانی خەرجییـەکانی چـەندین سـەفەری بـۆ چـین گرتۆتە ئەستۆ، هەروەها زۆر جاریش سەفەرەکانیان ڕێکخستووە یارمەتیشیان داوم لە CER. سەرۆکەکەی کریج کەنەدی Graig Kennedy هەر زۆر هەستی بە گرنگی پرۆژەکەم کرد و پاڵپشتی کردم لەسەر گـشت ئاسـتەکان هـەر خـۆیشی بـوو بـە سەرپەرشیار و یارمەتیدەرم. لـە دەزگـای کۆمەڵـەی ولآدا ( The Open Society

Lnstitue) بە تایبەت چەند کەسێکی هاندەر وەك مەیبل ڤان ئۆرانجی Mabel Van Oranje، ئاریاه نیرAryeh Neier و جۆرج سۆرس George Soros زۆر سەخی بوون بە ئەسیحەت و هاندان و یارمەتی ڕێگلیان پێدام کە کتێبەکەم تەواو بکەم بەر لە دامەزراندنی ئەنجوومەنی پەیوەندییە دەرەکییەکانی یەکێتی ئەورووپی Wopean Councilon Foreign Relations هەروەها فرانسێوس گودمەنت Francois Godement و جۆن فۆکس Johu Fox کە هەردووکیان شارەزای چینن کتێبەکەیان خوێندەوەوە سەرنجی زۆر بە نرخیان دامێ.

لە هەمان کاتیشدا یارمەتیدەری تایبەتم کاترین پارکس Katerine Parkes بوو بوو بە قەلایەك بە هێز بۆ من لە کاتی ناهموارترین حەقییەکانی نیوەرۆ.

(زهانگ فینگ) یش Zhang Feng نموونەیەکی زۆر چاکی یارمەتیدەریم بوو وەك لێکۆڵەر کە هەمیشە خەریکی وەرگێڕانی تازەترین بابەت بوو کە لە ناوەندە سیاسی و ئەکادیمیایەکانی چین دەردەچوون.

سێ کەس چینیان بە من ناساند هەرلە یەکەم سەفەرمەوە، هەر لەو کاتەوە ئەوان بوون بە چاو ساغ و شوێن هەڵگرم، ئەوانەش جوشوا رامۆ Joshua Ramo، هەر لەو کاتەوە خولیای بووم کە ڕێگای پێدام لێکۆڵینەوەیەکی بڵاو بکەمەوە بە ناو نیشانی یەکدەنگی بەیگین ( Beijing Consensus) ئەو کاتەی بەڕێوەبەری سەنتەری بیانی بووم. زۆر سەخی بوو بە کاتە بە نرخەکەی پەیوەندییەکانی و بیرو بۆچوونەکانیشی. پۆپی سیباك مونتی فایۆر Poppy Sebag Monte Fiore، کە زۆر کاتێکی بە نرخی تەرخانکرد بۆم و سەفەرە زۆرەکانی چینی کردبوو بە کاتێکی زۆر خۆش بۆم. لە هەموو کەس زیاتر ژیانی ڕۆژانەی چینی بە من ناساند لە ڕێگەی برادەرە زۆرەکانی لە چین کە پێناساندم هەروەها ڕێگای پێدابووم کە ئەپارمانەکەی بەکار بهێنم بۆ ژیان حەوانەوە هەر چەندی پێویستم بێت.ئەندروو سمۆل Andrew Small کە بەڕاستی هاورێیە، لەگەڵم دەهات بۆ دێهاتە دوورەکان کە هەمیشە شتی

بۆ دەخوێندمەوە لە بابەتی جیاجیا. هەموو رەشنووسەکانم دەخوێندەوە و یارمەتیدەدام تا ماقوولی شتەکانم بخەمە روو.

دایك و باوکم کە هەمیشە پرۆژەی خۆیانیان وەلا دەنا تا یارمەتی من بدەن لە تازەترین گرفتەکانم. شەرمەزاریان کردم بە سەخاوەت و زیرەکیان. نموونەی ئەم جۆرە دایك و باوکە وادەکەن هەموو شتێك بێتەدی و دەبێت دان بەم راستییە بنێم. مریەمی خۆشکم و Miriam و پیرۆز یان فەیروزی مێردی Phiroze کە هەمیشەبە تەنگمەوە هاتوون و یارمەتی مەعنەویان کردم و رێگایان بۆ خۆش کردووم کە سوود لە کتێبخانەی زانکۆ وەرگرم و بە لێکۆڵینەوەکانی خۆیان هانیانداوم. بەڵام گەبریلی خێزانم کە هەمیشە لە سەنگەری پێشەوە بووە، ئەم پرۆژەیەم (ئەم کتێبەم) پێشکەشە بە ئەو، ئەگەر تۆ نەبوای من رۆحم دەرووخا غەرقی گەردەلوول دەبووم، بەبێ خۆشەویستی تۆ ناصانەکەم دەرووخا ، بەبێ خۆشەویستی تۆ نەدەگەیشتم بە هیچ شوێنێك، ئەگەر تۆ نەبوای من بزر دەبووم.

مارك لیۆنارد...

**پێشەکی:**

ئازاد بوونی هزری و بیر و را بوونی چین کێشەیەکی گەورەیە بۆ مێژوو نووسە رۆژئاواییەکان. کتێبی پیرۆز هیچ شتێکی نەگوتووە سەبارەت بە چین. لە لای هیگل (Hegel)یش مێژووی جیهان لە چینی دوا کەوتوو و سەرەتای دەستپێدەکات تا دەکاتە لوتکەی پێشکەوتنی شارستانی ئەڵمانی. فۆکۆیاماش تەنها ئەمریکا لە شوێن ئەڵمانیا دادەنێت.بەڵام لە ناکاو رۆژئاواییەکان لە رۆژهەڵات چینیان دۆزییەوە، ئیمپراتۆریەتێکی زۆر گەورە، مێژوویەکی دوور و درێژ و رابردوویەکی پڕ لە سەروەریی و شکۆمەندی.جیهانێکی تازە بەدەر کەوت.

گان یانگ Gan Yang لە کتێبی :

The Grand Three Traition in The New Erq

The Integration of Three Traditions and the

Re-ewergence of the Chiness Civilaization

ئەو شتانەی کەلە سەردەمی ژیانی مندا روویانداوە و دوای مردنم لە بیر ناکرێن زۆر کەمن. تەنانەت ١١/٩ یان شەڕی عیراق کە ژیانانی گۆڕی و چەندین گیانی بێ خەتا بوون بە قوربانی و کاریگەریان لەسەر هەڵبژاردنەکاندا هەبوو، ئەوانە هەمووی دەبن بە سەرنجی زۆر بچووك لە کتێبەکانی مێژوو، بەڵام بووژانەوە و هەڵسانەوەی چین جیاوازە. ئەوە گەورەترین چیرۆکی سەردەمی ژیانی ئێمەیە، ناساوار و کاردانەوەکانیشی رەنگە بۆ چەندین نەوەی داهاتووش هەر هەبێت. هەر وەك دروستبوون و بووژانەوەی رۆم و ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و دەسەڵاتی بەریتانی و یەکێتی سۆڤیەت، ئەمە حکایەتێکە پڕ شتی سەرسوڕهێنەر. بۆ یەکەمین جار دوای ئەمانی شەڕی سارد هێزێکی غەیرە رۆژئاوایی سەر هەڵدەدات بەشداری لە پاڵەوانیەتی جیهانی دەکات.چین هاتە ریزی ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئەوروپا بۆ رێکخستنی جیهان و سیستەمی جیهانی.

پێوەرەکانی چین سەحراوی و سەرسوڕهێنەرن. بۆ ئێمە تێگەیشتن لە ئامارە گرینگەکانیان زۆر سەختە. پێنج یەکی دانیشتوانی جیهانن، بە هاتنیان بۆ بازاڕی جیهانی هێزی کاری دووبارە دوو بەرابەر کردووە، ئەمڕۆ نیوەی جل و بەرگ و پێڵاوی بەرهەم هێنراوی جیهان نیشانەی (Made in china) یان لەسەرە. چین لەهەموو وڵاتانی تری جیهان زیاتر کۆمپیوتەر بەرهەم دەهێنێت. ٤٠٪ چیمەنتۆی جیهان، ٤٠٪ خەڵوزی بەردین، ٣٠٪ ئاسن و ١٢٪ ئاسنی جیهان بەکار دەهێنێت. چین وا ئاوێتە و تێکەڵ بە ئابووری جیهان بووە کە کاریگەری زۆری بەسەر ژیانی ڕۆژانەماندا هەیە. لە یەك کاتدا بۆتە هۆی دوو بەرابەر کردنی نرخی نەوتی جیهانی، و لە هەمان کاتیشدا بە نیوە کردنی نرخی کۆمپیوتەرەکانمان. ئابووریUSA بە هەرمێنی ماوەتەوە و کارگەکانی پێڵاوی ئیتالیاش دابەزیوە.

خێرایی پێشکەوتنەکان زۆر سەرسووڕهێنەرن. ئەو تەلار سازییەی کە لە پڕ لە شاری شانگهای ڕوو دەدات بۆتە هۆی ئەوەی هەر دوو حەفتە جارێك نەخشەی شارەکە بگۆڕێت.هەموو ساڵێ جارێك شارێك بە ئەندازەی لەندەن لە دۆڵی ڕووباری پەرل دروستدەکرێت (Pearl Rivwr Delta) بۆ خۆ سازدان بۆ ئۆلۆمپیای ٢٠٠٨ ئەوەندە جادە و شەقامیان دروستکردووە تا چوار جار بە دەوری جیهاندا بسووڕێتەوە. چین تەنها لە ماوەی ٣٠ ساڵدا ٣٠٠ ملیۆن کەسی لە دێ هێناوەتە شار، ئەم پرۆسەیە لە ئەورووپا ٢٠٠ ساڵی خایاند. ئەگەر ئەم پرۆسەیە بەو خێراییە بەردەوام بێت...کە ئەگەرێکی گەورەیە... ئەوا ڕەنگە چین بەر لە ساڵی ٢٠٥٠ بە پێش ئەمریکا بکەوێت.

بەڵام بیرکردنەوە و باسکردن لە پێشکەوتنی خێرا و ژمارە خەیاڵەکانی وامان لێدەکات بیر لە پرسیارێکی قووڵتر نەکەینەوە ئەویش: ئایا بووژانەوەی چین جیهان دەگۆڕێت؟ ئێمە لەوە ڕاهاتین کە چین کاریگەری لەسەر ئابووری جیهان هەیە، بەڵام ئایا ئەوە وا دەکات بیرکردنەوەمان بە جۆرێکی تر ڕێکبخات سەبارەت بە سیاسەت و دەسەڵات؟ چین یەکەم وڵاتە دوای شەڕی سارد کە داهێنانی زۆر ژیرانە بکات و تێکەڵ

به جیهان بێت بۆ گۆڕینی به تێڕوانینێکی چینی بۆ دنیا. کێشه ناو خۆییه مەزن و زەبەلاحەکانی وایان کردووه که به دوای غوونەیەکی تر له جیهانگیریدا بگەڕێن. Globalization.

ڕووبەری گەورەی چین وایکردووه که ئەو نەتەوه و ئابووریانەی پەیوەندییان له گەڵی هەیه هەر له ئەمریکا هەتا زەمبابوێ به سیستەمەکانی خۆیاندا بچنەوه بۆ خۆ گونجاندن لەگەڵ بیرو بۆچوونه چینییەکان سەبارەت به گەشەسەندنی ئابووری و چاکسازی سیاسی و سیستەمی جیهانی. چین لەمەو پاش به خۆی بیر دەکاتەوه، لەبەر سەرکەوتنه ئابوورییەکانیشی خەڵك له هەر چوارلای جیهان گوێیان لێدەگرن و لاسایی غوونه سەرکەوتووەکەشیان دەکەن.

چیرۆکی بووژاندنەوەی هزری و بیرمەندان (Intellectual) له وڵاتی چین کەمتر بایەخی پێدراوه و کەمتریش به دۆکیومەنتکراوه، به پێچەوانەی سەرکەوتنه ئابوورییەکەیان. ئێمه به بەردەوام و زۆر به چڕوپڕی لێکۆڵینەوه دەکەین لەسەر باڵەکانی بیرمەندە ئەمریکییەکان، محافزکاره تازەکان Neo- Cons، واقعییه توندەکان، راستڕەوی ئایینی، بەڵام چەند کەس له ئێمه دەتوانێت ناوی چەند کەسێك له نووسەر و بیرمەندی چینی بژمێرێت زیاتر له پەنجەکانی یەك دەست؟ کێ دەزانێت خەونەکانیان چین بۆ وڵاتەکەیان و ئەو جیهانەی وا خەریکه دەیگۆڕن. ئەوروپییەکان و ئەمریکییەکان به تایبەت زۆر کەم ئامادەن بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانه. هەر له سەردەمی هەڵمەته تەبشیرییەکانی (Missionaries) فەرەنسی و بەریتانی بۆ رۆژهەڵات، رۆژئاواییەکان دەیانپرسی داخوا چیان له چین دەوێت و چۆن چین بگۆڕن بۆ قەبوولکردنی جۆری ژیانی رۆژئاوایی. خەڵك به هەڵەداچووبوون، چونکه وایاندەزانی هەتا چین دەوڵەمەندتر بێت زیاتر ئامادە دەبێت بۆ ئەوەی وەك ئێمەیان لێبێت.

### بوون بە چینناسی بە هەڵکەوت:

چین لە ساڵانی ١٩٩٠ دەستیکرد بە هەڵکشان بە لای ئێمە زۆر بە خێرایی و زۆر بە پەلە بۆشایی نێوان چین و رۆژئاوا کەمتر دەبێتەوە. زۆربەی هەرە زۆری بازرگان و بزنسمانە رۆژئاواییەکان کە دەیانویست سوود لەم دەرفەتە وەرگرن تووشی زەرەرو زیانی زۆر گەورە هاتن. بەڵام دێتە یادم لە دەوروبەری کۆتایی سەدەی رابردوودا بۆ ماوەیەك کەس لە شارەزایان باسی چینی نەدەکرد، هەر دوابەدوای ئەم ماوەیەش زۆر بە کتوپڕی گشت لایەك هەر لە بەرمەندەکانی سیاسەتی دەرەوە لە لەندەنەوە تا خەڵکانی تریش هەر چوار لای دونیا باسیان لە پەرەسەندن و گەشەسەندنی چین و قەبارەو پێوەری چینی دەکرد.

چین راوبۆچوونی خۆی هەبوو سەبارەت: بە پێشکەوتن و گەشەسەندنی ئەفەریقا، چاکسازی لە سیستەمی کاری نەتەوە یەکگرتووەکان، ناخاوتنەکانی بازرگانی جیهانی دۆحە، پرۆگرامی ئەتۆمی ئێران، جینۆساید لە دارفۆر و نزمی نەوت لە فەنزوێلا. چین تەنها ئەو دەوڵەتە گەورە ئەما کە بڕیار بدەین پەیوەندی دیپلوماتی لەگەڵ ببەستین و بازرگانی لەگەڵ بکەین، بەڵکو وا خەریکە دەبێتە بەشێك لە کەل و پەلی ناو ماڵی سیاسەتی نێودەوڵەتی، فاکتەرێکی جیهانی کە ناچارین کێبڕکێی لەگەڵ بکەین.لە رووی کاریگەری سیاسیش چین چیتر وەك وڵاتە گەورە تازە پێگەیشتوان ئەما وەك هندستان یان بەرازیل. وا خەریکە دەگۆڕێت بۆ شتێکی تازە ئەمریکاییەکی بچووك. من لە ناکاو بۆم دەرکەوت بەبێ تێگەیشتنی چین ئەستەمە سیاسەتی جیهانی تێبگەین.

هەرگیز یەکەمین سەردانم بۆ ئەکادیمیای چینی بۆ زانستە کۆمەڵایەتییەکان لە بەیجین (CASS) لە یاد ناچێت. لە لایەن وەنگ لوۆلن Wang Luolin ی جێگری سەرۆکی ئەکادیمیا و (بلیوری وەنگ کتێبی سەرمایەی کارل مارکسی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی چینی). هوانگ پنگ (Huang Ping) (کۆنە پاسەرانی سوور و جێگری سەر نووسەری گۆڤاری هزری دووشوو Dushu). پێشوازیم لێکرا. من لەسەر

کورسییەکی زۆر گەورە دانیشتبووم کە تایبەت بوو بە میوانی شەرەف، بە جۆرێك دانرابوو بە هاوتەریبی دیوار بۆ پاراستنی زیاتری میوانەکانیان. دەستی نەکرد بە خۆناساندن بە دەم چا خواردنەوە، مـن دەستمپێکرد، سـەنتەری سیاسـەتی دەرەکـی تەمـەنی چـوار سـاڵە، دەوروبـەری ۲۰ کارمەنـدمان هەیـە، سـاڵانە ۲۵ راپـۆرت بڵاودەکەینەوە و ٥٠ کۆڕ و سیمینار دەبەستین. وەنـگ لـوۆلن زۆر بـەرێزەوە سـەری دەهەژاند نیشانی گوێگرتنـە بـەر لـە قـسەکردن خەندەیـەکی کـرد و دەسـتیکرد بـە باسکردنی ژمارە کوشندەکانی: CASS بەرزترین رێکخراوی لێکۆڵینەوەی ئەکادیمیە لە بوارەکانی فەلـسەفە و زانستە کۆمەڵایەتییەکان، پـەنجا سـەنتەری لێکۆڵینـەوەمان هەیە کە ۲٦٠ بابەتی سەرەکی و ناسەرەکی دادەپۆشن و ٤٠٠٠ لێکۆڵـەرمان هەیـە، کاتێ ئەو قسەیدەکرد من هەستمدەکرد وا خەریکە لەناو کورسییە گەورەکەدا ون دەبم و دەتاوێمەوە، هەموو بیرمەندەکانی بەریتانیا چەند سەد کەسێکن، هەموو ئەوروپاش لە هەزار کەمترە، تەنانەت خودی ئەمریکاش ۱۰/٠٠٠ بیرمەندی نییە. بەڵام لە چین تەنها یەك دەزگا، کە رەنگە دەرزەنێکیان هەبێت.

لەم دەزگایانە،بـەپێی بـە تـەنها ٤٠٠٠ لێکۆڵـەر و بیرمەنـدی هەیـە ( Think Tanks). من دواتر بۆم دەرکەوت کە خەلکانێك هەن لـە CASS وای بۆدەچـن کـە ئەوانە هەموویان بیرمەند نەبن و شایانی ئەم پۆستە نـەبن، بـەڵام سـەرەڕای ئەمـەش ژمارەکە هەر ترسناکە و بە راستی منیان ترساند.

وەنگ لوۆلن ستراتیژیەتێکی زۆر کۆن ناسراوی بەکار هێنا کە لە بنەڕەتدا دانـراوە بۆ حەپەساندن و سەر لێشێواندنی ئەندامێکی تازەی بیانی بۆ نـاو رێکخراوەکـەی.بـۆ ماوەی چەند کاتژمێرك زۆر بە رێزەوە خەریکی گفتوگۆی گشتی بـووین بـەبێ ئـەوەی راستەوخۆ لەسـەر هیچ مـەسەلەیەکی تایبەت بوەستین. لە گفتوگۆ کردنەکەمان وەنـگ زۆر بە دوورو درێژی جۆرێك لـە غـەزەل، هـەروەها رێـورەسمی حەجکردن ئاسا دەی لاواندەوە باسەکەمان بێ ناوەڕۆك و بە هیچ لایەکیشدا نەدەچوو، دیـسانەوە ئەمـەیش رێگایەکی کۆنی چـینییە بـۆ پووچـەڵکردنەوەی سـتراتیژیەتی دانووسـانی رۆژئـاوایی

دلڕێژراوە و پیادە کراوە بۆ ئەوەی وا لە بیانییەکان بکەن بە مەرج و رێگای چینی کار بکەن، هەروەها لە جیاتی بۆندی راستەوخۆ (contractual obligations) تۆڕێک لە پەیوەندی لەسەر بنەمای پەیوەندی تاکە کەسی دروستبکەن، من لەسەرەتای سەفەرەکەمدا هیوادار بووم کە بە خێرایی ولاتی چینم پێ بناسێنن و هەندێ شت فێربم و بچمەوە مالّ، بەلاّم دوای ئەم چەند حەفتەیەی کە خەریکی چا خواردنەوە و گفتوگۆ و دیدار و کۆبوونەوە زۆرەکان و راگۆڕینەوە بووم بۆم دەرکەوت کەوا بە ئاسانی ئەجاتم نابێت و لێرە چەقیم.

من بەراستی شاگەشکە بووم بەو جیهانە شاردراوەی بیرمەند و لێکۆڵەرەوەکان و ئەو هەموو جموجۆڵە زۆرەیان کە لە دایکبوونی بیرۆکەی گەورەیان لێدەکەوتەوە. زوو بۆم دەرکەوت زیاتر لە چەند سەفەرێکم پێویستە بۆ بەیەین و شەنگەهای بۆ تێگەیشتنی ئەندازەی ویست خەونەکانی بیرمەندان و لێکۆڵەرەوەکانی ناو چین. هەر بۆیەش بریارمدا کە لە چەند سالّی داهاتوودا ماوەیەکی باش لە چینم تەرخانکەم بۆ فێربوون و تێگەیشتنی پێشکەوتنە بنەڕەتییەکانی چین، هەروەها دەستبکەم بە دۆکیومەنتکردنی ئەم مێژووە زیندووەی کە لەبەر دەممدا کرایەوە. من بە هەلّکەوت بووم بە چینناس (Sinologist) و ئەوەندەی هاتوچۆی بەیەینم دەکرد وام هەستدەکرد کە لە مالّی دووەمم. دوابەدوای هەر سەفەرێکیش هەستمدەکرد زیاتر تێوە دەئالێم و پێوە دەنووسێم. دۆستایەتیم لەگەلّ زۆر بیرمەند دروستکرد و چاودێری بیرۆکەکانیانم دەکرد و لەبەر چاوی من گۆڕانیان بەسەر دادەهات و پێشدەکەوتن بە هاو تەریبی لەگەلّ پێشکەوتنە خێراکانی چین. بە چاوی خۆم بینیم کە چۆن بیرۆکەی رۆژئاواییان دەهێنا بە قالبێکی چینی دووبارە دایاندەڕشتەوە تا لەگەلّ تێڕوانینی چینی بۆ جیهان بگونجێت و تا تێکەلّ بن بە بزاڤی بیرمەندی جیهانی کە یەکەمین جار چین لە سەدەی نۆزدەدا هاتە ریزی بیرمەندانی رۆژئاوا.

**چینی خاڵی دەستپێك:**

کۆنە کۆشکی هاوینە لە بەیگین بە قەد شارێك گەورەیە، هەر کەسێك بیبینێت دەڵێت زۆر لە ئەهرامەکان گرنگترە. زۆر چاکتر دروستکراوە لە پەرستگای پارسنونی خوداوەندی گریکەکان (Parthenon) زۆر جوانترو پێشکەوتووتر لە نۆترەردام (Notre Dame). ڤکتۆر هوگۆش ئەو پیاوەی وشەی لێنەدەبڕا، تووشی کێشە دەهات لە وەسفکردنی جوانی ئەم کۆشکە: خەونێك پێکبهێنە یان ببینە بە کۆشکێکی زۆر جوان کە دروستکرابێت لە مەرمەڕ و بەردی گرانبەهای سەوزو برۆنز، نەخش و نیگاری چینی و داپۆشراو بە بەردی گرانبەهای جۆراوجۆر، دیسانەوە داپۆشراو بە حەریر، ئێرەیان جێگای خەڵوەتە، ئێرەش جێگای ژنان (Harem) کە بە زێڕ داپۆشراوە رەنگەکانی زۆر جوان بن، ئەندازیارەکانیشت با شاعیر بن تا هەزار و یەك خەونی هەزار و یەك شەوت بۆ بهۆننەوە. باخچە و دەست شۆر و نافوورەی زۆر جوان کە کۆمەکانی پڕ بن لە ئاو و کەف. قاز و قورینگ و تەیری ئاوی، تاووس هی ترو هی تر. بە چەند وشەیەك هیندەی بڵێی شوێنێکی ئەفسووناوییە، زۆر فراوانتر لە فەنتازیای مرۆڤ. ئێرەیە، بەڵێ ئێرەیە کۆشکی هاوینە و پەرستگاکەی.

ئەو کۆشکە مەزنە ۱۵۰ساڵ پێچوو تا تەواو بوو، بەڵام لە ساڵی ۱۸۶۰ کەوتە ژێر دەسەڵات و پۆستاڵی هەردوو لەشکری بەریتانی و فەڕەنسی. ئەوەی ئەمڕۆ ماوەتەوە بریتییە لە چەند بەشێك و پارچەیەکی پەرت و لەت و پەتی لە یەکدابڕاو کە مەزنی و گرنگی ئەم کۆشکە مەزنە نیشاندەدات. بەڵام سەرەڕای ئەوەش حکومەتە یەك لە دوای یەکەکانی چین زۆر بە چاکی و پاشماوەی کۆشکی هاوینەیان پاراستووە. گرنگی رۆحی ئەم پاشماوەیە وەك گرنگی پاشماوەی گراوند زیرۆیە (پاشماوەی هێرشی تیرۆریستی سەر سەنتەری بازرگانی جیهانی نیویۆرك) لە شاری نیویۆرك. کاریگەرییەکی یەکجار بەهێزی هەیە لە سەروەری چینییەکان کە بوو بە سومبلێکی نیشتمانی هەرە مەزن، کاریگەری لە هەموو خانووبەرە و ئەپارتمانەکان و باڵەخانەکانی تر زیاترە کە لە چین هەیە.

یـادواره‌ی کۆشـکی هاوینـه یوانمنگیـان ( Yuanming yuan) هـه‌روه‌ك لای چینییه‌كان ناسراوه وه‌ك برینێكی ناوڵه‌یـه و كراوه‌یـه هـه‌ر كاتێـك پێویـست بكـات هاوڵاتیانی چین به‌ره‌وتێك بجوولێنن خۆیی پێدا ده‌كه‌ن بۆ جووڵاندنیان یانیش بۆ وه‌بیر هێنانه‌وه‌ی خه‌ڵك كه چۆن پارتی كۆمۆنیـست توانی چین بپارێزێت له دۆراندنێكی تـر. یوانمگیان بووه نیشانه‌ی سه‌ده‌یه‌ك له شه‌رمه‌زاری دوای شكـستی چین لـه شـه‌ڕه‌كانی (تۆپیوم) (Opium) له ١٨٤٠ تا ده‌گا به دۆراندنی تایوان و داگیر كردنـه یـه‌ك لـه دوای یه‌كه‌كانی ژاپۆن و شه‌ڕی ناوخۆ تا ده‌گا به شۆڕشـی كۆمۆنیـستی. هه‌نـدێ لـه بیرمه‌ندان پێیان وایه پاشاوه‌كانی یوانمگیان هه‌روه‌ها چیرۆكی چین تازه ده‌گێڕێته‌وه.

چیرۆكه‌كه باس له‌و زه‌ره‌ر و زیانانه ناكات كـه هێـزه داگیركـه‌ره‌كان لـه چـینیـان وه‌شاند، به‌ڵكو باس له‌و ماڵ وێرانـی و كاولكارییـه ده‌كـات كـه چـینییه‌كان بەسـه‌ر خۆیاندا هێنایه باوه‌ش كردنه‌وه بۆ بیر و باوه‌ڕ و فه‌لسه‌فه و ئایدۆلۆژیای بیانی كه بـه هه‌ڵه به‌سه‌ر خۆیانیان سـه‌پاند و جێ به جێیان كـرد.زه‌هـانگ كوانگتیـان لـه هـاوینی ٢٠٠٦ شـانۆگه‌ریه‌كی پێـشكه‌شكرد لـه تووسـین و ده‌رهێنـانی خـۆی بـوو لـه ژێـر ناونیشانی كۆشكی هاوینه یوانمگیان كه‌باس له‌و ماوه‌یه ده‌كات كـه چـۆن خـه‌ڵك ون بوو بوون له نێوان فه‌لسـه‌فه یه‌ك لـه دوای یـه‌ك هاورده‌كـان، زه‌هـانگ گونگتیـان لـه شانۆگه‌ریه‌كه‌ی پرسیارێك رووبه‌ڕووی هاوڵاتیانی ده‌كاته‌وه: به‌ڕاسـتی كـێ یوانمگیـانی تێكدا؟ كه‌م به‌رپرسیار ده‌یموێت گلـه‌یی كاولكردنی كۆشكی هاوینه ته‌نها نه‌خرێته پاڵ داگیرگه‌ران. له شانۆگه‌ریه‌كه نیشانیده‌دات كه چۆن چینییه‌كان خۆیان به‌شداریان كـرد له به‌ه‌وێرانكردن و بـه تـالان بردنـی ئـه‌م سـوه‌بله نیـشتمانییه كـه هێمـای خه‌ونـه به‌رزه‌كانیان بوو. چیرۆكه‌كه له سالی ١٨٦٠ ده‌ستپێده‌كات كـه كۆمـه‌ڵێك جوتیـار و هه‌ژار له‌و ناوه راوه‌ستاون گلـه‌یی لـه‌وه ده‌كـه‌ن كـه چـۆن ئیمپراتۆری چـین نـه‌وانی پشتگوێ خستووه و به هیچ جۆرێك بیر له خه‌ڵكی ئاسایی ناكاتـه‌وه، كـاتێكیش كـه سه‌ربازێكی به‌ریتانی له‌سه‌ر شانۆ ده‌رده‌كـه‌وێت جوتیاره‌كـان هانیـده‌ده‌ن تـا هێـرش بكاته سه‌ر كۆشكی هاوینه بۆ ئه‌وه‌ی ئه‌وانیش پاشاوه‌كه‌ی تالان بكه‌ن. هـه‌ر هـه‌مان

سێ ئەکتەر لە دیمەنێکی تردا دەبن بە قوتابییە ئایدیالیستەکانی برازیلی چواری ئایاری زانست و دیموکراسی ساڵی ۱۹۱۹ کە هێرش دەکەنە سەر دەرەبەگەکان بۆ نیشاندانی پابەند بوونیان بە نوێخوازی رۆژئاوایی. لە پەردەیەکی تردا دەبن بە پاسەوانە سوورەکانی شۆڕشی کەلتووری کە پاشماوەی کۆشکی هاوینە یوانمنگیان وەك عەمبار بەکار دەهێنن بۆ عەمبار کردنی برنجی چەڵتوکدار بۆ نیشاندان و دەربڕینی حەماسی شۆڕشگێڕی. لە دیمەنێکی تریشی ئەکتەرەکان دەبن بە بیرۆکراتەکانی ساڵانی ۱۹۸۰ کە پاشماوەی کۆشکی هاوینە دەکەن بە شاری یاری بۆ پڕکردنی گیرفانەکانیان. لە دوای ئەو دیمەنەشدا هەر هەمان ئەکتەر دەبن بە بەرپرسەکانی ئەمڕۆ کە گۆمەکانی کۆشکی هاوینە بە نایلۆن دادەپۆشن بۆ پاشەکەوتکردنی ئاو بە جۆرێکی هێندە زەق کە رەخنەگرێکی زۆر گەورەیە لە تاکە هەوڵی رەسمی و گشتی وڵات کە خەڵك بەشداریان تێدا کرد سەبارەت بە پاراستنی ژینگە. بەشی دووەمی شانۆگەرییەکەی زهانگ کوانگتیان خستنە رووبەکی زۆر زەقی ئەو گرفتانەیە کە چین رووبەڕوویان بۆتەوە لە دەرئەنجامی باوەش کردنەوە و لە ئامێز گرتنی بازاڕی ئازاد هەر لە پیسبوونی ژینگە، گەندەڵی بەرپرسان، گەورە بوونی یان زیاد بوونی جیاوازی و کەلێنی گەورەی نێوان هەژار و دەوڵەمەند، خراپی باری تونێلەکان (Mines). شانۆ گەرییەکە هانی جەماوەر دەدات تا دان بە هەڵەی خۆیاندا بنێن لە جیاتی ئەوەی هەموو خەتاکە بخەنە سەر داگیرکەران. نامەی شانۆ نامەی ئەوس کە بریتییە لە کردنەوەی دەزگای چینی بەسەر جیهان، نەك داخستنی بە بیانووی خۆ پاراستن، و هانیشیاندەدات رێگای تایبەتی خۆیان بدۆزنەوە بۆ داهاتوو، نەك لە ئامێز گرتنی کەل و پەل و بیر و باوەڕی بیانی بە کوێرانە. لە لایەکی تریش هاوڵاتیانی هاندەدات تا خۆساز و ئامادەکەن بۆ پرسیارێکی دراماتیکی: دەبێت چین چی بکات تا کۆنترۆڵی بەسەر ئایندەی خۆیدا هەبێت؟

**لە ژێر سێبەری جیهانگیریدا:**

ژمارەیەکی زۆر لە دەزگا بیرمەندەکانی چین کە روویان لە زیاد بووندایە بڕوایان وایە کە وڵاتەکەیان لە سەرلێشێواوی شۆڕشی کەلتووری ئەجاتیان بوو و توانیان خۆیان رزگار بکەن لە سێبەری ماویزم بەڵام کەوتنە ژێر کاریگەری فەلسەفەیەکی توندڕەوتر: حەپسان و کەوتنە ژێر کاریگەری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا تا رادەی پەرستن. گلەیی ئەوە دەکەن و دەڵێن: کاتێك دینگ زیاو پینگ Deng Xiao Ping دەرگای چینی بە رووی جیهاندا کردەوە ئەوا ئەمریکا بازاڕەکانیانی پڕ کرد جگە لە داڕشتن و دانانی بنەماو فەلسەفەی بازاڕی ئازاد و بنەماکانی گەشەسەندنی ئابووری. داخوازییەکانی بۆ دیموکراسی بوون بە بنەما بۆ چاکسازی سیاسی. سیاسەتە دەرەکییەکانیشی (USA) دەستنیشاندەکرد چ قەبووڵ دەکرێت و چ قەبووڵ ناکرێت لەسەر شانۆیی جیهانی.USA رۆڵی خوداوەندێکی زۆر مەزنی وەرگرت کە کەش و هەوای دنیا رەنگدانەوەی حەز و ئارەزووەکانی ئەو دەبێت. هەر بە هەمان شێوەش هەژار و جوتیارە چینییەکان کە لە رابردوودا دەژیان لە ژێر ترسێکی بەردەوامی تۆڵەی پیرۆزی خوداوەندا دەژیان، گەورەترین خەون و ئارەزووشیان بریتیبوو لە خۆپاراستن لەم تۆڵە و سزا پیرۆزە، سیاسەتێکی دەرەکیان پیادە کرد تا ژیری خۆیانی لەپەنا بشارنەوە، زۆر بە خۆنەویستی و دوور لە خۆ بەزل زانین مامەڵەیان لەگەڵ کێشەکان دەکرد، لە هەمان کاتیشدا قوربانی زۆریان دەدا بۆ رازی کردنی USA هەروەك لە کێشەی کۆریای باکوور و سوودان.

بە خۆشی بێت یان ناخۆشی لە ساڵانی ۱۹۸۰ و ۱۹۹۰ دا تازەگەری Modernization بە واتای بە ئەمریکایی بوونی دەبەخشی، بەلانی کەم بە رووکەشیش بێت.

چینی کۆمۆنیست پێستە سوورەکەی داماڵی و یەکێکی تری زۆر تازەی پۆشت لە ژێر دروشمی خەرجکردنی زۆر (Mass Consuwerism). هەر بۆیەش ستاربۆکس Starbucks (قاوەخانە) توانی کەلێن لە دیواری مەزندا دروستبکات و خۆی

بڕزێنێته بازارەکانی چین و خۆی وەك میوانێکی رۆح سووك نیشانبدات، هێماو نیشانەکانی ماکدۆنالدزو KFC (خواردنگەی خێرا) بە هەمان شێوە چینیان داگیر کرد. مێرمندالەکانیش زۆر زوو فێری جنێودان بوون بە شێوەی هۆلیودی. یوکیپینگ Yu Keping ی زانای زانستە سیاسییەکان دەڵێت: واقعی بە، بۆ ئەو ئەوەیەی کە لە سەردەمی چاکسازی پێگەیشتن، هەموو شتێکی ئەمەریکیان لا گرنگە و گەرەکە، هەر لە خەلکی ئەمەریکی ، دەزگاکانیان، ئابووریان، وڵات و کەلتوور و هی تریش، تەنانەت بە لای ئەوانە (مانگ) کەی ئەمریکا لە هی چین خرترە.

لە ئاستێکی قووڵتریشدا چین ناچار کرا کە خۆی بگونجێنێ لەگەڵ ئەو جیهانە و جیهانگیرییەی کە بە سەرمایە و هێزی سەربازی ئەمەریکی دروستکراوە.

لە سەردەمی جیهانی پانی (Flat World)ی رۆژنامەنووس تۆماس فریدمان دەوڵەتە نەتەوەییەکان دەسەلات بەسەر چارەنووسی خۆیان لە دەستدەدەن و دەخرێنە دەرەوەی بازنەی بواری ئابووری لە ژێر فشاری فرۆشتنەوەی موڵك و سامانی دەوڵەت بە کەرتی تایبەت ( Privatization)، دەرەوەی بواری سیاسی لە ژێر کاریگەری شەپۆلی سێیەمی دیموکراسی و کاریگەری سەرمایەی بێ دەوڵەت و بازرگانی و تیرۆرزم. زۆر لە بیرمەندە چینییەکان مەترسی ئەوەیان لێنیشتووە کە بە لە ئامێز گرتنی قازانجەکانی جیهانگیری رەنگە چین دووچاری مەترسی پانبوونەوە بێت لە ژێر کاریگەری ئایدۆلۆژیای سیاسی ئەمەریکی.

وانگ خیاو دۆنگ ( Wang Xiaodong) کە یەکێکە لە نەتەوە پەرستە تازەکانی چینی دەڵێت لە ئامێز گرتنی بیرو باوەری ئەمەریکی دەگەڕێتەوە بۆ هۆی رق لەخۆ بوونەوەی چینییەکان ( Self-hatred)، و دەڵێت زۆر لە بیرمەندەکانی بەیگین لە ساڵانی هەشتاکاندا ١٩٨٠ چینییەکانیان بە نەتەوەیەکی کەم و ژێر دەست خاوەن مێژوویەکی کەم و بێ بایەخ دەبینی، بە بڕوای من ئەوە هیچ جیاوازییەك لە بیرو بۆ چوونی هتلەری راست نییە (Racism). تاکە جیاوازی تەنها ئەوەیە کە بیرمەندەکانی ئەو رقەیان ئاراستەی خۆیان کردبوو، هەر بۆیەش من ناوم ناوە

ڕەسیزمی پێچەوانە (Reverse Racism). هەر چەندە ئەم ڕایەم وانگ خیاودۆنگ ڕەنگە زۆر توندڕەوی پێوە دیارە و بە هەڵە بەکار هاتووە بە گوێرەی ڕای زۆربەی چینی و ڕۆژئاواییەکانیش، بەڵام ئەوە نیشانەی ئەوبارە ئاڵۆزەیە کە بیرمەندان تووشی هاتوون لە هەستکردن بە ئارامی و ڕووخاون یانیش بەر لە ڕووخان و داڕمان، هەر ئەوەش وای کردووە کە لە ئایدۆلۆژیایەکی توند بازدەن بۆ یەکێکی توندتر.

**ئازادی بیرکردنەوە:**

پرۆفیسۆر سوی زهیسان (Cui Zhyusn) کە لە زانکۆی تسنگهوە (Tsinghua) مامۆستایە کاتێک مامۆستا بوو لە ئینستیتۆی تەکنەلۆژی ماسۆشیس لە ساڵی ۱۹۹۳ وتارێکی بڵاوکردەوە لە ژێر ناونیشانی ئازادی بیرکردنەوە (Liberation Thought) کە تیایدا باسدەکات و دەڵێت: دوای ئەوە خۆمان لە بیری ئەرتۆدۆکس (Orthodox) مارکسی ئازاد کرد، ئەوا پێویستە بیرمەندە چینییەکان بەهەمان شێوە خۆیان ئەجاتبدەن لە سەرسووڕمان و پیادە کردن و لاسایی کردنەوەی کوێرانەی سەرمایەداری ڕۆژئاوایی. ئامانجی وتارەکەیشی بریتیبوو لە شکاندنی ئەو ڕێسایەی کە چینییەکان پیادەی دەکەن لەوەی هەر ئەوەیەك بڕواو متمانە بە بیر و بۆچوونی جیاجیاو هەر یەکەمیان باوەش بۆ بیر و بۆچوونی هاوردە دەکەنەوە، لە بری ئەوەش هانی چینییەکان دەدات کە خۆیان بۆ خۆیان بیربکەنەوە نەك تەسلیمی ئەو ڕایە بن کە دەڵێت هیچ ئەلتەرنەتیڤێك نییە بۆ لیبراڵی تازە و ئەجندەکانیان- بەرنامەکانیان (New- Liberal). هەروەها هانیان دەدات کە بە دوای هەموو سەرچاوەکاندا بگەڕێن بۆ دۆزینەوەی ڕێگای تازە- کە ناوی دەنێت ئەلتەرناتیڤی تازەگەری (Alternative Modernity).

سەرەتا کەس گوێی لە بانگەوازەکەی نەگرت. ئەوسا چین هێشتا ئاسەواری قەسابخانەکەی تیانە چین- Tiananmen پێوە دیار بوو دیمەنەکانی هێشتا هەر زیندوو بوون. زۆربەی بیرمەندان تۆقیبوون لە کاردانەوە توندەکەی حکومەت دژ بە

خۆپیشاندەران. بیرمەندانیش یان لە دەزگایەکی حیزبی- دەوڵەتی کاریاندەکرد یانیش لە تاراوگە دەژیان، لە هەمان کاتیشدا سەرکردەکانی حیزب دووبارە دەستیان کردووە بە ریفۆرم یانیش چاکسازی ئابووری. بەشەکەی تری نوخبەش خەریکی دەوڵەمەند بوون و پارە کۆکردنەوە بوون. بەڵام ئەمرۆ بیر و بۆچوونەکانی سوی زهییان کاریگەری خۆیان هەیە لەبەر ئەوەی گەشەسەندنی ئابووری چینی بووە هۆی پەیدا بوونی بڕوا بەخۆ بوون.تەنانەت نەتەوە پەرستێکی وەك (وانگ خیاودونگ) پیش دان بەمە گەشەسەندنە دادەنێت و لە یەکێك لە دیدارەکان گوتی: لە ساڵانی ۱۹۸۰ دا یەکەم سەفەرم بۆ دەرەوەی چین کرد، بۆ سنگاپوور... لە وێ تووشی حەپەسان هاتم بە پێشکەوتنی تەکنەلۆژی ئەم وڵاتە. شارەکانیان و جموجۆڵی ژیانیان... ئەوسا خەونمان بەوە دەبینی داخوا دەکرێت ئێمەش بە پەنجا ساڵ شتێکی وامان هەبێت، ئەو کات زۆر بێ ئومێد بووم بەڵام رۆژگار سەلماندی کە هەڵە بووین، ئەم خەونە تەنها دوای بیست وپێنج ساڵ هاتەدی.

بەڵام پار کە چووم بۆ سەنگاپوور بۆم دەرکەوت کە بە هیچ شێوەیەك ناکرێ بەراوردی سەنگاپوور بکەین بە شینزهین Shenzhen و دالیان Dalianو شانگهای و بەیگین، چونکە ئەو شارانەی یەکجار زۆر لە پێشترن. ئەو پێشکەوتنە خەیاڵییەی کە ئابووری چین بە خۆیەوە بینی متمانەیەکی زۆر بە هێزی لای خەڵك دروستکردووە، بۆتە هۆی ئەوەی هەندێ بیرمەندی چین پشت بەستن بە گەشەسەندن و پێشکەوتنە مەزنەکانیان پرسیاری ئەوە بکەن: ئایا ئەو وعدانەی لە ژێر سێبەری ئایدولۆژیای ساڵەکانی ۱۹۸۰ و ۱۹۹۰دا بوون هاتوونە ئەوێ. بانگەوازەکانی دینگ خیاو پینگ بۆ گەشەسەندنی ئابووری، کەوتە بەر هێرشی ئەوانەی داوای یەکسانی دەکەن، هەروەها کار بۆ پاراستنی ژینگە دەکەن. لە مەملەکەتی چاکسازی سیاسیدا هەندێك بیرمەند کە ژمارەکانیان روو لە زیاد بوونداییە پرسیار دەکەن ئایا دیموکراسیەتی لیبرالی نموونەیەکی چاکە بۆ ئایندەی چین؟ ئایا دەکرێت دەوڵەتی نەتەوەیی پشتگوێ و فەرامۆش بکرێت لە پێناو هێزی بێ دەوڵەتی جیهانگیری.

وادیارە ئەو ئازادییەی سوی زهییوان داوایدەکرد خەریکە بە ئەنجامدەگات. هەر بە شێوازی ئەوروپییەکانی سەردەمی رووناکی رۆشنبیری بڵاویانکردنەوە خودا مردووە، کە بووە هۆی ئەوەی دونیایەك دروستکەن لە تێڕوانین و دیدی مرۆڤەوە. ئەمڕۆش بیرمەندە چینییەکان بەهەمان شێوە ئازادبوونی خۆیان رادەگەیەنن لەهەر مۆدیل و نموونەیەکی بیانی، لەمەولا تەنها بە خۆیان پلانی داهاتووی خۆیان دادەڕێژن و تەنهاو تەنها بە مەرجی چینی. گان یانگ کە پسپۆڕێکی زانستە سیاسییەکانە دەڵێت دەبێت بە پشت بەستن بە مێژووی تاقیکردنەوەکانی چینی رێگای تازە بدۆزینەوە لە جیاتی هێنانی بیرو باوەڕی بیانی.

ئەمڕۆ لە چین سێ رێبا هەیە کە بە زەقی هەستیان پێدەکرێت، یەکێکیان لە ماوەی بیست و هەشت ساڵی رابردوو دروستبوو کە بازاڕ خاڵی قورسایە تیادا و لەگەڵ ئازادی و مافەکان.

دووهەمیشیان دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ماوتسی تۆنگ کە گرنگترین خاسیەتی بریتییە لە خەباتکردن بۆ دادپەروەری و یەکسانی، سێیەم رێباش کە هەزاران ساڵە لە شارستانیەتی چینی کە پێدەگوترێت رێبای کەلتووری کۆنفۆشی ( Confucian Culture).

لە رابردوودا هەندێك جار وا هەڵسوکەوتمان دەکرد وەك ئەوەی ئەم سێ رێبایانە دژ بەیەك بن. بەڵام لە راستیدا وا نین.

ئەوە یەکەم جار نییە چینییەکان بلیمەتی بیانی تێکەڵ بکەن و بە بەرگی نیشتمانی داپۆشن. چاکساز خوازە کۆنفۆشییەکانی سەدەی نۆزدەهەم خەباتێکی زۆریان کرد تا بوون بە بەربەست لەبەر دەم داگیرکەران بۆ پاراستنی رووی چین لە رێگای بەکار هێنانی مەعریفەتی وەزیفی (Functional Knowledge) کە خۆیان ناویان ناوە یۆنگ (Youg) بۆ پاراستنی ناوەڕۆکی رۆح-تای (Ti). (دینگ خیاوپینگ)یش چاکسازییە بازاڕییەکانی Market Reforms خۆی لە ژێر دروشمی

(سۆسیالزم بە خاسیەتی چینی) ئەنجامدا. بەڵام لەو کاتەی ئەوەکانی پێشتر چاکسازیان لە ژێر فشاری بێتولنایی و لە پەل و پۆ کەوتن ئەنجامدەدا، ئەوا چاکساز خوازانی ئەمرۆ لەو پەڕی هێزەوە چاکسازییەکان بە ئەنجامدەگەیەنن، لە هەمووشی گرنگتر ئەوەیە کە گفتوگۆ و دەمەتەقێیەکان هەرتەنها لە نێو هۆڵە داخراوەکانی دەسەڵاتداران ئەنجامنادرێن، بەڵکو بیرمەندان ئەم دەنگانەیان زۆر زیاتر بڵاو کردۆتەوە.

**بیرمەندو ونەی پانا:**

ئەم کتێبە باس لە گەشەسەندنی تێڕوانینی چینە بۆ جیهان. ئەوە نیشاندەدات کە چۆن هەوڵی چین بۆ وەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمی هزری دەبێتە باغەی جۆرێکی تازە لە جیهانگیری. ئەمەش دوابەدوای ئەو هەوڵانە دێت کە بیرمەندە چینییەکان دایان بۆ ئاشتکردنەوە و لێکتر نزیک کردنەوەی ناماچە دژ بەیەکەکان. گەڕانە بە دوای دۆزینەوەی بازاڕی تازە، لەو کاتەی هەوڵدەدەن بۆ خۆپاراستن گەردەلوول و کاولکاری ئازادکردنی سیستەمی سیاسی و ئابووری چینی، ئەمەش ئەوە نیشاندەدات کە چۆن چین رووبەڕووی جیهانە پانەکەی جیهانگیری ئەمریکا دەبێتەوە لە ڕێگای ئەو جیهانەی کە لە داهێنانی خۆیانە... جیهانی دیوار دراوی چینی. لە ژێر کاریگەری ئەو گفتوگۆیانەی کە لەگەڵ زیاتر لە ٢٠٠ بیرمەند و بەرپرسی چینی ئەنجامداون و پتر لە سێ ساڵ لێکۆڵینەوە. ئەم کتێبە هەوڵێکە بۆ نیشاندانی ئازاد بوونی بەم دواییەی بیرمەندانی چینی لە ژێر کاریگەری بیر و باوەڕی رۆژئاوایی ئابووری، سیاسی و هێزی جیهانی. هەروەها تیشک دەخاتە سەر ئەوەی کە چۆن بیرکردنەوەیەکی تازەی بەیگین رەنگە ببێتە هۆی گۆڕینی سیستەمی جیهانی و لەوەش زیاتر رەنگە ببێتە هۆی گۆڕینی رۆژئاواش.

من لەم کتێبەدا ئامەوێت ناوەڕۆکی سەرجەم ئەم بیرو رایانە بخەمە روو کە ١٠٤ ملیار چینی بڕوایان پێی هەیە، یانیش بیر و باوەڕی هەموو بیرمەندانی چینی

باسبکەم، کە زۆربەیان بە هەڕەشەی بەند کردن بێ دەنگ کراون یانیش لە تاراوگە دەژین. ئەو هزرڤان و بیرمەندانەی لێرە باسکراون ئەوانەن لە چین دەژین- خۆیان ئەم جۆرە ژیانەیان هەڵبژاردووە، خۆیان ڕاهێناوە بە جۆرێك کە بگونجێن لەگەڵ ژان و ئازارەکانی ژانی فشاری ڕژێم.لە کاتی توندی و ژانەکاندا بێ دەنگ دەبن و لە کاتی خاویشدا فشار دەکەن و داوای گۆڕانکاری دەکەن لە ناو سیستەم.هەندێك جاریش تووشی گرفتی گەورە هاتوون لەگەڵ سانسۆرەکانی دەوڵەت. لەو ساڵانەی کە خەریکی نووسینی ئەم کتێبە بووم هەندێك لە پاڵەوانەکانی ئەم کتێبە لە کارە گرنگەکانیان لادراون جا چ لە دەزگای بیرمەندان بێت یان لێکۆڵەرەوە بێت یانیش ڕۆژنامەنووس ئەو جگە لەوەی بیرو باوەڕەکانیانی زیاتر و زیاتر لە لایەن حکومەتەوە پێشوازیان لێدەکرێت. سەرەڕای ئەو فشارە زۆرەی کە سانسۆر دەیخاتە سەربیرمەندانەوە ئەوا لە چین حسابیان بۆ دەکرێت، ژمارەیەکی زۆریان داوایان لێکراوە کە ڕاپۆرت بنووسن بۆ سەرۆك و ڕاوێژکاری، بۆ سەرۆك وەزیران و بەرپرسە بەرزەکانی حیزب بکەن.لە ڕاستیشدا کاریگەری بیرمەندانی چین بەسەر حکومەتەکەیان زۆر زیاترە لە هی هاوڕێکانیان لە ڕۆژئاوادا.

به شێوەیەکی سەیر و ناکۆك هێزی بیرمەندە چینییەکان لە لایەن سیستەمی سیاسی سەرکوتکەری چینی گەورە کراوە، لە وڵاتێکدا کە نە حیزبی بەرهەڵستکار هەیە، نە سەندیکای سەربە خۆیی کرێکاران و نە جیاوازی روون وئاشکرا لە بیرو ڕا لە نێوان سیاسەتمەداران و ئەو میدیایەی هەشە تەنها بلس لە بەیەکەوە ژیانی هاوڵاتیان بە ناسوودمەی دەکات لە جیاتی لێکۆڵینەوە و لێپێچینەوە. لە جیهاندا گفتوگۆی نێوان بیرمەندان جێگای سیاسەتمەدارانی گرتۆتەوە بەڵام زۆر بێ بەزییانە ترە وەك هی سیاسەتمەداران وەستایانە نەنجامنادرێت

بیرمەند چاکتر دەتوانێت ببێت بە دەربڕی چین و توێژە فراوانەکانی کۆمەڵ هەر لە کرێکار و جوتیار و بەڵێندەر و هتد...

داوای گۆڕانکاری بکات بە ناوی گشتیان. چینییەکان حەز دەکەن دەمەتەقێ بکەن لەسەر ئەوەی ئایا بیرمەندان کاریگەریان لەسەر دەسەڵاتداران هەیە یانیش دەسەڵاتداران بیرمەندان بەکار دەهێنن وەك زمان حال بۆ گەیشتن بەمەرامە سیاسییەکانیان. بەهەر حال گفتوگۆی نێوان هزرڤانان بۆتە بەشێك لە پرۆسەی سیاسی وڵات، بەکاردێت بۆ تاقیکردنەوەی بیر و باوەڕی تازە و کاردانەوەی خەڵك لەسەریان تا ڕێگای زیاتر لە بەردەم بڕیاردەر و دەسەڵاتداری چینی دابینبکات.

هەر چەندە زۆر لە لێکۆڵەرەوەکان گلەیی ئەوە دەکەن کە بیرمەندە چینییەکان ڕۆڵی کۆمەڵایەتی خۆیان لەدەستداوە وەك ویژدانی ئەتەوە چونکە لە لایەن حکومەتەوە دەستنیشان کراون ولە نـاو تایبەتمەندییەکانی خۆیانـدا تقـووم بـوون وەك مـرخیش، مرخیشی نێوان چەپی تـازە و ڕاسـتی تـازە،، ئەمـەش بۆتـە هـۆی لـەت بـوونێکی کۆمەڵایەتی ترسناك لە (چین) ی ئەمڕۆ.

هەندێك بیرمەند هەن کە لە دەرەوەی چین کەس ناویشیانیان نازانێت، وەك وانـگ هـۆیی Wang Hui، زهـانگ و ییـنگ Zhang Weiying ، یـوکیپنگ Yu Keping، پان ویی Pan Wei، زهـنگ بیجیـان Zheng Bijin، و خیویتـونگ، بەڵام هەر زوو بۆمان دەردەکەوێت کە جیهان لـەژێر کاریگـەری بـیرو بۆچوونەکانیان گـۆڕاوە. هـەر یـەك لـە وانـە حکومـەتیان ناچـار کـرد کـە گوێیـان لێبگـرن بـیرو بۆچوونەکانیـان قەبووڵبکەن و پلانـەکانیـان پیـادە بکـەن کـە دەبێتـە هـۆی گـۆڕینی سروشتی ئابووری، سیاسی و سیاسەتی دەرەکی چین. ئەوانـە خـەریکی شـەڕێکی زۆر کۆن و کلاسیکی نێوان ڕاسـت و چـەپن سـەبارەت بـە قـەبارە و شـێوەی دەوڵـەت و چاکسازی سیاسی و چۆنیەتی و سروشتی هێزن. لە گەرمەی گفتوگۆکـانی نێوانیانـدا فەلسەفەیەکی نوێ سەری هەڵدا کە ڕەنگدانەوەیەکی گرنگی دەبێت بەسـەر جیهانـدا. بڕیاری مەزن بە سـەرکردەی مـەزن دەدرێـت، چـین ڕەنگـە قـەت باوەشـی بـۆ بـازاڕ نەکردبایـەوە بـەبێ دنـگ خیـاو پیـنـگ (Deng Xiaoping)، تاتشـەریزم بـەبێ مارگرێت تاتشەر، هەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤیەت بەبێ گۆرباشۆف شەڕی عێـراق

ڕەنگە بەبێ جۆرج بۆش ڕووی نەدابا. بەڵام ئەستەمە گۆڕانکارییە مێژووییەکان تێبگەین بەبێ ورد بوونەوە لە لێکۆڵینەوە هزرییەکان و هەوڵەکانیان بۆ هێنانەکایەی بیر و باوەڕی تازە و مشتومالّیان بکەن بە گفتوگۆکانیان بەر لە وەی سەرکردەکان لە نامێزیان گرن. تاتشەر دانەهێنا ( Monetarism) مۆنیتەریزم، بەڵکو پشتی بەست بەو بیر و باوەڕانەی کە چەندین ساڵ کەڵەکەیان کردبوو. جۆرج بۆش کەوتە ژێر کاریگەری بیر و باوەڕەکانی محافزەکارە تازەکاندا (New-Conservatiove) و بیرمەندەکانیان دنگ خیاو پینگ بڕیاری لە ناکاوی نەدا بۆ کردنەوەی دەزگاکانی، بازاڕەکانی چین، بەڵکو لە ژێر کاریگەری ئەو بیرمەندانە ئەو بڕیارەی دا کە ماوەیەک بوو پەیوەندیان بە ڕۆژئاوادا هەبوو. ئەمڕۆش لە چین وا خەریکە بیر و باوەڕی تازە سەر هەڵدەدات کە ڕەنگە ببێتە هۆی سەرهەڵدان و دروستبوونی فەلسەفەی چینی تازە (بیرۆکەی جیهانی دیواردراو) (Wallecl World)

## بەشی یەکەم
## سەرمایەداری دەوڵەتی زۆرەوە

لە ساڵانی ۱۹۸۰ دا ئێمە هەر هەموومان چاکسازیخواز بووین، رەخنەمان لە ماویزم و ناماچەکانی دەگرت، ئێمە لە ژێر کاریگەری بیر و بۆچوونە رۆژئاواییەکان تەماشای بارو زروفی خۆماتماندەکرد، ئەوەی ئێمە دەمانکرد زۆر ساویلکە و تەم و مژاوی بوو.ئەمان دەزانی بە کردنەوەی بازارەکانی چین لە بەردەم رۆژئاوا چی روو دەدات. ئەماندەزانی کە بازارِ هەژار و دەوڵەمەند دروستدەکات. وامان دەزانی کە سوودی بۆ هەموو لایەك دەبێت و هەموو کەسێك سوودمەند دەبێت. بەڵام ئەم سوودە تەنها چەند ساڵێکی خایاند.

کە چوومە ژوورەکەی زهانگ وییەنگ یەکەم جار ئەو شتانەی کە لەسەر مێزەکەیدا بوو سەرنجیان راکێشام: تیوودەرزەن لە سیگاری کوبی لە جۆری (Cohiba)، رومێۆ و جولێت، مونتی کریستۆ، ئەوانەن نیشانەی خۆشگوزەرانی چینی ئەمرۆ بۆ ئەوانە ئەم هەلە ئابوورییەیان بە قازانجی خۆیان قۆستۆتەوە. ئەو چەند شتی سەرمێزەکە کە هێمای سومبلی فرۆیدزمە نرخیان چەندین جار لە داهاتی ساڵانەی جوتیارێکی چینی زیاترە، ژمارەی هەژاران یەکجار زۆرن کە بەسەرجەم لە قازانجی دەوڵەمەندەکان کار دەکەن تا دەوڵەمەندتر بن. ئەو سێ سەد باڵەخانەی کە سەریان لە هەور دایە لە شەنگەهای، یانیشی ستادیۆمی ئۆلۆمپی لە بەیگین بوونەتە نیشانەی شلیەتانی سروشتی ئابووریەك کە گرێکار تیادا بووە بە کالا، پارەش بە هەمان خێرایی پەیدا کردنی سەرف دەکرێت.

بەلام زهانگ وییەنگ ( Zhag Weiying) پێیوایە کە ئەوانە دەرئەنجام و باجی ئازادیین باجی ئەو کۆماری رۆژئاوای چینە کە بە هاو تەریبی لەگەڵ دەوڵەتی کۆمۆنیستی هاتە دامەزراندن.

ئەمەش بە دینامیکیەتی بە هێزی وردە وردە ئاسەواری ماویزم ناهێڵێت. وەك هەر ئازادیخوازێکی ئابووری (Economic Librals) یانیش راستخوازێکی تازە هەروەك نەیارانیان ناویان دەبەن ئەو پێیوایە کە ئابووری نەخشە کێشراو ( Planned Econowy) بەردی بناغەیە بۆ سەرکوتکردنی سیاسی: هەروەها دەڵێت ئازادی لە چین وەدەستنایەت هەتا کەرتی گشتی نەفرۆشرێتەوە بە کەرتی تایبەت واتە هەڵوەشانەوەی خاوەنداریەتی دەوڵەت بۆ کەرتی گشتی و تەسلیم کردنی بە کەرتی تایبەت، و دەبێت دەوڵەت هێندە لاواز بکرێت کە تاکە ئەرك یان گرنگترین ئەرکی دەبێتە پاراستنی مافی مولکیەت.

بە گوێرەی راستی تازە (New Right) تەنها ئەو کاتە دەتوانرێت کۆمەڵگایەکی مەدەنی دروستبکرێت کە توانای دامەزراندنی دیموکراسی سیاسی هەبێت. کەواتە سیگارەکان مانای ئەوە نییە کە دەوڵەمەندی هەمیشە زیندوویەتییە، بەڵکو سومبلی سەروەت و سامانی تاکە کەسییە و نیشانەیە کە لە رێگای ئازادی . لە پشت مێزەکەی زهانگ وینگ پێشانگایەکی ناو تومسی هەیە کە بە شووشە داپۆشراوە ژمارەیەکی زۆر لەو کتێب باشانەی کە ئەو بڵاوی کردوونەتەوە یان لە نووسینی ئەون، وێنەکانی خۆی لەگەڵ پیاوانی دەوڵەت، یەکێکیان لەگەڵ هەڵگری خەڵاتی نۆبل، بروانامە لە زانکۆ گرنگەکان، خەڵاتێك کەلە ساڵی ٢٠٠٢ لە کەناڵی سەنترالی تەلەفزیۆنی چینی CCTV وەریگرتبوو. ئەوانە هەموو نیشانەی ئەوەن کە پرۆفیسۆر زهانگ وینگ سەرکەوتووە لە کارەکەی و یەکێکە لە بە ناو بانگترین ئابووری ناسانی چین. بەڵام ژیان لە چینی ئەمڕۆدا زۆر سەختتر بووە بۆ ئابووری ناسانی وەك زهانگ وینگ. دوای سێ ساڵ لە هێنانی بیرو باوەڕی بیانی لە رۆژئاوا ئێستا وا هەستدەکەن کە چین پشتی تێکردوون و دژایەتیان دەکەن. راپرسییەکان نیشانیدەدەن کە بێ سومعەترین کەسن لەچین وەك هاوڕێکانیان لە فەرمانبەری سزادانی سەرپێچی راگرتنی ئۆتۆمۆبیل لە بەریتانی (Traffic Wardens) و مامەڵەچییەکانی ئۆتۆمۆبیل هەر لە بەریتانیا دیان. تووڕەیی خەڵك روو لە زیاد بووندایە سەبارەت بە

بەرز بوونەوەی نرخی چاکسازی، ژمارەی خۆپیشاندانەکانی دژ بە رووخاندنی تاپاسایی بالەخانەی گشتی، گەندەڵی و خواردنی یان تەداتی مووچەی خانەنشینی. دەرئەنجامەکەیشی بیرو باوەڕی بازاڕی ئازاد تووشی رووبەڕوو بووتەوە بۆتەوە لەگەڵ چەپی تازە (New Left) کە نەرمتر مامەڵە لەگەڵ سەرمایەداری دەکات. شەڕێکی بیروباوەڕ دەستپێکردووە لە نێوان دەوڵەت دژ بە بازاڕ هەرێمەکانی کەنار دەریا دژ بە هەرێمەکانی تری وڵات، شارە گەورەکان دژ بە دێهات و دەوڵەمەند دژ بە هەژار.

## بەکالتورییەتی ئابووریناسان:

سەرکەوتن پەیوەندییەکی زۆری بە کاتەوە هەیە، بۆ زهانگوینگیش ئەم کاتە زۆر لەبار بوو. لە گەرمەو لوتکەی حەماسەتی پرۆسەی چاکسازی دینگ خیاو پینگدا (Deng XIAOPING) بەکالتوریبوسی لە ئابووری وەدەستهێنا لە ساڵی ١٩٨٢. زۆر زەحمەتە بۆ رۆژئاواییەکان کە لە کۆمەڵگایەکی کراوە چاویان کرد بێتەوە کە بیرو رای جیاوازو دژ بە یەك زۆر بە ئازادی و زەقی باسدەکرێن لە دەوڵەتێکی خاوەن بەرنامەی وەك چینی دینگ بگەن. زهانگ وینگ هەمیشە وشەی تەبشیری (Missionary) بەکار دەهێنێت بۆ وەسفکردنی حاڵەتی پابەند بوونی لە بەردەوام بوون لە گەشەسەندنی ئابووری.فرانزکافکا (Franzkafka) کە گرنگی دەدا بە نووسین لەسەر کۆمەڵگای داخراو، لە نووسینێکی سەبارەت بە دیواری مەزنی چین هەڵوێستی دەسەڵاتدارانی چین لە کاتە جیاجیاکانی مێژوودا بەم جۆرەباس دەکات:- پەنجا ساڵ بەر لە دروستکردن، بە دروستکردنی دیواری مەزنی چین بڕیاری ئەم دروستکردنە درابوو. دەوڵەت و حکومەتی چین بە فەرمی ئەندازیاری و بەرد شکاندن و وەستای دیواری بە بەرزترین ئاستی مەعریفەت دەناسن.

بەشەکانی تری مەعریفەت هەر ئەوەندە گرنگە ئەگەر پەیوەندییەکی راستەوخۆیان هەبوایە لە کار ئاسانی دروستکردنی دیواری مەزن، ئەو کاتە زهانگ وینگ زانکۆی تەواو کرد لە ١٩٨٢ دەبوایە دیوارێك لە جۆرێکی تر دروستبکرێت، بازاڕی ئابووری

چینی. پارتی کۆمۆنیست زووتریش بڕیاری دابوو کە گەشەسەندنی ئابووری ئەرکی سەرەکییانە، هەر بۆیەش لە ناکاو هەموو کەس دەیانویست ببن بە ئابووری ناس. وانگ هەیی (Wang Hui) دەڵێت ئابووری ناسی لەگەڵ گەشەسەندنی ئابووری هێزی ئەخلاقی پەیدا کردبوو، هەر بۆیەش ئابووری ناسان کاریگەری و دەسەڵات، سەروەت و سامانیان لە زیاد بووندا بوو. حکومەت دەستیکرد بە دارشتنی پلان بۆ فرۆشتنەوەی کەرتی دەوڵەت بە گشتی بە کەرتی تایبەت (Privatization) ئەمەش بووە هۆی پەیدا بوونی دەیان کۆمپانیای تازەی کەرتی تایبەت

(لە کۆی ٢٧٤ کۆمپانیا و پرۆژەی ئابووری چین بەڕێوەبەری ١٣١ دانەیان ئابووری ناسی ئەکادیمایین).

ئابووری ناسان وەك چینێکی تازەی پیاوانی ئایینیان لێهاتووە، زۆر سەرکەوتوو بوون لە گفتوگۆ کانیان لەگەڵ زانایانی دەوڵەت، چونکە ئەو زانایانە تەنها پشتگیریان لە بڕیارەکانی سەرۆك دەکرد بە چاك و خراپ.

دیکتاتۆریەتی دینگ خیاو پینگ (دیکتاتۆریەتی ئابووری ناسان) رق و داخێکی زۆری لای زانایانی سیاسەت و فەلسەفە و زانستە کۆمەڵایەتییەکان دروستکرد، چونکە ئەوانە پێیان وا بوو کە دەرئەنجامەکانی ترسناکن. بەڵام بۆ ماوەی ٣٠ ساڵ ساڵانە پێشکەوتن و گەشەسەندنی ئابووری ٩٪ بوو ئەمەش وایکرد کە چین لە ساڵی ٢٠٠٧ ببێت بە سێ هەمین و بەهێزترین ئابووری جیهان. لەم ماوەیەدا ٣٠٠ ملیون کەس لە هەژاری رزگاریان بوو، لە هەمانکاتیشدا ٢٠٠ ملیۆن کەس لە کێڵگەکانەوە گواسترانەوە بۆ کارگەکان، ١٠٠ ملیون کەس بوون بە چینی ناوەراست ( Middle Class) وە ٥٠٠ هەزار کەسیش بوون بە ملیۆنێر و نموەیەکی تازەی کۆمپانی چینی هاتنە بازاڕەوە وەك لینۆڤۆ (Lenovo) کە IBM یان کڕییەوە، و کۆمپانیای نانجین (Nanjin)کە MG رۆڤەری بەریتانیان کڕییەوە (MG Rover) بەم جۆرەش هاتنە دونیای گەوران.

هەر بەهەمان شێوازی سەرکەوتنی زهانگ وینگ ئەوا مۆعجیزەی ئابووری چین دەگەڕێتەوە بۆ کات. چونکە وەك رووسیا و ئەمریکای لاتین خەریکی دروستکردنی کۆسب و تەگەرە نەبوون لە بەردەم ئازاد کردنی بازاڕەکانیان لە رێگای سەپاندنی چارەسەری ئابووری شۆك (Economic Shock therapy).

دینگ خیاو پینگی سەرۆکی چینی کات و شێوازی دیاریکراوی نەبوو بۆ ئەنجامدانی چاکسازی.هەندێك لە سەرکردەکانی پارتی کۆمۆنیست وەك چین یون chen Yun و لی خیانیانLi Xiannian و دینگ لیکرین Deng Liqunژی چاکسازی بازاڕ بوون، ئەوانە پێیان وا بوو کە دەکرێت گرفتەکانی چین دەکرێت بە پلانی ئابووری تازە و مۆدێرنی زانستی هەروەك هی هاوڕێکانیان لە سۆڤیەت چارەسەر بکەن. لەبەر ئەمەش دینگ خیاو پینگ و هاوڕێکانی نەیانتوانی نەخشەیەکی روون و ئاشکرا بۆ گۆڕانکاری ئابووری چین ئامادە بکەن. لە جیاتی ئەوەش زۆر ژیرانە یەکەیەکە بەردە بازیان دادەنا تا بە سەلامەتی بیپەڕینەوە، هەنگاو بە هەنگاو گۆڕانیان ئەنجامدەدا بەبێ ئەوەی ئامانجی یەکجارەکیان دەستنیشان بکەن. لە کاتە سەختەکانیشدا ئامۆژگاری دینگ خیاو پینگ بریتیبوو: کورترین ماوە لە نێوان دوو خاڵ هێڵێکی خوارە.

زهانگ وینگ چیرۆکێکی سەیرو خۆش دەگێڕێتەوە بۆ روونکردنەوەی چاکسازی چین لە چیرۆکەکە باس لە گوندێك دەکات کە خەڵکەکەی ئەسپ بەکار دەهێنن وەك بار هەڵگر. هەر کەسێکیش جورئەت بکات بڵێت ئەو زێبرایانەی کە گوندەکەی دراوسێیان بەکاریان دەهێنن باشترن لە ئەسپەکانی گوندی خۆیان، ئەوا ریشسپی و پیری گوندی ئەسپەکان دەستبەجێ خیتابێکی دوور و درێژی بۆ دەدەن و ئابڕووی دەبەن ئەوەك جارێکی تر کەسێکی تر ناماقوولی وا بکات بەڵام دوای ماوەیەك پیرو ریشسپییەکان بۆیان دەرکەوت کە زێبراکان لە راستیدا زۆر لە ئەسپە ئەمبەڵ و چاو چنۆکەکانی وان باشترن، کێشەکەشی ئەوەیە کە چەندین ساڵە ئەوان پروپاگەندەی بۆ ئەسپەکان دەکەن مێشکی خەڵکی گوندەکەیان پڕ کردووە بە باشی ئەسپ، سەرەڕای

ئەمەش بڕیارنەدا کە لەمەولا دەستبکەن بە بەکار هێنانی زێبڕا بە جۆرێک کە کاردانەوەی لای دێهاتییەکان دروستنەکات کە چەندین ساڵ بوو خەریکی شۆرینەوەی مێشکیان بوون بە باشی ئەسپ.ڕیشسپییەکان پلانێکی زۆر ژیرانەیان داڕشت، هەموو شەو دوای ئەوەی هەموو خەڵك دەنوستن دەچوون ئەسپەکانیان بە بۆیەی ڕەش ڕەنگ دەکرد بە جۆرێك تا لە زێبڕا بچن، کە گوندی ڕۆژی دواتر ئەمەیان دەبینی سەرسام دەبوون ڕیشسپییەکان ئارامیان دەکردنەوە و دەیانگوت ئەوە خۆمان ڕەنگمان کردوون و هەر ئەسپەکانی جارانن زێبڕانین، ئەم کارە بەردەوام بوو هەر شەوەی چەند ئەسپێکیان ڕەنگ دەکرد تا خەڵکی ئاوایەکە ڕاهاتن لە بینینی ئەسپ کە لە زێبڕا دەچێت. دوای ماوەیەك ڕیشسپییەکان دەستیانکرد بە گۆڕینی ئەسپە بۆیە کراوەکان بە زێبڕای ڕاستەقینە، بەمە بۆیان دەرکەوت کە زێبڕاکان زۆر بەهێز و چالاکترن لە ئەسپەکان و بەرهەمی دێیەکەیان چەندین جار زیاتر بوو لە جاران . دوای چەندین ساڵ وەپاش ئەوەی توانیان بە سەرکەوتوویی هەموو ئەسپە ڕەنگکراوەکان بگۆڕن بە زێبڕا کە بوو بووە مایەی قازانج و خۆشگوزەرانی پیرو ڕیشسپییەکان خەڵکی گوندەکەیان کۆ کردەوە و رایان گەیاند کە کۆمەڵگاکەیان بریتییە لە دێی زێبڕاکان، کە واتە زێبڕا باشە و ئەسپ خراپە.

زهانگ وینگ بەم جۆرە ئەو بیر و باوەڕە بە ئاویانگە ڕوون دەکاتەوە و بانگەشە بۆ بیرۆکەی (جووت ڕێگای نرخ دانان) دەکات (Dual Track Pricing) کە بۆ یەکەمین جار لە ساڵی ١٩٨٤ هاتە جێ بە جێ کردن.

بەم جۆرەش پشتگیری لە بیرۆکەی جووت ڕێگای نرخ دانان دەکات و دەوڵەت ئەمە ڕێگا بە حکومەت دەدات تا خۆ بپارێزێت لە دانانی نرخی کالا و کەل و پەل و ڕێگا خۆشدەکات تا بازاڕی ئازاد نرخ دیاریبکات، بەبێ ئەوەی حکومەت ناچار بێت بکەوێتە خانەی دژایەتی کردنی سۆسیالیزم، بیانیش ڕووبەڕووی بەر هەڵستکاری هەرێمەکان بینەوە چونکە سوودمەند بوون لە پلاندانانی ناوەندی. لە ژێر کاریگەری ئەو بۆ چوونەی زهانگ وینگ هەندێك کالا و خزمەتگوزاری بەردەوام بوون لەسەر

فرۆشتن بە نرخی دەوڵەت لەو کاتەی هەندێکی تر لەم کاڵا و خزمەتگوزاریانە بە نرخی بازاڕ دەفرۆشران. دواتریش وردە وردە ژمارە و رێژەی ئەو کاڵاو خزمەتگوزاریانەی کە بە نرخی بازاڕ دەفرۆشران روو لە زیاد بوونیدا بوون هەتا سەرەتای ساڵانی ۱۹۹۰ زۆربەی هەرە زۆری ئەم کاڵاو خزمەتگوزاریانە بە نرخی بازاڕ دەفرۆشران.تاقیکردنەوەی جووت رێگا دوو شتی گرنگی لە خۆوە گرتبوو و پلەپلەی یانیش سیاسەتی هەنگاو بە هەنگاو (Incremen lism)، بەمەش چاکسازیخوازی چین لە جیاتی رووبەروو بوونەوەی راستەوخۆ لەگەڵ کۆسپ وتەگەرەکان بە دەوریان دەسووڕانەوە بەدوای چارەسەری کەم کێشە. لە جیاتی وازهێنان داخستنی سیستەمی کۆنی پلاندانانی ناوەندی، یەکەم جار ئەلتەرناتیڤێکیان شان بە شانی سیستەمە کۆنەکە دروستکرد، کاتێکیش لەم کارەیان سەرکەوتوو بوون ئەوا چاکسازیان بەسەر سیستەمە کۆنە داهێنا بە جۆرێك باشترین خاسیەتی تازەیان لە سیستەمە کۆنەکەدا موتوربە کرد.

**سەرمایەداری [illegible]:**

لە شۆڕشی بەردەوام بۆ داهێنانی بەردەوام (تازە بوونەوە) زهانگ وینگ تاکە کەس نەبوو کە باس لە (جووت رێگای نرخ دانان بکات) بەڵام یەکەم کەس بوو کە بە ئاشکرا بانگەوازی بۆ دەکرد. ئەم بانگەوازەیەشی بوو بە هۆی ئەوەی کە زوو پۆستی بەرپرسی دەزگای چاکسازی دەوڵەتی پێ بسپێردرێت کە لە ساڵی ۱۹۸٤ تا ۱۹۹۰ لەم پۆستە مایەوە. کارەکەی زهانگ وینگ لەگەڵ کۆمەڵێك کارمەندی حکومی لاودا بریتیبوو لە جوانکردنی بیر و باوەڕی بازاڕی ئازاد بۆ نوخبەی (Elite) سەرکردە بەتەمەنەکانی پارتی کۆمۆنیست. ئامانجیان بریتیبوو لە رەنگ کردنی زۆرترین ژمارە لە زێڕاکان بۆ دروستکردنی بازاڕێکی هاوتەریب لە نێو قەپێلکی (قاوغی)، (Shell) وڵاتی چینی سۆسیالستی.

چاکسازی ئابووری چینی لە دێهاتەکان بە هەڵوەشاندنەوەی هەرەوەزییە میللییەکان دەستیان پێکرد (Peoples Communs). هەروەها کۆتایی هێنان بە کێڵگە هەرەوەزییەکان لە ساڵی ١٩٧٩. پتر لە بیست ساڵ زووتر ژیانی دێهاتەکان لە ژێر ناونیشانییەکەی کار ڕێکخرا بوون (Work Units) کە تیادا خەڵك بە یەکەوە دەژیان، کاریاندەکرد و نانیشیان بە یەکەوە دەخوارد. ئامانجی یەکەی کار بریتی بوو لە گرتنەوەی شوێنی خێزان و ببێتە بناغەی جموجۆڵی ئابووری و ژیانی کۆمەڵایەتی. لەگەڵ دەستپێکردنی سەردەمی چاکسازی ئەم یەکانە داخران، لە جێگای ئەوانەی کێڵگەی بچووك بچووك دروستکران کە لە لایەن چەند خێزانێکەوە بەڕێوە دەبران، لە هەمووشی گرنگتر ئەوە بوو کە ئەم خێزانانە دەیانتوانی بڕیار بدەن کە چ جۆرە بەروبوومێك بروێنن و قازانجەکەیشی بۆ خۆیان بێت. ئەمە بووە هۆی دروستبوونی جموجۆڵێکی یەکجار زۆر لە بواری کشتوکاڵی و بەرز بوونەوەی بەرهەمهێنان بە ڕێژەیەکی زۆر بەرز و لە دەرئەنجامیشی بە هەزاران گرێکار لە کێڵگەکان ئازاد بوون. ئەم کرێکارە ئازادانەش لەو کارگە تازانە دامەزران کە پێیان دەگوترا (پرۆژەی شارو گوند) (Town and Villge Enterprises) کە سەرتاسەری دێهاتەکانی وڵاتیان گرتبۆوە.ئەم شۆڕشە ئابوورییەی کە دێهاتەکانی گرتەوە کە بووە هۆی خۆشگوزرانی و دەوڵەمەند بوون سوودێکی ئابووری زۆری بەخشی بە حکومەتی هەرێمەکان. بەڵام ئەوە نەبووە هۆی دڵخۆشی زەهانگ وینگ و هاوڕێکانی تا شانازی پێوە بکەن... چونکە ئەوە تەنها سەرەتا بوو.لە هەوڵ و پشکنیندا بە شوێن چینی تازە هەموو شوێنێکیان بەسەر کردەوە، سنووری دێهاتەکانیان بەزاند هەر چەندە چاکسازییەکە لەوێ دەستپێکردبوو، هەر بەتە زەوییەك، تەنانەت نیمچە دوورگەکەی ناو ڕووبارەکانیش، دواتر هەڵکشان بەرەو هەرێمە ڕۆژهەڵاتییەکانی سەر کەنار، لە سەرەتای ساڵانی هەشتاکاندا شێنز هێن (Shenzhen) گوندێکی نەناسراو بوو خەڵکەکەش کە چەند هەزار کەسێك دەبوون بە ڕاوە ماسی دەژیان. بەڵام لە ماوەی سی (٣٠) ساڵی رابردوو دا شێنزهێن بوو بە شا نموونەی ئەو سەرمایەدارییەی کە زەهانگ وینگ و هاوڕێکانی

بۆ چینیان دەخواست و سەرکەوتن لە دروستکردنی. لەبەر نزیکی شـێنزهێن لـە هـۆنگ کۆنگەوە لە لایەن دینگ خیاو پینگ هەڵبژێردرا تا ببێت بە یەکەمین ناوچـەی ئـابووری تایبەت (Special EconomicZone). سەرکردەکانی ئەم شارە ئازاد کـران لـە ژێـر باری یاساکانی دەوڵەت و دەستیان واڵا کرا، باجیان لەسەر لا چوو مۆڵـەتیان پێبەخـشرا تا ببن بە نموونە و ڕێگا خۆشکەر بۆ بیر و باوەڕی تازەی بـازاڕ. ئەنـدازیارانی چاکـسازی شێنزهێن نەیاندەویست لاسایی ئـەو سەرکەوتنەبچووکانەی کـە پـشتیان بەسـتبوو بـە تەکنەلۆژیایەکی نزم بکەنەوە کە ناونرا بوو شۆڕشی پیشەسازی دێهاتەکان لـە سـەرەتای سەردەمی چاکسازی بەڕێوە چوون لە ژێر دروشمی بوونەوە و چاکسازی.

ئەوان دەیانویست کارگەی گەورە دروستبکەن بە تەکنـەلۆژیای بـەرزو بـۆ ئـەوەی ژمارەی یەکجار زۆر کاڵا بەرهەم بێنێت کە نرخیان بەرزو بە قیـمەت بن تا راسـتەوخۆ پێشبڕکێ لەگەڵ کاڵا ڕۆژئاواییـەکان بکات. بۆ بە ئەنجام گەیاندنی ئەم خەونـە مەزنـە دەسەڵاتداران پلانی تایبـەتیان دانا بۆ هێنانی سەرمایە تەکنەلۆژیای بیانی. شێنزهێن بە تەنها توانی ٣٠ ملیار دولار لە سەرمایەی بیانی بۆ جێ بـەجێ کردنـی پرۆژەکـان هەر لە دروستکردنی کارگـە و ڕێگاوبـان و دروسـتکردنی و گەشـە پێـدانی بەنـدەر. نهێنی سەرکەوتنی شێنزهێن دەگەڕێتەوە بۆ پـشت بەسـتینیان بـە هەناردنـە دەرەوە (Exports)، لە جیاتی سەرنکردنی کەلوپەلەکانیان یا خودکاڵا لە ناوەوەی چـین بـۆ پەرەدان بە گەشـەندن. بڕیاری (ناوچەی ئابووری تایبەت) هۆکارێکی زۆر گرنگ بوو بۆ دروستبوونی کەرتی تایبەت و پرۆژە ناحکومییەکان

(Non State Sector) ئەمـەـش وایکـرد کۆمپانیـای خـاوەن پـشك (Sharholding)لە دەرئەنجامیش تا ساڵی ٢٠٠١ نیوەی داهاتی پیشەسازی چین لە لایەن کەرتی غەیرە حکوومی هاتبووە بەرهەم. (Non State Sector).

تاقیکردنـەوەی دروسـتکردنی (ناوچـەی ئـابووری تایبـەت) کـە بـوو بـە هـۆی بەرهـەمهێنانی کـاڵای گرانبـەها و خزمـەتگوزاری بـوو بـە کلیلـی پێـشکەوتن و سەرکەوتـی چین سەرمایەیەکی یەکجار گـەورەی پێویـست بـوو و دەبوایـە لـە پاشـە

کەوتە زۆرەکانی دەوڵەت کە لە هەناردنە دەرەوەی کاڵا هاتبوونە دەستیان پاشەکەوت کرابوون سەرف بکرێت، نەك لەسەر حیسابی خەرجییە ناوخۆییەکان لەم کارەشیان پشتیان بەستبوو بە ژمارە بێ نەهاتووەکانی کرێکاران، چونکە لەو کاتەی ژمارەیەکی یەکجار زۆر لە کرێکارانی کێڵگە دێهاتەکانیان جێ دەهێشت ئەوا هەرێمەکانی سەر کەنار توانیان هەموویان بخەنە سەرکار، بەم جۆرەش نەیاندەهێشت مووچەی کرێکاران بەرز بێتەوە. لە لایەکی تریش بەم کارە راستەوخۆ خەلکی کەم دەرامەت لە رێگای کارەکانیان داهاتیان لە دەوڵەمەندەکان پەیدا کرد، بەبێ ئەوەی بخوازێت باس لە دووبارە دابەشکردنەوەی داهات بکەین. دینگ خیاو پینگ بە ئاشکرا رایگەیاندکە (دەبێت سەرەتا هەندێك دەوڵەمەند بن) ، لەوەش زیاتر دەڵێت دەبێت هەرێمەکان لە چێشتخانەی جیاجیا نان بخۆن لە جیاتی ئەوەی هەموو داهاتەکان لە یەك مەنجەڵێ بکرێت. لە ئەنجامی ئەم سیاسەتەش چاکسازیخوازانی هەرێمەکانی رۆژهەڵات رێگایان پێدرا کە ئازاد بن و خۆیان لە هەژاری رزگار بکەن.

پێشکەوتنی هەرێمەکانی سەرکەنار رەنگە راستی ئەو قسەیە دووپاتبکاتەوە کە چەندین ئەوەی چاکسازیخوازانی چین دەیانگوتەوە لەوەی کە هۆی دواکەوتنی وڵاتەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ محافزکاری و دواکەوتوویی هەرێمەکانی دوور کەناری پانیشی ناوەڕاستی وڵات ئەمەیش بۆتە رێگر لە بەردەم چین تا نەتوانێت کێبڕکێ بکات لەگەڵ ئەو شارستانیەتانەی کە هێزی دەریاییان هەیە ( Maritime Civilizations) وەك بەریتانیا، فەرەنسا، ژاپۆن و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە زاڵبوون بەسەر بازار، بازرگانی و داگیر کردن. چاکسازییەکانی ساڵانی ۱۹۸۰ سنووری چاکسازی ئابووری بەزاند و رێگای خۆشکرد بۆ پرۆسێسەکی زۆر فراوانی گۆڕینی کۆمەلایەتی. چینییەکان ناویان نا هەڵچوونی کەلتووری Cultural Fever ، ئەم هەڵچوونە گەیشتە لوتکە کاتێك لە مانگی حەفتی ۱۹۸۸ دوکیومێنتەرێکی شەش زنجیرەیی لە ژێر ناونیشانی رووباری نیلگی لە کاتە گرنگەکانی (River Elagy in prime time) لە کەناڵی سەرەکی چین پەخشکرا.

چیرۆکی ئەو فیلمە کە باس لە رووباری زەرد دەکات کە زۆربەی جار بە رووباری دایک ناو دەبرێت چونکە بە لانەی شارستانیەتی چینی لە قەڵەم دەدرێت، لێرەدا هێرشێکی زۆر توندی راستەوخۆ ئاراستەی داب و نەریتە چینییەکان دەکات.

لە جیاتی ئەوەی رووباری زەرد وەك نیشانەی گرنگی و گەورەیی چینییەکان بە شێوازێکی نموونەیی و رۆمانتیکی قەبوولێکات ئەم لەم چەند زنجیرەیەدا رووباری زەرد بە دوژمن وەسفدەکات کە خەڵکی چین بوونەتە قوربانی لافاوەکان و وشکبوونەکانی . لە هەر ئەڵقەیەکیش باس لە یەك لە داب و نەریتەکان دەکات کە بۆتە هۆی دواکەوتنی وڵات. بۆ نموونە دیواری مەزنی چین وەسفدەکات کە بۆتە سومبلی دابڕینێکی بێ مانا. لە کاتێك هێرش دەکاتە سەر خێزانی پاشایی مینگMing کە چۆن جموجۆڵی دەریایی چینیان قەدەغە کردووە. نووسەری ئەم بەرهەمە هەر لە یەکەم زنجیرەوە بە رەخنە توندەکانی سەرنجی هەموولایەکی راکێشا و سەرجەم نەتەوەی هەژاند کە گوتی: خاڵێکی تاریك و نادیار لە رۆحی نەتەوەییماندا هەیە کە بریتییە لە بڕوایەکی نادیار یان هەستێکی نادیار بە شەرمەزاری لە سەدەی رابردوودا، ئەوەش دابڕانە لە مێژووە پرشنگدارەکەمان.هەر لە سالآنی ۱۸٤۰ وە خەڵکانێك هەوڵیان داوە سوود لە رابردووی مەزن و پرشنگداری وڵات وەرگرن بۆ زاڵبوون بەسەر ئەو دواکەوتنە شارستانییە و لاوازییەی کە ئەمرۆ چین تیدا دەژیت، بەڵام راستییەکە ئەوەیە ئێمە خاوەن شارستانیەتێکی بەرز بین و لە ململانێ دابین لەگەڵ شارستانیەتەکانی تر بەڵام ئەمرۆ ئێمە لە قۆناغی مەت بوون یان سڕ بوون داین. نووسەرەکە داوا لە خەڵکی چین دەکات کە چیتر وابەستەی ئەو داب و نەریتە کۆمەڵایەتیانە نەبن کە بوونەتە کۆسپ و تەگەرە لە بەردەم تازە کردنەوەی وڵات (Modernization). چین دەبێت پشت لە دێهاتەکان بکات، تەنها پشت بە رووباری زەرد نەبەستێت، بەڵکو هەموو گورو توانکان روو لە ئۆقیانووس و ئەو دنیایەی کە لە پشتەوە دێن بکات. دوا پەردەی زنجیرەی کۆتایی رووباری زەرد نیشاندەدات کە چۆن دەرژێتە ناو دەریاو تیادا ون دەبێت.

وەك سومبلی مەزنی جیهانی رۆژئاوایی دوای ئەوەی باوەشیان بۆ تازە بوونەوە کردەوە (Modeknity). دوابەدوای تەواو بوونی هەر زنجیرەیەك قوتابیانی زانكۆكان و كۆلیجەكان سەرجەمی ولآت دەمەتەقێ و گفتوگۆی لەبن ئەهاتوویان لەسەر كرد. پێنج ملیۆن كۆپی لەم زنجیرانە فرۆشران، بوو بوو بە یەكەم بابەتی فرۆشتن لە شوێنی فلە فرۆشتن یان بە كرێدان. سەرۆك وەزیرانی چاكسازیخواز زهاو زیانگ Zhao Ziyang بڕیاری دووبارە پەخشكردنەوەی دەركرد لە كەنالی تەلەفزیۆنی ناوەندی چینی (CCTV) كەمتر لە ساڵێك دوابەدوای بڵاوكردنەوەی ئەو زنجیرەیە هەڵچوونی كەلتووری بایدایەوە و بوو بە هەڵچوونی سیاسی كەبوو بە ئەنجامی دروستبوونی خۆپیشاندانەكانی گۆڕەپانی تیانیانمین (Tiananmen) ی ساڵی ۱۹۸۹. سەرەتای خۆپیشاندانەكان بە رێپێوان دەستیانپێكرد بۆ یادكردنەوەی سەرۆكی پێشوو هیویاوبانگ (HuYaobang) لە ۱۹۸۹/٤/۱٥ ، ئەم رێپێوانە لە ماوەیەكی كورت و زۆر بەخێرا بوو بە نارەزایی دەربڕین دژ بە گەندەڵی و بەرز كردنەوەی دروشمی داخوازی چاكسازی سیاسی و مافی كرێكاران. ئەم نمایشە وێنەیەی جەماوەر بۆ ماوەی شەش حەفتە بەردەوام بوو و شەقامەكانی بەیجینیان كۆنترۆڵ كردبوو، تروسكەیەك لە هیوای بە جیهان بەخشی سەبارەت بە گۆڕینی دیموكراسی لە چین، بەڵام ئەم تروسكە هیوایە كەوتە بەر گەردەلوول كاتێك لە ۱۹۸۹/٦/٤ تانك و سەربازی چینی كۆتاییان بەم نارەزایی دەربڕینانە هێنا. كپكردنەوە و نەهێشتنی نارەزایی تراژیدیایەكی كەم وێنەی مرۆڤایەتی بوو، رووی راستەقینەی چاكسازی و گەشەسەندنی سیاسی و ئابووری چینی نیشاندا.

**ئەو جەمسەرگەکانی لیبرالیزم:**

یەكێك لەو خوێندكارانەی كە بە تەلەفزیۆنەوە نووسابوو لە كاتی پێشكەشكردنی زنجیرەی رووباری تێلگی (River Elegy) وانگ هیو بوو (Wang Hui) كە ئەو كاتە خەریكی خوێندنی دكتۆرا ph.D لە ئەدەبیاتی چینی و بەشداریكرد لە

خۆپیشاندانەکانی ١٩٨٩. هەروەك زۆربەی رۆشنبیران و خوێندکارانی زانست وانگ هیو یەکێك بوو لە هەوادارانی زینگ دیاوییگ و سیاسەتی (دەرگای کراوە)، و بروایەکی بە هێزی بوو بە قازانجەکانی بازاری ئازاد. بەلاّم کاتێك وانگ هیو بۆ دواجار گۆڕەپانی خۆپیشاندانەکانی بە جێهێشت نەیدەزانی کە دەستدەکات بە سەفەرێك بۆ فێربوونی زانست و مەعریفەت کە دید و بۆچوونی بۆ دونیا دەگۆڕێت و دەڵێت: سەر لە بەیانی ١٩٨٩/٦/٤ بۆ دوا جار لەگەڵ گروپێك لە هاوڕێکانی پۆلەکەم گۆڕەپانی (تیانیانمین) مان جێهێشت ئەو کاتە من دڵم پڕ لە تورەیی و بێزاری و بێ دەسەڵاتی. لەو کاتەی حکومەت خەریکی راونان و گرتن و سزادانی رێکخەرانی خۆپیشاندانەکانیان دەدا وانگ هیو رووی لە شاخەکان کرد بۆ خۆشاردنەوە، توانی بۆ ماوەی دوو ساڵ لەوێ بێنێتەوە لەم ماوەیەشدا شارەزایی و پەیوەندی چاکی دروستکرد لەگەڵ جوتیاران و هەژاران و کرێکاران، هەر ئەوەش یارمەتیدا تا بلس و گفتوگۆ لەسەر یەکسانی و داد و (بازاری ئازاد رێکخراو بکات) گەیشتە ئەو قەناعەتەی کە دەبێت دەوڵەت رۆڵی خۆی ببینێت بۆ نەهێشتنی نا یەکسانی و ناعەدالەتی.

هەتا ساڵی ١٩٨٩ بیرمەندە چاکسازخوازەکان یەکگرتوو بوون و لەو بڕوایە دابوون کە ئازادی سیاسی و ئابووری رۆژئاوایی لێك جیا ناکرێنەوە و پیادە کردنیان سوود بە گەلی چین دەبەخشێت. نەیارانیشیان بریتیبوون لەو محافزەکارانەی کە پاڵپشتیان لە هێشتنەوەی ولاّت دەکرد هەر بە پیادە کردنی سیاسەتە کۆنەکان دوابەدوای ئەو خوێن رشتنەی بوو بە هۆی دامرکاندنی خۆپیشاندانەکان چاکسازخوازەکان دابەشبوون بەسەر دوو سەربازگا، راستی تا (New Right) بە سەرکردلیەتی بیرمەندی وەك زهانگ وییێنگ (Zhang Weiyiug)، کە بازاری ئازاد بە گرنگترین ئامانج دەزانێت و ئامادەیە بۆ هێنانەدی ئەم ئامانجە سیاسەتێکی فاشستی پیادەبکات.ئەوەی تریش چەپی تازە (New Left) کە لەسەرەولا زیاتر باسیاندەکەین، ئەوانەش وانگ هوی (Wang Hui) سەرکردایەتیان دەکات و بڕوایان

وایە کە یەکسانی و دیموکراسی سیاسی دەبێت لەسەر حسابی ئازادی رەهای بازاڕ بێت.

ئەم بار گرژی و ناکۆکیانە لە نێو جەرگەی خۆپێشاندانەکان بوونیان هەبوو. ئێمە لە رۆژئاوا رووداوەکانی گۆڕەپانی تیانیانمیانمان بە رووبەڕوو بوونەوەی نێوان کۆمەڵێك قوتابی و دەوڵەتی کۆمونیستی دواکەوتوو دەبینی، کە قوتابییەکان دەیانخواست بِبن بە بەشێك لە جیهانی سەرمایەداری و ئازادی و دیموکراسی بەڵام وانگ هیو کاتێك کە لە ئاراوگە دەژیا لە ساڵی ١٩٩٧ لێکۆڵینەوەیەکی بڵاوکردەوە سەبارەت بە ماناکانی رووداوەکانی ١٩٨٩ کە تیادا تیشك دەخاتە سەر ئەو کرێکارانەی هاتبوون و بەشدار بوون لەم خۆپێشاندانانە بەڵام بەداخوازی جیاواز. ئەوان داوای باشکردنی باری گوزەران و کۆمەڵایەتی و ئابووریان دەکرد. هۆی بەشداری کردنیشیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو چاکسازییە ئابوورییانەی کە لە ساڵی ١٩٨٨ دەستیانپێکرد کە ببووە هۆی گران بوونێکی کەم وێنەی سەرجەم نرخی شتومەك و هەڵاوسانێکی زۆر بەرزی ئابووری. ئەم کرێکارانە هیچ قازانجێکیان نەبوو لەوەی ببن بە شتێك لە رۆژئاوا. لە راستیدا داخوازی کرێکاران بریتیبوو لە چەسپاندنی نرخ ، سۆگەر کردنی ئاسایشی کۆمەڵایەتی (Social Security) و کۆتایی هێنان بە گەندەڵی. وانگ هەوی ئەم مەترسی و داخوازییانە بە بەشێك لە بەرگری جیهانی دەزانێت بەرامبەر لیبراڵی تازە .Neo Liberalism

هەروەها خۆپێشاندانەکانی تیانیانمین بە نارەزایی دەربڕینەکانی دژ بە جیهانگیری (GLOBALIZATION) لە سیاتل و جەنوا Genoa دەچوێنێت.

وانگ هوی دەڵێت خۆپێشاندەرانی گۆڕەپانی تیانیانمین دوو داخوازی و بەرنامەی جیاوازییان هەبوو، لە کاتێك گروپێك داوای خۆشگوزەرانی و دابینکردنی پێداویستییە بنەڕەتییەکانی ژیان دەکرد، هەروەها داوای پاراستنیان دەکرد لە فشاری بازاڕی ئازاد ئەوا گروپەکەی تریان داوای دیموکراسی و پاراستنیان دەکرد لە سەرکوتکردنی دەوڵەتی کۆمونیستی. هەروەها دەڵێت لەناو بردن و بەکاربردنی دەنگی

نارەزایی لە خۆپیشاندانەکانی ۱۹۸۹ هەر تەنها دەنگی خوازیارانی دیموکراسیان کپ نەکردەوە، بەڵکو کۆتاییش هێنا بەو گفتوگۆ گشتییە و ئاشکرایەی کە لەسەر ناعەدالەتی لە ئارادا بوو.لەو کاتەی ئانکەکان کاری خۆیان بەجێ گەیاند، پرۆسەی گۆڕین و باوەشکردنە بۆ بازاڕی ئازاد خێراتر کرا. چاکسازی نرخ (Price Retorms) کە لەنیوەی دووهەمی ۱۹۸۸ راگیرا بوو، لە سێپتێمبەری ۱۹۸۹ دووبارە دەستی پێکردەوە. لە ساڵی ۱۹۹۲ دینگ خیاو پینگ سەردانێکی شارەکانی کەنارەکانی باشووری وڵاتی کرد هەر لە کوانگژهۆ Guangzhou ، شینژهینShenzhen، بۆ دووپاتکردنەوەی بەردەوام بوون لە چاکسازی کە زۆر گۆڕانکاری تریان بە دوادا هات، دینگ ئەم سەفەرەی بەکار هێنا بۆ زاڵبوون بەسەر محافزکارەکان، هەر لێرەش دەنگی بەرز کردەوە بۆ بەربەرەکانی کردنی گەندەڵی، قاچاغچیاتی، نایەکسانی لە دابەشکردنی سامانی وڵات، زێدەرۆیی لە دروستکردنی خانوو بەرەو بیناسازی، گرفتە پەیوەندی دارەکان بە خۆشگوزەرانی و پیسبوونی ژینگە، هۆی ئەویش دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی سەرجەم داوا کاریەکانی خۆپیشاندەرانی گۆڕەپانی تیانیانمین بەرەو خراپتر دەرۆیشت.

هەر چەندە بە رووکەش لەناو بردنی خۆپیشاندانەکان مەترسییەکی بەردەوامی دروستکرد لە سەرکوتکردنی کۆمەڵگاو لەناو بردنی دەنگی نارەزایی، بەڵام وانگ هوی دەڵێت: لەو کاتەی خەڵك لە خۆشی تیانیانمین سەدای دەنگدانەوەی لەت و پەت بوونی کۆمەڵایەتیان لەبیر چۆتەوە... ئەوا هەر لە هەمان کاتیشدا هەست بەوە ناکەن یانیش چاکتر وایە بڵێین نایەتەوە یادیان کە ئەوەی ئەمڕۆ پێدەڵێن لیبراڵی تازە تەنها خۆشاردنەوەیە لە پەنا کاریگەریەکانی خۆپیشاندانەکانی تیانیانمین، ئەویش بۆ ئەوەی دەوڵەت خۆ بپارێزێت و دڵنیا بێت لە روونەدانی نارەزاییەکی کۆمەڵایەتی لەم چەشنە. مەبەستی وانگ هوی ئەوەیە کە بیرۆکراتە لەسەر خۆکانی پارتی کۆمونیست دەمامکی خۆیانداوە بۆ جێ بەجێ کردنی چڕترین و بە توندترین پرۆسەی بە بازاڕکردن (Marketization) و بە تایبەت کردن

(Privatization) کە یەکەم جارە شتی وەها لە جیهـان روودەدات. ناویـان لـە شۆڕشی بازاڕی ئازاد ناوە (سۆشـیالیزم بـە خاسـیەتی چینی) دەسـەڵاتداران وتـە و تێکـستی مارکس و ماو بە جۆرێکی جیاواز بەکار بهێنن تا بتوانن تێکهەڵکێشی بیرو باوەڕەکانی میلتـۆن فریـدمان (Milton Friedman) و فریـدریك هایـك ( Fried Hayek) پان بکەن. وانگ هوی پێیوایە کە ئەو تانکانەی کە خـەونی بیرمەنـدەکانی ساڵانی ۱۹۸۰ بۆ ئایینددیەکی گەش پانکردەوە و لەناوی برد ئەو کارەیان لە جیـاتی ماویزمەکان ئەنجامنەدا بەڵکو بە ئاینددیی توندڕەوەکانی بـازاڕ هیـواو ئـاواتی ئـەم نوخبەیەیان لەناو برد. بـەم کـارەش ناڕەزاییـان کپکـردەوە و دووبـارە ئایـدۆلۆژیای ماویزمیان دووپاتکردەوە،جارێکی تریش فاشستەکان دەسەڵاتی خۆیان دووپـاتکردەوە کرێکارانیان بێ دەنگ کرد کە داخوازی یـانیش مەترسـیان هـەبوو لـە ناعەدالـەتی. ئەمەش بینینی (زانگ هوی)یە بۆ چیرۆکی زێیراکان. وانگ هوی پێیوایـە کـە پـازدە سـاڵی رابردوو وەك هورێنـە وابـوو: ئەوانـەی وایانـدەزانی کـە پرۆسـەی پێشـکەوتنی دیموکراسی لە (چین)دا خێراتر بووە بۆیان دەرکەوت کە گەڕاونەتەوە بۆ سەردەمێك کـە وایانـدەزانی دەمێکـە کۆتـایی هاتووە،هـەمان زەمانـە کۆنەکـە، شـێوازی کـۆن، کارەکتەری کۆن، بانگەوازی کۆن، دەموچاوی کۆنی مە دەبولیە ماوەیەکی زۆر زووتـر خانەنشین بووبان دووبارە جارێکی تر شانووکەیان داگیر کـردەوە. ئـەم شـێوازە کۆنـە کاریگەری هوڕ بوونی دروستکرد بە جۆرێك کە کەس هەستی بـەوە نـەکرد وەزیفـەی سەرکوتکردنی ناڕەزایی دووبارە پەیوەنـدی نێـوان ئـەو میکانزمانـەی بـازاڕ کـە لـە بنەڕەتدا دەستی بە رووخان و داڕمان کردبوو درووستبکاتەوە.

بە رووکەش وا دەردەکەوت کە پاسەوانە کۆنەکان سوور بوون لەسەر پیادە کـردن و بەردەوام بوون لە ڕێگای کۆمۆنیستی، بـەڵام لـە راسـتیدا هێـزو ئـەوژمی بـازاڕ بـە خێراییەکی چاوەڕوان نەکراو بەرەوپێش دەچـوو. ئەمـەش بـارو دۆخێکـی زۆر سـەیرو سـەمەرەی دروستکردبوو کە ئابووری ناسی راستەڕۆی وەك زهانگ وینـگ، کـە داوای توانەوەی دەوڵەت و نەمانی دەسەڵاتەکانی دەکرد گەورەترین سوود مەنـد نـەبوون لـە

دەسەڵاتانی تاك حیزبی. كۆمونیستەكان زۆر دڵسۆزانە بیر و باوەڕ و بیرۆكە چاكسازییەكانیان جێ بەجێ دەكرد، لە هەمان كاتیشدا ڕەخنەگرە چەپخوازەكانیان بێ دەنگ دەكرد.

زهانگ وینگ دەست بە جێ دڵنیا نەبوو لە دەرئەنجامی گۆڕانكاری و چاكسازییەكان هەر بۆیە بەچینی بە جێ هێشت و بەرەو زانكۆی ئۆكسفۆرد كەوتە ڕێ بۆ خوێندنی دكتۆرا phD لە ژێر سەرپەرشتی هەڵگری خەلاَتی نۆبل پرۆفیسۆر جەیمس میر لیس (James Mirlees).

لە ساڵی ١٩٩٤ گەڕایەوە بۆ چین، بەمەش گەورەترین مەترسی بۆ سەر چاكسازی دووبارە دەست بە كاربۆوە. ئەو كاتەش ئەندازەی كەرتی تایبەت یانیش كەرتی ناحكومی (Non States Sector)زۆر زۆر زیادیكردبوو. لە لایەكی تریش چین توانیبووی بەسەر ئاسەوارە سەلبییەكان بەسەر هاتی تیانیانمێن لەسەر ئاستی جیهاندا زهانگ وینگ دەستبە جێ كەوتە چالاكی جۆراوجۆر، كاتی خۆی دابەشكرد لە نێوان كارو كاسبی (Business) و كاری ئەكادیمی و جیهانی سیاسەت. جگە لەوەی كە چەندین كاری حكومی جۆراوجۆری لە شوێنی جیاجیا پێ سپێدرابوو هەروەها كرا بە بەڕێوەبەری ئوتابخانەی گوانگ هوە بۆ بەڕێوە بردنی ( Guanghua Schoolf Management) سەر بە زانكۆی بەیكین. خزمەتگوزاری ڕاوێژكاری بۆ دەرزەنێك لە كۆمپانیا چینییەكان پێشكەشدەكات. لە ساڵی ١٩٩٥ وە زۆرترین چاوپێكەوتنی لەگەڵ ئەنجامدراوە لە لایەن گۆڤار و ڕۆژنامە ئابوورییەكان.

وانگ هوی و چاكسازخوازەكانی باڵی چەپ بە ناخۆشترین بارو دۆخدا تێپەڕین لە ساڵی ١٩٩٠، سڕ بوو بوون لە ژێر كاریگەری ئەو وەحشیەتەی دژ بە خۆپیشاندەران ئەنجامدرا. لە لایەكی تریش تووشی سەر لێشێوان هاتبوون لەو یەكگرتنە و دۆستایەتییەی نێوان پارتی كۆمونیست و توخبە سەرمایەدارە تازەكاندا. زۆریش دڵتەنگ بوون بە زیاد بوونی ژمارەی ئەو دەزگایانەی كە بڕوایان وابوو كە مێژوو بەرەو كۆتاییەكی حەتمی دەچێت، خۆی و هاوڕێكانی خۆیان شاردووە و پشتیان بە سێ جۆر

چەك بەست کە جیمس جۆیس بانگەشەی بۆ دەکرد بۆ خۆپاراستن دژ بە مەترسی لەناو چوون: (بێدەنگی، تاراوگە، ژیری).

### بووژانەوەی چەپی تازە لە چین:

(وانگ هوی) لە قاوەخانەی بیرمەندان بینی شوێنێکی گەورە و رووناك، دانیشتن لەسەر قەنەفەکان زۆر خۆشە، قاوەیەکی تازەو بە تام، ئەم قاوەخانەیە کەوتۆتە سەر گەورەترین دوکانی کتێب فرۆشی بەیجین. تەنها بەرد هاوێژێك دوورە لە سێ لە گرنگترین وبە ناوبانگترین زانکۆ: تسینگ هوەTsinghua بیدە Beida و رێنمن Renmin. بە راستی جێگای گفتوگۆ و دەمەتەقێی هزری و بیرمەندییە. وانگ هوی ئێستا بەسەر بێ ئومێدییەکەی زالبووە. ئەو جل و بەرگەی کە لە بەری کردوون رووخسارو شێوەی بیرمەندی پێ بەخشیبوو، پیاوێکی لاواز و قژێکی زۆر، چاکەتێکی قاوەیی و فانیلەیەکی رەش نیو قۆڵی لەبەر کرد بوو. حەز دەکات لە گفتوگۆ کردن لەسەر پوختەی بیرو باوەڕە گشتییەکان وەك بووژانەوەی رۆشنبیری Enligtenment، غائیيیەت Teleology وە مانای تازە خوازی Modernity.

دواترین مۆدیلی گفتوگۆ تیۆرییەکان هەروەك کەشخەیی جان پۆل سارتەر و جلە جوانەکانی زۆر چاك جێگایان دەبێتەوە لە لای چەپی کەنار رووباری پاریس ( The Left Bankof paris)

بەڵام وانگ هوی هێشتا هەر تووڕەیە سەبارەت بە بارو دۆخی چین. ئەو توانیویەتی خۆی بپارێزێت لە خەتی گشتی بازرگانی بیرمەندان، لەبەر ئەوەی ئەبووە ئەندام لە حیزب هیچ پلە و پایەیەکی رەسمی نییە (بە پێچەوانەی زهانگ وینگ ئەو نە سەرۆکی زانکۆیە و نە هی هیچ دەزگایەکیش). بۆ ماوەی ١٠ ساڵ پۆستێکی کاریگەری هەبوو، سەر نووسەری گۆڤاری هزری Dushu دووشو لە چین بەلام دوابەدوای کۆنگرەی ١٧ ی پارتی کۆمونیست لە ٢٠٠٧ لادرا.هەر چەندە پرۆفیسۆرە لە زانکۆی تسنگ هوە بەلام پەیوەندییەکی ناخۆشی هەیە لەگەڵ دەسەڵات. بە

راپۆرتەکانی گەندەڵی ئاشکرا دەکات و یارمەتی کرێکاران دەدات بۆ خۆ ڕێکخستن دژ بە تایبەتیکردنی نایاسایی، زۆربەی جاریشی دەزگاکانی ڕاگەیاندن بەکار دەهێنێت بۆ ڕیسوا کردنی هەڵەکانی حکومەت.

وانگ هوی یەکێکە لە سەرکردەکانی چەپی تازە کە لە چەند گروپێکی بەیەکەوە نەبەستراوی بیرمەندان پێکهاتوون و زۆر بە چاکی دەتوانن سەرنجی رای گشتی بەلای خۆیان ڕاکێشن، هەر خۆیشیان خاڵە گشتییەکانی گفتوگۆ سیاسییەکان دەستنیشان دەکەن. ئەوانە تازەن لەبەر ئەوەی بە پێچەوانەی چەپی کۆن پشتگیری لە چاکسازی بازاڕ دەکەن. ئەوانە چەپی تازەن لەبەر ئەوەی بە پێچەوانەی ڕاستی تازە خەمخۆری یەکسانی و ناعەدالەتین. زۆربەیان پەنایان بردە بەر تاراوگە لە ئەمریکا لە ساڵانی ١٩٩٠، بەڵام ئەمڕۆ هاتوونەتەوە بۆ بەشداریکردن لە گفتوگۆ لەسەر ئایندەی چین.

وانگ هوی لە چاوپێکەوتنێکدا دەڵێت: چین کەوتۆتە نێوان بەرداشی دوو توندڕەوی، سۆسیالیزمێکی بە هەڵە پیادەکراو و سەرمایەداری دۆست ئەمەش بۆتە هۆی پیادە کردنی خراپترین خەسڵەتی هەردوو سیستەم، من بەش بە حاڵی خۆم لەگەڵ ئەوەم کە چاکسازی بازاڕ دەبێت بەردەوام بێت و بەرەو پێش بچێت. بەڵام دەبێت پێشکەوتن و گەشەسەندنی چین یەکسانتر بێت و باشتریش بەڵاو بکرێت.نابێت گەشەسەندنی GDP لەسەر حیسابی مافی کرێکاران و ژینگە بێت.

فەلسەفەی ئەوانە بەرهەمی سەروەت و سامان و سەرکەوتنی ئابووری چینن. ئێستاکە بازاڕ هاندەرە و یارمەتیدەری گەشەسەندنی ئابوورییە ئەوان دەپرسن چ لەو سامانە زۆرە بکەین؟

ئایا بەردەوام بین لە کۆکردنەوەیان بە دەست نوخبە بەختەوەرەکەی چین؟

یانیش ڕێگایەکی تر بگرینەبەر لە پێشکەوتن و گەشەسەندن کە سوود بە هەموو هاوڵاتیانی چین بگەیەنێت؟ دوای سی ساڵ لە پرۆسەی چاکسازی چین ڕووبەڕووی فەلسەفەی گەشەسەندن دەبنەوە و دەپرسن ئایا گەشەسەندن تاکە ئامانجی ئێمەیە. لە جیاتی ئەوەی زۆر بە توندی وەك چەرخی نۆزدە داوای ئازادی بێ قەید و شەرت بکەن

له سایەی سیستەمی سەرمایەداری، ئەوانە دەیانەوێت ڕێگایەکی تایبەت بەچین بدۆزنەوە بۆ دیموکراسی کۆمەڵایەتی، بۆ سەرکەوتن لە دۆزینەوەی ڕێگای چینی بیروباوەڕ و بیرۆکە لە هەموو لایەکی جیهان دەهێنن و لەگەڵ باروو دۆخی چین دەیانگونجێنن و تاقییاندەکەنەوە و پێیان وایە گەشەسەندنی چین دەبێت بە مەرجی چیی بێت. وانگ هوی دەڵێت: ئێمە ناتوانین پشت ببەستین بە تاقیکردنەوەی ئەڵمانیاکان، وڵاتانی باکووری ئەورووپا، چونکە وڵاتی ئێمە هێندە گەورەیەکە دەوڵەت لە توانایدا نییە خۆشگوزەرانی و گشت خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتییەکان دابینبکات. هەر بۆیەش ئێمە پێویستیمان بە داهێنانی دەزگایی هەیە (Institutional Iunovation). وانگ شاوز گوانگ ( Wang Shaoguang) کە ئابووری ناسێکی سیاسییە بە باس لە دابینکردنی خزمەتگوزاری تەندروستی دەکات بە نرخێکی هەرزان،سوی زهی یوان Cui Zhiyuan کە تیورستێکی سیاسییە (Apdlitical Theorist) باس لە سۆسیالیزمی سەرمایە دەکات لەگەڵ چاکسازی مافی مولکیەت بۆ ئەوەی کرێکاران مافی رادەربڕینیان هەبێت لەو کۆمپانیایانەی کە کاریان تێدا دەکەن. (هونانگانگ)ی ئابووری ناسیش Hu Angang باس لە گەشەسەندنی سەوز دەکات.

ئامانجیشیان بریتیبوو لە ڕووبەڕووبوونەوەی بیر و باوەڕی هاوردەی بیانی کە بۆ سەرمایەداری ڕووباری پول هێنرا بوون و بیانگۆڕن بە فەلسەفەیەکی خۆڕسکی ناوماڵ هەڵقوڵاو. زماناڵیان دەڵێت: ئێمە دەبێت ڕێگایەکی تر بدۆزینەوە و ئەمەش گرنگترین ئەرك و ئامانجی ئەم نەوەیە، هەر چەندە کێشەکان لە دەرئەنجامی گەشەسەندن زیاتر دەبن، ئەوەندەش زیاتر سەرکردەکان کوێیان لێرا دەگرن، ئەمڕۆ ئەوانە هەستدەکەن کە کاتی دەست بەکار بوونیان هات.

**سەرمایەداری رووباری زەرد:**

هینان (Henan)، واتە (باشووری رووبار)، کەوتۆتە لێوارەکانی رووباری زەرد. تێرە ناو جەرگەی وڵاتی چینە و دژە رۆحییەکەی (شینزهین) (Shenzhen). تێرە بە لانەی شارستانیەتی چینی ناسراوە، دێی نانجی Nanjie کە لەم هەرێمەدایە لە ساڵانی ۱۹۹۰ بوو بوو بە نموونە و پۆستەری چەپی تازە. سەرکردەکانی نانجی دوابەدوای وازهێنان لە کشتوکاڵی کۆمەڵگایەکی هەرەوەزییان لە گوندەکە دروستکرد بۆ خۆسازدان بۆ گۆڕینی جۆری کار و ژیان، گۆڕان بۆ پیشەسازی، دەسەڵاتداران ۲۶ کارگەیان تیایدا دروستکرد کە هەر لە نودلەوە (هەرشتەی چینی) هەتا نایلۆنی پێچانەوەیان دروستدەکرد. ژیان لە نانجی خۆش بوو هەروەك تاقیکردنەوەی رۆبەرت ئۆین Robert Owen کە دێیەکی دروستکرد لە سەردەمی پیشەسازی چەرخی ۱۹ بە ناوی لانارکی تازەNew Lanark لە بەریتانیا بە مەبەستێکی ئەخلاقی یانیش نایینی. کرێکارانی نانجی مووچەیان زیاترە هەر هەمووشیان کرێ خانوو نادەن، خزمەتگوزاری تەندروستی بەلاش، بەشە خۆراکی بەلاش لە گۆشت، هێلکەوە رۆژانەش شووشەیەك بیرە. خوێندنیشی هەر لە سەرەتاییەوە تا دواناوەندیش لە لایەن دەوڵەتەوە پشتیوانی لێدەکرێت. دەوڵەت یان دەسەڵاتداران بە چاکی خەمخۆری هاوڵاتیانیان بوون، نەك بە هاندەری ئایینی هەروەك لانارکی تازە، بەڵام بە گوێرەی فەلسەفەی ماویزم بۆ رەخنە لە یەکترو لە خۆگرتن بۆ ریسواکردنی هەڵەکان و هەڵسوکەوتی نەگونجاو. لە ساڵی ۱۹۹۶ سوی (زهایوان)ی (Sui Zhiyuan)ی تیۆرستی سیاسی سەر بە چەپی تازە کتێبێکی بڵاو کردەوە و تیایدا باس لە سەرکەوتنی تاقیکردنەوەی نانجی دەکات بەم کارەش ئەم گوندەی خستە ناو لاپەرەکانی مێژوو بە زیندوویی دەمێنێتەوە.

سوی زهایوان پێیوایە کە نانجی بووە بە ئەلتەرناتیڤێکی زیندوو. ئەوەش ئەوە دەسەلمێنێت کە دەکرێت بازاڕی، ئازاد بێت بۆ خۆشگوزەرانی کۆمەڵایەتی، ئەم سەرکەوتنانە نەك هەر تەنها لە هەرێمەکانی سەر کەنار، بەڵکو لە دێهاتەکانیش

سەرکەوتوو دەبێت ئەم تاقیکردنەوە سەرکەوتووە ئەوە نیشاندەدات کە چۆن حکومەت و دەوڵەت گەر بیانەوێت دەتوانن دەسەڵاتیان بەکاربهێنن بۆ دابینکردنی خزمەتگوزاری تەندروستی، خوێندن و فێرکردن، هەروەها پێش خستنی دڵنیامیزمی نابووری. بەڵام ئەمڕۆ ئاڵجی هەندێك لە باق و بریقی خۆی لەدەستداوە، چونکە زیاتر لە نموونەیەکی بە زۆر دروستکراو دەچێت لەوەی سروشتی بێت. بەڵام سوی زهایوان لە ساڵی ١٩٩٦ دا پێیوانەبووە کە ئاڵجی دەکرێت ببێت بە نموونەیەکی جیهانی. بەڵکو ئەو وای بۆ دەچوو کە ئەم نیشانەی ئەوەیە کە چۆن چین دەتوانێت خۆی رزگار بکات لە ژێر فشاری باری سەختی بازاری ئازاد بەبێ ئەوەی ناچار بێت رۆژانە و مانگانەی کەس کەمبکاتەوە. کرێکاران بپارێزێت لە لایەن کۆمەڵایەتی. ئەمەش ئەلتەرناتیڤێکی ترە بۆ سەرمایەداری کە لە دۆڵی رووباری پیرل پیادە کرا، کە من پێیدەڵێم (سەرمایەداری رووباری زەرد).

لەو کاتەی وانگ هوی بە ئەنقەست لە سەرخۆ قسە دەکات ئەوا گوێ گرتن لە سوی زهایوان زۆر زەحمەتە و ماندووت دەکات، کە دەکەوێتە قسە کردن چاوە بە بریقەکانی خەریکن لە ناوسەری دێتە دەرێ. ئەو مەسەلانەی کە باسیاندەکات نەفسبڕن و پڕن لە حەماس و هەستدەکەیت سەرخۆش بووە بە مەعریفەتی زانستی تا رادەی شێت بوون. کاتێك پرسیارە ئامادە کراوەکان دەخاتە روو بۆ بەهێز کردن و روونکردنەوەی خاڵەکانی ، را هەستدەکەیت کە کەوتوتە بازنەیەك لە گفتوگۆ نەزۆلییەکان، ئەویش لەو مامۆستایانە فێریان بووە کە بڕوای بە بیرو بۆ چوونەکانیان هەیە وەك: نیکۆلۆ میکیاڤیلی، جان جاك رۆسۆ، جۆنستیوارت، میل و جەیمس مییید (Mill and Jams Meede). سوی زهایوان یەکێکە لە گەشبین ترین ئەندامانی چەپی تازە کە تاقیکردنەوەی رێگای تازە بە کلیلی چارەسەر کردنی کێشەکانی چین دەزانێت، و دەڵێت: تاقیکردنەوەکانی رووسیا و وڵاتە تازە پێگەیشتووەکانی دنیا ئەوە دەردەخەن کە ئەم وڵاتانە ناتوانن پێشبکەون و گەشەسەندن بە خۆوە ببینن ئەجاتیان بێت و ئازاد بن لە کاریگەری وڵاتە پیشەسازییە گەورەکان تەنها بە سەپاندن و

لاسایی کردنەوەی دەزگا ئابووری و سیاسییەکان و دیموکراتەپێشکەوتووەکان. بەڵکو بۆ سەرکەوتن دەبێت دەزگا و دامەزراوەی تایبەت بە خۆیان دروستبکەن. بۆ چەپی تازەش کلیلی سەرمایەداری رووباری زەرد بریتییە لە (فەلسەفەی داهێنانی بەردەوام و نەزەلی) بۆ دروستکردن و دۆزینەوەی کۆمپانیای تازە و دەزگای کۆمەڵایەتی تازە کە تێکهەڵکێشی بێت لە پێشبڕکێ و کاری هەرەوەزی.

## لاوازترین دەوڵەتی لە جیهان:

ئابووری ئاسان لە ساڵی ١٩٨٠ و ١٩٩٠ دەیانگوت، دەوڵەتی کەورە خراپە و هی بچووک باشە. بەڵام تیمی چەپی تازەی وەك هونانگانگ، وانگ شاوز گوانگ کارێکی زۆریان کرد و ماندوو بوونێکی زۆریان چێشت تا توانیان ئەم بۆچوونە هەڵگێڕنەوە. بەڵام ئەو جووتە سەیرە دەگمەنە کە وەك لینین Lennon و ماکارتنی یان لێهات Mc Cartney (دوو ئەندامی باندێکی گۆرانی بێژی بەریتانی زۆر ناودار بوون لە جیهان لە ٦٠ و ٧٠ دا) کە لە زانکۆی یەل Yale سەریان هەڵدا بوون بە کاریگەرترین ئابووری ناسی چینی سەر بەچەپی تازە. لە راپۆرتێکی زۆر گرنگدا کە لە سەرەتای ساڵانی ١٩٩٠ نووسیبوویان دەڵێن:

دەوڵەتی چین جۆرێکی هەڵەی هەیە لە هێز، زیاتر سەرکوتکەرە لەوەی بەڕێوەبەر. توانای بۆ سەرکوتکردنی ئازادی هاوڵاتیانی بریتییە لەو بۆ هیچ. بەڵام توانای بۆ بەڕێوەبردنی وڵات بە شێوەیەکی باش دەوڵەتی چین بە لاوازترین دەوڵەتی جیهان دەژمێردرێت.

ئەوان نیشانیاندا کە داهاتی حکومەتی ناوەندی لە دابەزینێکی بەردەوام دایە بە کوێرەی پێوەری GDP سەرجەم داهاتی نەتەوەیی (Gross Domestic Product) کە لە ساڵی ١٩٧٨ ٣١/٢٪ بەڵام لە ساڵی ١٩٩٢ دابەزیسەوە بۆ ١٤/٧٪. لەو کاتەی بودجەی حکومەتی ناوەندی دادەبەزێت ئەوا لە هەمان کاتدا داهاتی حکومەتی هەرێمەکان لە زیاد بوون و گەشەسەندنێکی زۆر بەرز تا گەیشتە رادەی

پەیدا بوونی مـیری سـوور (Red Barons) کـە بـاجی جۆراوجۆریـان لـە هـەرێم و پارێزگاکانیـان دەسەپاند بۆ پەیدا کردنی سەروەت و سامان و دەسەلاتی زیاتر و تا کار گەیشتە پڕ بوونی قاسـە و گەنجینـەکانیان، لـە کۆتـایی سـالانی ١٩٨٠ ئەوانـە لـە حکومـەتی ناوەندی بە هێزتر بوون.

بە بڕوای چەپە تازەکان بەربەست زۆرن لـە بـەردەم چاکسـازییـەکانی چـین هەرلـە گەندەڵی و هەلاوسانی ئابووری، وەبەر هێنانی هەڵە، قەرزە بـێ سـوودەکان، ناسـتی نزمی خەرجی و سەرفکردنی ناوخۆ و زیاد بوونی ڕێژەی ناعەدالەتی کـە دەگەڕێتـەوە بۆ لاوازی و کەم دەسەلاتی حکومەتی ناوەندی لە جیاتی زۆر بە هێزی.

هونانگانگ وا دەخەملێنێت کە بەرتیلی نایاسایی، خۆ دزینەوە لە بـاج دان، دزی بە ئاشکراو بـاجی نابـەجێی هەرێمـەکان بەیەکـەوە ١٥٪ GDP سـەرجەم داهـاتی نەتەوەیی بە فیڕۆ دەبەن و دەفەوتێنن سالانە لـە چـین. هـەروەها ڕوونـی دەکاتـەوە و دەڵێت کە چۆن بەبێ لێپێچانەوەیەکی دیموکراتی (هەڵبژاردن) لە خوارەوە بـۆ سـەرەوە یانیشی ترسی لێپێچانەوەی لە سەرەوە بۆ خوارەوە، سەرکردەی هـەرێم و پارێزگاکـان بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان خستۆتە سەر بەرژەوەندی گشتی خەڵک، بەمـەش زۆربـەی داهاتەکان لە خۆیان و خێزانەکانیـان سەرفدەکەن مووچـەی زۆرو ئۆتۆمـۆبیلی چـاك و گران بەها، ساردکەرەوەی ناومال، بالەخانەی تازە و گران بەها. چارەسەر بە ڕای ئـەو لە بە هێزکردنی حکومەتی ناوەندییە بۆ کۆکردنەوەی باج بە شـێوەیەکی ناوەنـدی بـۆ قەدەغە کردنی باجە بێ ماناکانی هەرێمەکان، هەروەها بۆ دروستکردنی دەزگایـەکی ناوەندی بۆ نەهێشتنی گەندەڵی.

چەپی تازەش بلس لە شـتێکی هـاو شـێوە دەکـات و گفتوگـۆی لەسـەر دەکـەن سەبارەت بە (فیلەسپییە گران بـەهاکان) وەك دروسـتکردنی هـوتێلی نایـاب و گـران بەها، ئەو بالەخانانەی کە سەریان لە هەور دایە، شاری یاری زۆر نایاب و گـران ئـەو یاریگە گەورانەی کە حکومەتی هەرێمەکان خۆیان بە دروستکردنیانەوە گرتـووە ئـەم خەرجکردنە نابەجێ یانە بوونەتە هۆی هەڵئاوسانی ئـابووری ئـەم وەبـەر هێنانـە بـێ

معەنایانە بوونەتە هۆی تەوەی ئابووری وڵات لەبەریان بناڵێنێت. چونکە ئەوانە بە پارەی ئەو بانکانە دروستکراون و دەکرێن کە دینگ خیاو پینگ لە ژێر دەسەڵاتی حکومەتی ناوەندی ئازادی کردن.

بەهێزترین بیر و بۆچوونیان ئەوە کە دەڵێن دەوڵەتی بەهێز بە مانای ناوەندی بەهێزتر دەبێتە هۆی هاندانی خەرجییەکانی ناوماڵ کە ئێستا ٤٠٪ بەرامبەر بە GDP و ئەم ڕێژەیە کەمتر نییە لە نێو وڵاتە خاوەن ئابوورییە پێشکەوتووەکان. چەپی تازە دەڵێت نموونەی تاقیکردنەوەی ئابووری چین ناتوانێت بەم جۆرە بەردەوام بێت، چونکە ئاستێك هەیە بۆ ڕێژەی ئەو کاڵایانەی کە جیهان توانای کڕینیانی هەیە، بۆیە چین دەبێت دەستبکات بە بەکار هێنانی بەشێکی زۆری لە بەرهەمەکانی . لە داهاتووشدا چینییەکان دەبێت زیاتر خەرجبکەن و کەمتر پاشەکەوت کەن. چەپی تازە زۆر راستن کە دەڵێن خەرجکردن و بەکار هێنانی کەل و پەلی ناومال تەنها کاتێك دێتەدی لە چین کە خەڵك زیاتر هەستیان بە سەلامەتی و ئاسایشی ئابووری کرد. هەتا سیستەمێکی پاراستنی ئاسایشی کۆمەڵایەتی نەبێت کە هاوڵاتیانی بپارێزێت لە نەخۆشی و بێکاری و پیری و پەکەوتەیی ئەوا خەڵك هەر خەریکی پاشەکەوت کردن دەبن لە جیاتی سەرفکردن بۆ مسۆگەر کردنی ئەم پێداویستیانە. چەپی تازە دەڵێن تەنها لە ڕێگای دووبارە زیندوو کردنەوەی دەسەڵاتی حکومەتی ناوەندی ئاسایشی کۆمەڵایەتی زامن دەکرێت ئەو کاتەش خەڵك بروا بە باری سەقامگیری ئابووری وڵات دەکەن و دەستدەکەن بە خەرجکردن کە دەبێتە هۆی هێندەی دی بەهێز کردنی ئابووری وڵات. دەسەڵاتداران زۆر بە وردی گوێ لەم بۆچوونانە دەگرن و بایەخێکی تەواوی پێدەدەن. هەر لە ساڵی ١٩٩٤ و داهاتی باجەکانی حکومەتی ناوەندی لە زیاد بووندایە. لە لایەکی تریش ئەگەر هەر تەنها بۆ پروپاگەندەش بێت ئەوا هوجنتاوو (Hu Jintao) و وین جیاباو (Wen Jiabao) خۆیان تەرخانکردووە بۆ دووبارە دروستکردنەوەی دەوڵەتی خۆشگوزەرانی چین (Chinas Welfare State).

**پاراستنی مولکی گشتی:**

هەر لە سەردەمی پییر جۆزیف پراودۆن دا (Pierre Joseph Proadhon) بەناوبانگترین دروشمی چەپەکان بریتیبوو لە (مولکداری دزیە)، ( Preperty is Theft) کە بۆ یەکەم جار لە ١٨٤٠ لە لایەن پییر خۆیەوە بەکار هات. فەرزەوییەکانی فەرەنسا زۆر باسی مەرجی خەیاڵیان دەکرد بۆ چارەسەری گرفتە کۆمەڵایەتییەکان، ئەوا چینییەکانی ئەمڕۆش بە هەمان شێوە و ئەندازە ئەم کارە دەکەن، نموونەی ئینگلتەرا دەهێننەوە لە نێوانی سەدەی دوازدە و نۆزدەدا کە چۆن مولکدار و خاوەن زەویە تایبەتەکان زەوی وزلر و دارستانە گشتییەکانیان بە تاڵان برد، بەهەمان شێوەش وا خەریکە سیستەمی پاراستنی کۆمەڵایەتیش بە تاڵان دەبردرێت. ناعەدالەتیەکی کەم وێنەی لێدەکەوێتەوە.

ڕۆژنامە و وێبسایتەکان و حەفتانە چیرۆکی لەت و پەتکردن و بەتاڵان بردنی سەروەت و سامانی گشتی لە لایەن بەرپرسە بەرزەکانی حیزب بڵاو دەکەنەوە لە ژێر ناونیشانی بە تایبەت کردن و کرینەوەی کەرتی گشتی لە دەوڵەت (Privatization). ئەو زەویانەی کە ڕۆژێک لە ڕۆژان لە دەرەبەگەکان و دەوڵەمەندەکان سەندرایەوە بۆ ئەوەی بدرێت بە جوتیاران و هەژاران، ئەوا ئەمڕۆ دەوڵەت دەستیان بەسەر دادەگرێت بۆ ئەوەی بیاندات بە ئەوانەی دەیانکەن بە کارگە و باڵەخانە و پرۆژەی پیشەسازی. چەندین گوند بە تەواوی دەستیات بە سەرداگیران تا بدرێن بە دەلاڵ و مەزادچی تا پرۆژەی لەسەر دروستبکەن. کارگەکان بە نرخێکی زۆر کەم فرۆشران تەنها بۆ بەتاڵان بردنی مولکی گشتی. هەموو ئەوانە وایانکرد بەرپرسی گەندەل و بزنسانی ساختەچی بەشەو و ڕۆژێك ببن بە ملیۆنێر، لەهەمان کاتیشدا خاوەن زەوییەکان و ئەو کەسانەی لە کارگەکان کاریان دەکرد بە پارەیەکی زۆر کەم قەرەبوو بکرێنەوە.

(Management Buyout) سێ پیتی (MBO) بوو بە نیشانەی مولکی گشتی (لە ژێر ناوی بەڕێوەبردنی کرینەوە) بێ چاو و ڕووترین جۆری تاڵانکردنی

یەکێك لە پیاوە ئەکادیمیاکانی کە لەهونگ کۆنگ دەژیا بە ناوی لانگ خیاپینگ (Lang Xia ping) بوو بە کەسایەتییەکی ناسراوی نیشتمانی کاتێك لە لێکۆڵینەوەی تەلەفزیۆنیدا بۆ کەناڵێکی ناو خۆی شەنگەهای باسی هەندێك لەم زێدە رۆییانەی کرد. ئەم بەرنامەیە هێندە کاریگەر بوو کە دوای کرد بە بەڕێوەبەری یەکێك لە کۆمپانیاکان بە ناوی جیوچوجون (Gu chu hun) زۆر ئازایە و بە زمانێکی درێژەوە شکایەت لە کەناڵە تەلەفزیۆنییەکە بکات بۆ داکۆکی کردن لە شەرەف و سومعەی... بەڵام زۆری پێ نەچوو... کێشەکەی دۆڕاند و جیوچوجون بەندکرا. ئابووری ئەلس زهانگ ویینگ هاتە داکۆکی کردن لەم پیاوە بە هەنجەتی پاراستنی سومعەی کۆمپانیاکەمان و داوای کرد کە فرۆشتنی موڵکی گشتی دەبێت بەردەوام بێت بۆ پێشخستنی ئابووری وڵات. بە بڕوای ئەو تەنها سەرمایەدار جورئەت دەکات خۆ لە کاری مەترسی داری بازاڕی بدات هەر ئەوەش دەبێتە هۆی بەرەو پێش چوونی ئابووری چین. ئەم کارەش هەر چەندە زەرەر و زیان بە هەندێك چین و توێژی کۆمەڵ دەگەیەنێت... بەڵام ئەوە تاکە رێگایە. لەبەر ئەوە دەبێت دەوڵەت بەردەوام بێت لە فرۆشتنی کەرتی گشتی. ئەمەش سوودی بۆ هەموو لایەك دەبێت.

چەپی تازە دژ بەو رایەیە کە دەڵێت کۆمپانیاکانی دەوڵەت ناتوانن کێ بڕکێ لەگەڵ بازاڕ بکەن، چونکە ئەم جۆرە کۆمپانیایانەش دەتوانن وەك کۆمپانیاکانی کەرتی تایبەت بەڕێوەبەری چاك بدۆزنەوە لە بازاڕ و پارەی چاکیان بدەنێ، ئەگەر سەرکەوتن. سزاشیان بدەن کەر سەرنەکەوتن لە بەڕێوەبردنی کۆمپانیاکە. بە تایبەت کردنی کەرتی گشتی جێگای نیگەرانی چەپی تازەیە لەبەر لە دەستدانی بەها کۆمەڵایەتییەکان و هەڵوەشانەوەی کۆمەڵ. پرۆژە بازرگانییەکانی دەوڵەت چاك بن یان خراپ، بوون بە چەترێك کە کرێکاران لە سایەی حەسانەوە، یان وەك مەنجەڵێکی ناسینی برنج وایە بژێوی کاگەران مسۆگەر دەکات، لە مووچەی مانگانە و فێرکردن بە خۆرایی و خانەنشینی و خزمەتگوزاریەکانی خانوو و بەرەو تەندروستی تەنانەت وەرزشیش. بە تایبەتی کردن و کرینەوەی موڵکی دەوڵەت تەك تەنها ملیۆنەهای

بێکار کردووە، بەڵکو دایاڵێبوون لە گشت گرەنتییەکانی ژیان کە لە سەرەوە باسمانکردن و ژیانی ئەو هەموو خەڵکەی خستۆتە مەترسییەوە. رۆژگارێك هەموو خەڵکی چین خاوەن کارو پیشە بوون، ئەمڕۆ لە ٤٠-٦٠ ملیۆن کەس بێکارن، جگە لەوەی دەیان ملیۆن کرێکار لە ناو وڵات رەوەندی کارن (Mingnon) کە لە وڵاتی خۆیاندا لە غوربەت دەژین. هیچ ماڵێکیان نییە، چونکە بەڵگەنامەی نیشتەجێ بوونیان نییە. ئەمانەش وایانکردووە پەیدا کردنی کار ببێتە کارێکی زۆر سەخت لە دە ساڵی رابردوو نوخبە سیاسییەکانی چین بوون بە دەوڵەت سەبارەت بە دەرکردنی یاسایەك بۆ پاراستنی موڵکی تایبەت. وانگ هوی Wang Hui کە بە ناوی بەشێك لەو نوخبانەی چەپی تازە قسە دەکات دەڵێت: ئێمە هیچ شتێکمان نییە دژ بە پاراستنی موڵکی تایبەت، بەڵام ئایا پێویست ناکات یاسایەکمان هەبێت بۆ پاراستنی موڵکی گشتی؟

سوی زهایوان (Cui Zhiyuan) بیروڕایەکی توندتری هەیە کە دەڵێت دەبێت قازانجی پرۆژە بازرگانییەکانی دەوڵەتی چین دابەشبکرێت.

لەساڵی ٢٠٠٥ دا ١٦٩ کۆمپانیای گەورەی چین قازانجیان گەیشتە ٧٠٦ ملیار یەن (٧٥ ملیار دۆلار). بەڵام سەرەڕای ئەو قازانجە زۆرە کۆمپانیاکان ئەو قازانجە دابەش ناکەن بەسەر خاوەن سەهمە زۆرەکان (کە دەکاتە دەوڵەت)، بەڵام حکومەت خەریکە داوای دابەشکردنیان دەکات. سوی زهایوان دەیەوێت بەسەر خەڵك دابەشبکرێت نەك بەسەر دەوڵەت. ئەوە نموونەیشی سەرچاوە لە رابردووی سۆسیالیست چین هەڵدەگرێت.بە تایبەت لەئالاسکا هەر لە ساڵی ١٩٨٢ وە. چونکە لە ئالاسکا حکومەتی هەرێم هەندێك لە داهاتەکانی نەوتی تەرخان کرد بۆ سیستەمێکی تایبەت. کە بریتیبوو لە دروستکردنی سندوقێکی تایبەت بۆ پارمەتیدانی کە ساڵانە هەزاران دابەشدەکرێت بەسەر هاوڵاتیانی هەرێم وەك بیمەی کۆمەڵایەتی. سوی زهایوان داوا دەکات قازانجی کۆمپانیاکانی دەوڵەت وەك قازانجی نەوتی ئالاسکا بەسەر هاوڵاتیان دابەشبکرێت بۆ گەیاندنی سوود بە خەڵکی هەژار و کەم دەرامەتی

چین، نەك تەنها بۆ توخبە دەوڵەمەندەکان بێت، ئەمەیش وا دەکات خەڵك هەست بە بوونی ئاسایشی ئابووری بکەن و بە پارەی کەمیش کار بکەن، چونکە دەوڵەت ژیانیان مسۆگەر دەکات و لە لایەکی تریش دەبێتە هۆی خەرجکردنێکی زۆر و جووڵە و گورێکی زۆر بە بازاڕ دەبەخشێت هێندەی تریش متمانەی خەڵك بە ئابووری وڵات بەهێزتر دەکات.

## گەشەسەندنی پێلەسەوزەکە:

چەپی تازە لە چین هەر بە تەنها لە خەمی ئاسەوارە کاولکارییە کۆمەڵایەتییەکانی دەرئەنجامی گەشەسەندن نین لە وڵات، بەڵکو لە خەمی کارەساتی ژینگەیشدان. لە سەفەرەکانم بۆ چین، هەموو جار دەمزانی کە من وا لە ئاسمانی چیندام: چونکە هەواکەی هێندە پیسە ئەرز نابینرێت لە ئاسمانەوە. ئەم پیس بوونەش دەگەڕێتەوە بۆ پەرەسەندن و گەشەسەندنی خێرا کە بووە هۆی پیسبوونی هەوا ، ئاو و خاکی چین. گەشەسەندنەکانی کەنارەکانی رۆژهەڵات بوونەتە هۆی ئەوەی خاك و زەویەکانی ناوەوە بین بە وشکانییەکی بێ سوود. بە کورتی هەرێمە هەژارەکان بوون بە زبڵخانەی هەرێمە دەوڵەمەندەکان. دوو لەسەر سێی کارەبای چین بە خەڵوزی بەردین (پیس) بەرهەم دەهێنرێت. هەموو حەفتەیەکیش وێستگەیەکی لەم جۆرە دروستدەکرێت و دەکەوێتە گەڕ. کارگەکانیان بە بەردەوام گازی ژەهراوی بڵاو دەکەنەوە و پیسی فرێدەدەنە ناو رووبارەکان، گۆمەکان پڕ بوون لە پاشماوەی کیمیاوی، هەر هەموو ئەم پاشماوانەش دەچنەوە ناو رووبار و زێ و گۆمەکان. لە کشتوکاڵیشدا هەندێك جۆر پەیین بەکار دەهێنن کە لە سەرتاپای دنیا قەدەغە کراون.تا ئەمڕۆش نیوەی خاکی لە دەرئەنجامی بڕینەوەی دارو درخت بوو بە بیابان، کارەش بە خێرایی ۲٤٦۰ کیلۆمەتر لە ساڵێکدا بەردەوامە. ۳۰٪ بارانی ترش دەبارێت، ۷٥٪ گۆمەکان پیس بوون، زۆربەی رووبارەکانیش یان ژەهراوی بوون یانیش وشکیان کردووە. نزیکەی ۷۰۰ ملیۆن کەس ئاوی پیسبوو پاشەڕۆی مرۆڤ یان ئاژەل دەخۆنەوە. سەرجەمی کۆی

گشتی خاکە رووێنداوەکان زۆر کەمیان کردۆتەوە، یان لەبەر ئەوەی زەویەکانیان بە پاشماوەی کیمیاوی پیس بوون یانیش چونکە زەویە کشتوکاڵییەکان دەستیان بەسەر داگیراوە.

گەشەسەندنی ئابووری بەھەر نرخێك بوو بە دروشمی گشت بەرپرسە ناوخۆییەکان پاش ئەوەی دینگ خیاوپینگ رایگەیاند (گرنگ نییە پشیلەکە رەشە یان سپی، گرنگ ئەوەیە مشك بگرێت). بە واتایەکی تر پێشکەوتن و گەشەسەندنی ئابووری بەرلە ھەموو شتێك دێت، تەنانەت ئایدۆلۆژیاش. بەڵام بەلای چەپە تازەکان گرنگە رەنگە رەنگی ئەم پشیلەیە چۆن بێت. ھوتەنگانگ دەڵێت پێشکەوتنی بریتیبوو لە پێشکەوتنی سەرجەم داھاتی نەتەوەیی GDP پشیلەی رەش. ئەم بە چەند رێگایەکی تایبەت نرخی ئەو زەرەر و زیانە گەورانەی بەر ژینگە کەوتوون نیشاندەدات و ناوی ناوە پێشکەوتنی پشیلەی سەوز Green Cat

Development، کە تیایدا ھێرش دەکاتە سەر نموونەی سیاسەتی سالانی ۱۹۸۰ دەیانگوت (با یەکەم جار دەوڵەمەند بین، لەپاشانیش پاککردنەوە دەکەین). ھوتانگانگ پێیوایە پێکھاتەی ئابووری چین رێگا بدات بۆ ئەوەی بتوانێت خۆ لە نموونەی ئابووری رۆژئاوایی بپارێزێت کە لە بنەڕەتدا پشتی بەستووە بە سەرف یان رێژەی بەرزی خەرجکردن و رێژەی بەرزی پیسکردنی ژینگە، ئەویش لە رێگای سەپاندنی باج و ھاندان و دروستکردن و دابینکردنی وزە لە سەرچاوە تازە بووەکان ھەروەھا دابینکردنی کارو پیشەی سەوز لە رێگای دەرکردنی یاسای تایبەت.

ئەم بیرو باوەڕانە زیاتر بەرمیان سەند کاتێك لاوێکی پڕ جووڵەی چالاك و زمان رەوانیش فەرخەمیرێك بەناوی پان یوی (Pan Yue) کرا بە سەرۆکی دەزگای بەڕێوەبەرایەتی دەوڵەت بۆ پاراستنی ژینگە (SEPA). پان یوی زاوای لیو ھوە کینگ (Huaqing) کۆنە بەرپرسی PLA و ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی کۆمونیستی چینە. کاتێك SEPA یەکەم راپۆرتی سەبارەت ژینگەی چین بڵاو کردەوە لە ۲۰۰٦ لە ژێر ناونیشانی GDP ی سەوز، خەونەکانی ھوتەنگانگ یان

زیاتر نزیککردەوە لە راستی. لەم راپۆرتەدا هـاتووە کـە پیـسبوونی ژینگـە و نـاو و هەوای چین لەساڵی ۲۰۰٤ دا بوونەتەوە هۆی زیان لێکەوتنی چـین بـەبڕی ٦٤ ملیـار دۆلار، کە ئەمەش دەکات ٪۳,۰٥ GDP وڵات.

پێوەریشیان بـۆ GDP سـەوز بریتییـە لـە بـەهاو نرخـی بـەکار هێنـانی پێـنج سەرچـاوەی سروشـتی ، خـاك، کانزاکـان، دارسـتانەکان، نـاو و بەرهەمـەکانی (ماسی...هتد) لەگەڵ نرخی پیـسبوونی ژینگـەو ئـەو زیانانـەی بەسەر زینـدەوەرەکان کەوتوون. پان یوی پێیوایە کە ئەم ئامارە تەنها بەشێکی کەمن لە راستییەکی تـاڵتر. بەڵام ئەم جۆرەجۆڵانەی پان یوی گرنگیـان پێنـەدران و پـشتگوێ خـران، چـونکە ئـەو نووسینگە بچووکەی ئەو بەراورد لەگەڵ کۆمپانیـا زل و زەبەلاحەکان هیچ دەسەڵاتێکی ئەوتۆیی نییە. لە لایەکی تریش دەسەڵاتدران تەنها گرنگی دەدەن بـە گەشەسـەندنی ئابووری بەهەر نرخێك تەنانەت لەسەر حیسابی ژینگەش. بەڵام پان یـوی هەوڵیـدا بـۆ ئاقیکردنـەوەی بـەختی سیاسی بـە پـشت بەسـتن بـە کۆمـەڵگای مـەدەنی تـازە پێگەیشتوو، داوایـدەکرد کـە بـەر لـە ئەنجامـدانی هـەر پرۆژەیـەکی گـەورە دەبێـت هاوڵاتیان مافی ئەمەیان هەبێت بە شێوەیەکی گشتی و ئاشکرا رای خۆیـانی لەسـەر بدەن بە تایبەت بابەتی پەیوەندیدار بە لایەنی ژینگە. لەو کاتەی زۆربەی هـەرە زۆری بەرپرسەکان خۆیان لە میدیا و رێکخراوە مرۆیی ناحکومییەکان دەپارێزن وەك ئـەوەی خۆیان لە ئەخۆشی تاعون بپارێزن، ئەوا پان یوی هیچ کـات دوور نییـە لـە میـدیا و هەمیشە تیشکی لەسەرە. خۆی و قات و کراسە رەشەکەی بەبێ بۆینباخ لەبەر دەکات و هەمیشە میدیای بیانی و ناوخۆ بەکار دەهێنێت لەگەڵ NGO کان وەك گرین پیس (Green Peace) و دەزگای پاراستنی ژیانی کێـوی (World Wild life Fund) بۆ فشار خستنە سەر ئەو کۆمپانیایانەی ژینگە پیس دەکەن. پـان یـوی دەڵێـت چـین خەریکی خۆکوشتنە لە رێگای ژینگە، لە چاوپێکەوتنێك لەگەڵ گۆڤاری دێر شـپیگل Der Spiegel ی ئەڵمانی دەڵێت و پێشبینی ئەوە دەکات کـە مـوعجیزەی ئـابووری چین بەم زووانە کۆتایی دێت چونکە ژینگە چیتر بەرگە ناگرێت.

ڕاپۆرتە ڕەنگاو ڕەنگەکانی پان یوی ئەوە نیشاندەدەن کە سەرکردەکانی چین بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دەکەونە ژێر کاریگەری پیسبوونی ژینگە، کە ئەمەش جێگای نیگەرانییە. چونکە ئەوان لە خەمی باری قورسی ئابووری دان کە دەبێتە ڕێگر لە بەردەم پێشکەوتنی ئابووری. هەروەها نرخ و بەهای تێکدانی تەندروستی گشتی. جگە لە هەڕەشە لەسەر سومعەی نێو دەوڵەتی چین کە وەك دوژمنی ژینگە بناسرێت. لە هەمووشیان ترسناکتر بۆ ئەوان نا ئارامی کۆمەڵایەتی گوێرەی بەرپرسی بەرزی ژینگە زهور شینگخیان (Zhou Sgengxian) لە ساڵی ٢٠٠٥ دا ٥١/٠٠٠ خۆپێشاندان سەبارەت بە پیسبوونی ژینگە ئەنجامدراون، هەندێکیان دەیان هەزار کەس تێیدا بەشدار بوون. ئێستا بەیگین پلس لە پیسبوونی ژینگە دەکات و پلانی (گەوج) دانراوە بۆ چارەسەر کردن. بەڵام هەروەك وانگ شەو گوەنگ Wang Shaoguang و هونەکانگ (Hu Angang) باسدەکەن حکومەتی ناوەندی دەسەڵاتی زۆر کەمە. سەرەڕای ئەوەی هەندێ وەعد دراوە لە لایەن حکومەتی هەرێمەکان بۆ دروستکردنی شارێکی پاك و خاڵی لە کاربۆن ( Zero Carbon City) لە دونگتان (Dongtan) نزیك شەنگهای، بەڵام وێنە گشتییەکە هەر لێڵە.

کاتێك کە کار دەگاتە جێ بەجێ کردنی یاساکان بەرپرسی هەرێمەکان گرنگی زیاتر دەدەن بە گەشەسەندن لەسەر حسابی ژینگە. لەبەر گلەیی سەرکردە ناوخۆییەکان کەم بایەخ و پشتگوێ خراون. شارەزایانی ژینگە...

لە چەپی تازەدا، ڕەنگە لە شەڕی بیرو باوەڕەکانی بەیین سەرکەوتنیان وەدەستهێنابێت بەڵام لەسەر ئەرزی واقعیدا ئەوانەی بەدوای قازانجی مادددیدا دەگەڕێن شەڕە ڕاستەقینەکەیان بردۆتەوە.

### بادانەوە بەلای چەپدا:

یەکەم جار واهەستدەکەین کە زهانگ وینگ لە لوتکەی خۆشگوزەرانیدایە، چونکە ئەو بەشێك بوو لە سەرکەوتووترین تاقیکردنەوەی ئابووری سەدەی ڕابردوو،

مووچەیەکی زۆر چاك وەردەگرێت بۆ بەڕێوەبردنی کۆمپانیاکەی خۆی، پۆستێکی زۆر بەرزی هەیە لە باشترین و بە ناوبانگترین دامەزراوی ئەکادیمیای لە چین. سەرەڕای ئەو هەموو شوهرەت و دەوڵەمەندی و سەروەت و سامانە زۆرەی، لە دوا سەفەرمدا بۆ چین لە ۲۰۰٦ هەستم نەکرد کە خۆشحاڵ و بەختەوەر بێت.

لە بیست ساڵی رابردوودا چین بە قۆناغی گۆڕینی سیستەمیدا پێپەڕ بوو. Trans The System،Forming کە بە چینی پێیدەڵێن گایزهی (Gaizhi). کە تیایدا چەندین پرۆژەی وەبەرهێنان دووبارە داڕێژرانەوە، بەشی زۆریشیان فرۆشرانەوە بە کەرتی تایبەت. دەساڵ لەمەو بەر ۳۰۰ هەزار کۆمپانیاو پرۆژەی وەبەرهێنانی حکومی هەبوون، بەڵام ئەمڕۆ تەنها ۱۵۰ هەزاریان ماون؟ لە ئەنجامی ئەمەیش ٤۰٪ کارگەرانی ئەم پرۆژە و کۆمپانیانە لەسەر کار دەرکران کە ژمارەیان دەگاتە ٤٥ ملیۆن کرێکار . بە بڕوای زهانك وینگ ئەو پرۆسەیە هێشتا ماوەی تەواوی خۆی وەرنەگرتووە، گلەیی دەکات و دەڵێت: هێشتا پارتی کۆمۆنیست بڕیاری ئەوە دەدات کە کێ بەر پرسیارەتی و بەڕێوەبردنی ئەم پرۆژە و کۆمپانیایانە یان هەیە، حیزب بەڕێوەبەر دەستنیشان دەکات. ئەو بەرپرسە بیرۆکراتانەی ئەرکی دەستنیشانکردنەکانیان لە ئەستۆدایە هیچ هۆیەك و هاندەرێکی راستەقینەیان نییە بۆ دەستنیشانکردنی ئەو بەڕێوەبەر و بەڵێندەرانەی بە دوای وەبەر هێنانی قازانجدا دەگەڕێن چونکە ئەوانە جورئەت ناکەن و نایانەوێت خۆیان تووشی سەر ئێشە بکەن رێك بە پێچەوانەی سەرمایەداران. ئەمڕۆش زهانگ تووشی کێشەیەك بۆتەوە کە لە دروستکردن وداهێنانی خۆیەتی، سیستەمی جووت رێگای نرخ دانان کە بۆتە هۆی ئەوەی سیستەمە کۆنەکە بۆ ماوەیەکی زیاتر لە پێویست لە ژیان بەردەوام بێت. دوای ۳۰ ساڵ لە چاکسازی کەرتی پیشەسازی چین دەناڵێنێ بەدەست کۆنترۆڵی دەوڵەت ٦۰٪ سەرمایەداری چین بە دەستی دەوڵەتەوە ۸۰٪ سەرۆك و بەڕێوەبەری پرۆژە و کۆمپانیاکان لە لایەن حیزب دەستنیشاندەکرێن.

هەر چەندە چین بازاڕێکی راڕاو هەژاری سەهمی هەیە (Stock Market) بەڵام گۆڕینەرەکانی شەنگەهای و شینزهین بەیەکەوە هەشتەمن لە جیهاندا، هەر بە حاڵ

سێیەکی سەهمانە ڕێگای گۆڕینەوە و فرۆشتنیان پێدراوە. بەرزترین و بەناوبانگترین کۆمپانیــای وەك موبــایلی چــین یــان ســینۆپیك Sinopec لــە لایــەن دەوڵــەت کۆنترۆلکراون. تەنانەت کۆمپانیای تایبەتی وەك (Lenovo) کە لە بــازاڕی جیهــانی مامەڵە دەکات ئەوا لە ڕێگای تۆڕێکی تایبەت بەستراوە بــە دەوڵــەت. بــە گــوێرەی زهانگ وینگ وڵات پڕە لە پرۆژەی نیوەچڵ چاکسازی کــراوە هەســپی بۆیــەکراو لــە جیاتی زێبرا. ئەو پێیوایە کە دوای سی ساڵ لە گەشەسەندنی زۆر بــەهێز کــاتی ئــەوە هاتووە کە بڵێین چین دی زێبراکانە و واز بهێنن لەو چەند ئەسپەی ماون.

زانگ وینگ پێیوایە کە حکومەت ڕێگای پرۆسەی مەنتقی وەنکردووە، ئەمــەش وای کردووە کە حکومەت خۆی لە دەرەوەی چوارچێوەی ئــابووری بدۆزێتــەوە. گەشەســەندنی ئابووری وەك گرنگترین ئارمانجی حکومەت نەماوە. ئەو پرۆژە و کۆمپانیا حکومییانــەی کە لەسەر زەرەرو زیان دەژیشتن ژمارەیــان زۆر کەمبوونەتــەوە. ئەمــەش وادەکــات ئــەو فشارەی لەسەر پرۆسەی فرۆشتنەوەیان بە کەرتی تایبەت ئاسانتر بێت. ئــەمڕۆ ســەرکردە سیاسییەکانی بەیەکێن باس لە پێویستی ڕاگرتنــی هەڵاوســانی ئــابووری دەکــەن (تــضخم اقتــصادی،Ecanmic- Dverheating) بۆ ئەوەی دووبارە داهاتی وڵات بە شــێوەیەکی عادلانە دابەشبکرێت، لە جیاتی پەلە کردن لە پرۆسەی فرۆشتنی کەرتی گشتی بە کەرتی تایبەت. زهانگ وینگ و هەواڵەکانی لە ڕاستی تازەدا نیگەرانن لەوەی کە ســەرۆك هــو جینتاوە (Hu Jintao) و ســەرۆك وەزیــران وێــن جیاوباو کەوتوونەتــە ژێــر کاریگــەری ترسناکی (Populism) وەك پێوەرەکانی دووبارە دابەشکردنەوەی داهات گەشەســەندنی ئابووری خاو دەکاتەوە و هەموو ئەو دەسکەوتانەی لە سی ساڵی ڕابردوو هاتوونەتە کایەوە تووشی خاو بوونەوە و ڕاوەســتان دەکات.لە ئابوورییــەك کــە زۆربــەی دەوڵەمەنــدەکان بــە ڕێگای خوار و خێچ پارەکانیان پەیدا کردووە هەر کاتێك باس لــە چاکســازی و بــەرهەنگار بوونەوەی گەنــدەڵی دەکرێــت مەترسی ئــەوە دایــان دەگرێــت کــە حکومــەتی چــین وەك حکومەتی ڕووسیا و ســەرۆك ڤلادیمیر پۆتین بکەن دەسبەسەر داگرتنی پارەو پوڵ و ســامانی خاوەن بزنــسی ئولیگاریشییەکان بکات.

زهانگ وینگ نارەزوو و تەمەنتا دەکات بەو رۆژانەی کە دینگ خیاوپینگ و جیانگ زیمین و زهاو رۆنگجی دەسەلاتیان هەبوو هەمیشە پیشتگیری گفتوگۆیان دەکرد سەبارەت بە ناعەدالەتی، لە واقیعدا هەمان دروشمی (هەندێك سەرەتا دەوڵەمەند دەبن) دووبارە دەکردەوە دەیان گوت لە کاتی چاکسازیدا پێویستمان بە سەرکردەی دەروێشی هەیە (Missionarg).

ئەمرۆ زۆر جیاوازە لە سالانی هەشتاکان و نەوەدەکان.لەسەر ئاستی ناوەند و هەرێمەکان سەرکردەکان دەروێشی نین. زۆر نیگەرانن لە رای گشتی. رای گشتی جیهانی زهانگ وینگیان سەراوبن کردەوە. چاکسازەکان گفتوگۆی سالانی ١٩٨٠ یان بردەوە لەگەڵ پارێزگارەکان.

وا دەردەکەوێت هەڵوەشانەوەی بریاری چاکسازی نەستەمە. بەلام ئەمرۆ جۆرێکی دیکە لە گفتوگۆ لە ئارادایە، دەبێت چین چ جۆرە چاکسازیەك بکات؟ کە سوودمەند دەبێت تێدا؟ چۆن قازانجی گەشەسەندن دابەشبکرێت؟ وێبسایتەکان، رۆژنامەکان و کەناڵە تەلەفزیۆنەکان چیتر باس لە چۆنیەتی هەڵوەشانەوەی دەوڵەت ناکەن. بەڵکو گەورەترین پرسیار کە دەیخەنە روو بریتییە لە چۆن بازار پشت بکەن و بیکەن بە گیان لەبەرێکی ناومالی زهانگ وینگ هەستدەکات دەسەلات لە دەستدەدات. ئەو گلەیی ئەوە دەکات کە خۆی و هاورێکانی لە ژێر ئابلوقەدان. کەوتوونەتە ژێر هێرشی چەپ لە وێبسایتەکان و لە لایەن میدیا هەمیشە مەحکوم و ریسوا کراون. دەمەتەقێ و گفتوگۆ لەم کەش و هەوایە زۆر سەختە. لە هەشتاکان و نەوەدەکان دەمانتوانی باسی مەسەلەی گرنگ بکەین لە نێو ئابووری ئاساندا. بەلام ئەمرۆ خەڵکی ئاسایی دەتوانن خیتابچییەکانی بالی چەپ بەکار بهێنن بۆ هێرش کردنە سەر ئێمە. بروای متمانەی خەڵکیان بە ئێمە لاواز کردووە هەندێ بلێن ئەوانە دارو دەستەی ئەمریکاو سەرمایەدارانی جیهانن. ئێمە وا هەستدەکەین کەوا قوتابین و لەگەڵ لەشکردا دەجەنگین.

## میکیافیلی تازە و کۆمەڵگای هەماهەنگ (Harmonious):

ئەمڕۆ لەچین شەڕی بیرۆکە یان بیرو باوەڕ زۆر تێکهەڵکێش بووە لەگەڵ هەوڵ بۆ وەدەستهێنانی دەسەڵات. لە نێوان ئەو یەکێتییە روو کەشەی دەسەڵات بۆ پاراستنی حیزب بەربرسە بەرزەکانی حیزبی کۆمونیست هەمیشە داخ لە دڵن و لە ژێر کاریگەری دوو باندی سیاسی کە خۆیان لە ژێر ناونیشانی چەپی تازە و راستی تازە حەشارداوە...

(سوی زهایوان)ی سەر بە چەپی تازە بلێ لە سەرچاوەیەکی سەر سوڕ هێنەری گۆڕانی دینامیکیەتی سیاسی کە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەکانی ناوەڕاست لە ئەورووپادا دەکات: ژمارەیەکی زۆر لە چاودێرە رۆژئاواییەکان تووشی سەر ئێشەیەکی زۆر هاتوون چونکە لە چین ناگەن، چونکە سیاسەت لە لای ئەوان پەیوەندی نێوان حاکم و مەحکومە، نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی. سوی زهایوان دەڵێت ئەو پرسیارە قورسەی کە ئەورووپییەکانی سەدەکانی ناوەڕاست وڵامی زۆر ئاسان بووە بۆ نموونە لای نیکۆلۆ میکیافیلی:

لای میکیافیلی دەسەڵات دابەش نەکرابوو بەسەر دوو ئاستدا دەوڵەت و خەڵک ، بەڵکو سیاسەت لە رۆما لە نێوان سێ گروپدا دابەشکرابوو: میر (یەك)، دەرەبەگ و دەوڵەمەند (کەم) و خەڵك (زۆر). ئەمڕۆش لە چین (یەك) بریتییە لە پارتی کۆمۆنیست (کەم) دەوڵەمەندە قەبەکان و (زۆریش) بریتین لە خەڵك. میکیافیلی نیشانمان دەدات کە چۆن (یەك- و کەم) دەتوانن فێڵ لە (زۆر) بکەن، هەروەها چۆن حاکم یان دەسەلاتدار هێزیەك بدۆزێتەوە شان بە شانی خەڵك دژ بە میر (دەرەبەگ و دەوڵەمەند).

سوی زهایوان پێیوایە سیاسەتی هەشتاکان لە چین بریتیبوو لە پەیوەندییەکی خۆشەویستی نێوان حیزب و دەوڵەمەندە قەبەکان بە تایبەت دوابەدوای رووخانی دروشمی بە ناوبانگی ماوتسی تۆنگ (خزمەتی خەڵك بکەن) لە جیاتی ئەمەش دروشمی دنگ خیاوپینگ بەرز کرایەوە (دەوڵەمەند بوون خۆشگوزەرانییە) سەرۆکی پێشووی حیزبیش لە شەنگەهای تۆزێکیش لەوە زیاتر رۆیشت و باسی لە (تیۆری سێ نوێنەر) ی دەرکرد، کە نامەی ئاراستەی دەوڵەمەندەکان دەکرد تیایدا داوەتیان دەکات تا بین بە ئەندام لە

پارتی کۆمۆنیست بە بەهانەی ئەوەی نوێنەری هێزی بەرهەمهێنەر لە تەک نوێنەرانی هێزی کۆمەڵایەتی کەلتووری بووتیان هەبێت. جیانگ زەمین کۆمەڵێک خەڵکی دەوڵەمەند خاوەن دەسەڵاتی سەربە هەرێمەکانی سەر کەنار لە خۆ کۆکردەوە بۆ ئەوەی دوابەدوای خانەنشین بوونیشی دەسەڵات لە دەست نەدات.

سەنتەری دەسەڵاتی جیانگ زەمین کەوتۆتە شاری شانگھای هەر بۆیەش خۆی و گروپەکەی بە (دەستەی شانگھای) ناسراون. ئەوەش وایکردووە کە ئەم گروپە ببن بە توندڕەوترین و چاوچنۆکترین سەر چۆپی کێشی تاقیکردنەوەی سەرمایەداری چینی.

دەستەی شانگھای یرو بۆچونیان زۆر کۆکە لەگەڵ (زهانگ وینگ)ی هاوڕێی نەکاد ییایان، ئەوانەش وەك زهانگ و گروپەکەی پشتیوانی خۆیان بۆ گەشەسەندنی ئابووری دوویات دەکەنەوە لەگەڵ دانی دەسەڵاتێکی زۆر بە هەرێمەکان لە لایەنی وەبەرهێنانی ئابووری. هەروەها والا کردنی دەستیان بۆ ئازاد کردنی بانگەکان و قەرزدان بە ئارەزووی خۆیان و وەبەرهێنان و دامەزراندنی پەیوەندییەکی پتەو لە نێوان حیزب و بزنس مانە تازەکان یانیشی دەوڵەمەندە تازەکان.

بەڵام لە ساڵی ۲۰۰۲ وە راستی تازە یەکێتی ریزەکانیان لە دەستدا و تووشی رووبەڕووبوونەوە هاتن لەگەڵ سەرۆك هوجینتاو، دوای ئەوەی سەرۆك بنکەیەکی تری هێزی دروستکرد کە پێکهاتبوون لە لاوانی کۆمۆنیستی چین (CCYL) کە زۆربەیان لە هەرێمە هەژارەکانی وڵاتەوە هاتوون، بە زمانی چینی پێیان دەڵێن توانپای ( Tuan Pai) زۆربەی هەرە زۆریشیان لە چەپی تازە نزیکن و سروودەکانیان دەڵێنەوە، داوای گەشەسەندنێکی لەسەرخۆ و سۆگەر دەکەن، لە تەك یەکسانی کۆمەڵایەتی و پێسبوونی ژینگەش بەلایانەوە زۆر گرنگە. لە لایەکی تریش داخوازی زیادکردنی یارمەتی دەوڵەتن بۆ فێر بوون، خزمەتگوزاری تەندروستی و بیمەی کۆمەڵایەتی و ئاسایشی ئابووری و کۆمەڵایەتی دەکەن. هەر دوو دروشمی (هەماهەنگی کۆمەڵایەتی و پێشکەوتن و گەشەسەندنی زانستی) هوجینتاو رەنگدانەوە و کاریگەری هەندێك سیاسەتن بە ئومێدی گێڕانەوەی بەڵانس لە نێوان ئەو خۆشگوزەرانییەی لە دەرئەنجامی

بـازاڕی ئـازادەوە دروسـتبوو و لەگـەڵ ئـەو ئاسـەوارە فەرامۆشـکراوەی رابـردووی سۆسیالیستی وڵاتە.

لە جیاتی هاندان وڕێگا خۆشکردن بۆ پرۆژەی گەورەتر و رەخساندنی بوار بۆ بزنسی گەورەتر سـەرۆك هوجینتـاو لەگـەڵ سـەرۆك وەزیـران ویـن جیابـا (Wen Jiabao) هەڵگەڕانەوە و روویان کردە کرێکار و جوتیارو پێبەشکراوان بـۆ ئـەوەی لەگـەڵ " زۆر" سەنگەر بگرن دژ بە" کەم" ئەویش لە رێگای بەکار هێنـانی میـدیا، وەك نووسـتن لـە ماڵی جوتیاران، سکاڵا بەرز کردنەوە بە ناوی ئەو کرێکارانـەی مووچـەیان خـوراوە یـان وەرنەگرتووە، بەم جۆرەش خۆیان لە نوخبە سیاسـییە سـوودمەندەکانی سـەربە جیـانگ زەمین جیاکردەوە. ئەوەی جێی نیگـەرانی راسـتی تازەیـە دوور کەوتنـەوەی "چـین" لـە پەرەپێدان و گەشەسەندن وەك ئامانجی سەرەکی. لە یەکێك لـە کۆبوونـەوە گەرمـەکانی مەکتەبی سیاسی حیزب لە تەموزی ٢٠٠٤ سەرۆکی پێشووی حیزب لە شەنگەهای بـە پەنجە هەڕەشەی لە وین جیاباو کـرد ئـەوەك سیاسـەتێك بگرێتەبـەر بـۆ خاوکردنـەوەی گەشەسەندن لە هەرێمەکانی کەناری رۆژهەڵات_ بە بەهانـەی دوویـارە دابەشـکردنەوەی پارە بەسەر هەرێمەکانی ناوەوەی رۆژئاوا_ چونکە ئەم کارە دەبێتە مایەی نـا ئـارامی و تێکچوونی بارو دۆخ.

چین لیانگیو" Chen Liangyu" کە یەکێکە لەوانەی گشبینە بە بازاڕی ئـازاد لە راستی تازەدا بیرو باوەڕێکی (عقیدە) دامەزرانـد کـە دەڵێـت خـۆر یەکـەم جـار لـە رۆژهەڵات هەڵدێت، ئاکرێت لە هەمان کات لە رۆژئاواو رۆژهەڵات هەڵبێت. پار سـەنگ راگرتنی گەشەسەندن ئەوە ناگەیەنێت دەوڵەمەندەکان ئـالان بکـرێن بۆئـەوەی پارمـەتی هەژاران بدرێت بۆئەوەی هەر دوولا دەوڵەمەند بن، بەلام ئەم کـارە هـەردوولا وەك یـەك هەژار دەکـات... حیزبەکـەمان لـە ئـارەزاییەکی مێژووییـەوە ئـەوە دووپاتدەکاتـەوە دروستکردنی ئابووری بەهێز و بازاڕی ئازاد ئاکۆکە لەگەڵ یەکـسانی تـەنها رێگـەوە لـە بەردەم گەشەسەندن. سیـستەمی سیاسی چین لەو جۆرە نییـە کـە بـڕاوە هـەموو شـتێك دەبات. هەردوو باڵی ئاکۆك پێویستیان بە یەکە بۆ ئاسانتنی ئـەویتر. و لـە کۆتایـشیدا

هێز دابەشدەکرێت لە نێوانیاندا. هوجینتاو دیار بوو کە کۆنترۆلێکی دەسەلاتێکی زۆری هەبوو لە ساڵی ٢٠٠٦ چین لیانگێوی دەرکرد لەسەر گەندەڵی، بەلام هەلبژاردنەکانی بیرووی سیاسی لەساڵی ٢٠٠٧ ولە کۆنگرەی پێنج ساڵەی حیزب لە مانگی دەی ٢٠٠٧ هەردوو باڵ وەك یەك دەنگیان هێنا بەمەش هوجینتاو نەیتوانی لی کیکیانگ لە جێگای خۆی دەستنیشانبکات.

لە لایەنی سیاسییەوە پارسەنگی هێز بەلای چەپی تازەیە، لە کۆتایی ٢٠٠٤ هوجینتاوHu Jintao و لەگەڵ وین جیاباو پلانی پانزدەمینی پێنج ساڵە یان بلاو کردەوە بۆ" کۆمەلگایەکی هەماهەنگ". ئەم راپۆرتە پشتی بەستبوو بە راپۆرتی دەیان تیمی حیزبی کە ناردراون بۆ ئەوروپا و ئەمریکا و ئەمریکای لاتین و رۆژهەلاتی ئاسیا و ئەفریقیا کە ئەمەش بوو بە وەرچەرخانێکی گرنگ بۆ گەیشتن لە بیرکردنەوەی داهاتووی ئابووری ولات. بۆ یەکەمین جار هەر لەساڵی ١٩٧٨ وەکو چاکسازی ئابووری دەستیپێکرد، گەشەسەندنی ئابووری بە گرنگترین ئامانج وەسف نەکرا. بەلام لە جێگای ئەم ئامانجێکی تریان دەستنیشانکردەوە خەلك بەر لە هەموو شتێك Putting Reople First. (Yirqmn weibek لە هەمان کاتیش رێز لە سروشت وژینگە بگرێت. بەلێنی ئەومیاندا کە غوونەی ولاتانی ئەسکەنتنافی پیادە بکەن بە رێژەی سالانەی ٢٠٪ بەرەو زیاد بوونیشی و زیاد کردنی پارمەتی خانەنشینەکان و بێکاران و بیمەی کۆمەلایەتی و دایکایەتی (منداڵ بوون)...

و پێشووی منداڵبوون، بۆ لادێش بەلێنی دامەزراندنی سۆسیالیزمی تازەی دێهاتەکانیاندا کە لە سایەی ئەم سیستەمەدا باجە زۆرە ملێیەکان لادەبەن و خزمەتگوزارییەکانی تەندروستی و فێربوون باشتر بکەن. بەلێنی کەمکردنەوەی بەکار هێنانی وزەی ئاساییاندا بەرێژەی ٢٠٪ بە پێوەری GDP. ئەمانە و جگە لە بەلێندان بۆ دامەزراندنی سیستەمێکی چاودێری کۆمەلایەتی و ژینگە لەژێر کاریگەری گەشەسەندنی ئابووری و ئاسەوارە خراپەکانی. چینییەکان راهاتوون لە گۆرینی سیاسەتی گشتی ولات، لە کۆنگرەی حیزبی ساڵی ٢٠٠٧ دا جارێکی تریش سیاسەتیان

گۆڕا.لەم کۆنگرەیەدا بیرو باوەڕو دروشمی گەشەسەندنی زانستی هوجینتاو کەوتە ناو دەستووری حیزب و بە مجۆرەش بوو بە خاڵێکی گرنگی تری بەرنامەی حیزب لەگەڵ بنەماکانی تری ڕێبازی فکری ماو.

دروشمی گەشەسەندنی زانستی یەکێکە لەو دروشمانەی چەپە تازەکان دایانهێناوە و کاری بۆ دەکەن و دوای هەوڵێکی زۆر توانیان بیگەیەننە ڕیزی دروشمەکانی ماوزیدۆنگ و جیانگ زەمین. بەڵام کاتێك جیانگ زەمین سەرۆك بوو هەستی بە گرنگی ئەم دروشمە نەکردبوو. هەر چەندە ئەولن هێشتا (١١) مین پلانی پێنج ساڵەیان تەواو نەکردبوو، بەڵام ئاشکرایە پلانی ئەمجارەیان دەبێتە قاڵبێك بۆ سەرمایەداری ڕووباری زەرد. هەر لە زهانگ وینگ و چاکسازخوازەکانی پێشی ئەویش بروایان بە تاقیکردنەوەی بەردەوامی بیرۆکە تازەکان بووە نەك ڕێگا چارەی کتوپڕ (Shock Therapy). ئەمەش دووپاتکردنەوەی ڕاستی بۆچوونەکەیان کە دەڵێن: بازاڕ خۆی دەبێتە هاندەری گەشەسەندنی ئابووری نەك دەوڵەت. چەپی تازەش زۆر نیگەرانن بە پیسبوونی ژینگە و نایەکسانی، هەر بۆیەش دۆزینەوەی دەزگایەك، ڕێگا چارەیەك کە تێکهەڵکێشی هاریکاری و هەرەوەزی بێت لە لایەك پێشبڕکێش بێت لە هەمان کاتدا داخوازییەکی زۆر پێویستە. داننان بەوەی دەوڵەت دەبێت ڕۆڵێکی خۆی بگێڕێت لە نێوان بەردەوام بوون لە گەشەسەندن و دابینکردنی خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتییەکان گەورەترین ڕووبەڕوو بوونەوە ناکۆکییە لەگەڵ فەلسەفەی جیهانی پانی سەرمایەداری لە (بنەمای دەستتێوەر نەدان، ئازادی جوجۆڵ و بازرگانی) (Laisser Faire). ی گەشەسەندنی سەرمایەداری. بەڵێنی ئەنجامدانی گەشەسەندنی ئابووری لە ژێر کۆنترۆڵی دەوڵەت تاقیکردنەوەی سەرمایەداری ڕووباری زەردی کردووە بە چرایەکی زۆر گەش لە نێو حکومەتە تازە پێگەیشتووەکانی دنیا. چین ڕەنگە بڕیاری نەدابێت، یانیش لە توانای دانەبێت زاڵبێت بەسەر کۆنترۆڵی ئابووری ئەنگلۆسەکسۆنی، بەڵام ئەگەر لە قۆناغی داهاتوو سەرکەوتوو بوون ئەوا بەبێ گومان تێڕوانینی جیهان بۆ گەشەسەندنی ئابووری سەرەوژێر دەکەنەوە.

## بەشی دووەم
## دیموکراسی بە رێگاکەیەوە (ئەمەریکا)

دیموکراسی رۆژئاوایی وەك ئەوە وایە بچێت بۆ چێشتخانە و تۆ سەرپشك بیت و هەڵبژێری چ وەستایەك، فەرەنسی، ئیتالی یان ئەڵمانی لە جیاتی تۆ بریار بدات و لیستێك لەو خواردنانە ئامادە بکات تا تۆش لێیان هەڵبژێریت کامیانت دەوێت. بەڵام لە دیموکراسی چینی تەنها یەك وەستا هەیە، پارتی کۆمۆنیست، بەڵام ئێمە لیستی داواکارییەکانمان بە بەردەوام روو لە زیاد بووندایە کە چ جۆرە خواردنێکیان بۆ ئامادە بکات.

فانگ نینگ، ئەکادیمیای چینی بۆ زانستە کۆمەڵایەتییەکان پینگچانگ (Pingchang) شارێکە لە ناو هەموو،پتر لە پێنج کاتژمێر دوورە لەچینگدو (Chengdu)ی پایتەختی سچیوانسی Sichuanese، بەرەو خوار لە شەقامی چیای میندیرنیگ Meandering، ٦٠٠ مەتر بەرزە لە ئاستی دەریای و کەوتۆتە زنجیرە چیاکانی دەبا (Daba). دێهاتەکانی دەوروبەریش لە جوانیدا کەم وێنەن، وەسفکردنیان ئاسان نییە، پڕن لە دارو درخت و سەوزایی و چیمەن و قامیش جگە لە بەروبوومی دانەوێڵە. شاخەکان هەموو تاشراون بۆ چاندنی گەنم و برنج، رێگا پێچاو پێچەکان هێندەی تر سەحراوی تری کردوون. بەڵام ئەو خانووانەی کە لە کۆنکریت دروستکراون لە گەڵ ئەو باڵەخانە چەند قاتییەی ناشرین و نابەجێ کە لە چیمەنتۆ دروستکراون وەك شەقە زلەیەکە بە ناگات دەهێنێتەوە، خانووەکانی زۆر کۆن و وێرانن بە هیچ جۆرێك لەگەڵ جوانی سروشتی ناوچەکە ناکوێن، هەندێك لە خانووەکانیان هەروەك ئەوانی کۆشکی دزنی نیوەیان لە شاخە.رەنگە میر چارلس بیگوتبایە وەك عەقیقە (بەردێکی بە نرخی سوور) بەڵام لە پێناو دوور کەوتنەوە لە یوتۆپیا خۆمم لێ لادا. سەرەرای ئەوەی خانووەکان زۆربەیان وەك کاولگە وابوون،

بەڵام نیشانەی تواناو ئارەزووی مرۆڤیان نیشانەدا بۆ سەپاندنی تواناو ویستی خۆی بەسەر سروشت.

تەنانەت لە خراپترین باریش ئەوە نیشانەی توانای مرۆڤی دەتوانــد ســەبارەت بــە سەپاندنی ویستی خۆی بەسەر سروشتدا.

زۆربەی دانیشتووانی پینگ چانگ (Ping chang) لە گوندەکان دەژیــن کــە بــە رێگایەکی قوڕاوی بە شارەکەوە بەستراون. لە یەکەم گوند کە سەردانم کرد "نەنچاوۆ" (Nun Chao) دێهاتییەکان هەروەك گاجووت ئاسا زەمبیلە دارەکانیان لەسەر ملــی خۆیان بەستابوو، لە ژێر دروشمی سووری گــەورە نوســراو کــە لــەو بــەر تــا ئەوبــەری شەقامەکەی کرتبوو تیادا نوسرابوو.

(سۆشیالزمی تازە بۆ دێهاتەکان). بەڵام نەنچاوۆ زۆر تــازە دیــار نــەبوو. خــانووە رزیو و کۆنەکانی تەنها خەڵکی پیرو نەخۆش و پەککەوتەیان تیادا دەژیا، کە تەنها لە پاشماوەی شەڕ دەچوو کە لە تەلەفزیۆنەکان بینیبووم. بەڵێ هیچ خۆناساندنێك ژنێکــی بە ساڵدا چوو لێم هاتە پێش و گوتی. گوندمان بووە بە کەلاوە هــەر لــەو رۆژەی لاوە بەهێزەکانمان جێیان هێشتووین بۆ گەڕان بە دوای کار. ئەوانەی لێرەش ماون بەرهەمی ساڵانەیان ٩٠٠ RMB (٦٥$) لەو کاتەی قسەمان دەکرد کۆمەڵێك خــەڵکی بێــزار لە حاڵ و ژیانی گوندەکە لە دەورمان کۆبوونەوە زۆر بە شەوقەوە قسەیان بۆ دەکردین، باسی کێشە و گیر و گرفتەکانیان دەکرد و سکاڵایان لە نرخی دکتۆر و نەخۆشــخانە و قوتابخانە و نەبوونی ژەمە خواردن بۆ منداڵەکان لە قوتابخانە.

ژیانی تەنهایی و لاچەپی دێیــەکــەیان. دوای ماوەیــەکی کــەم دەیــانی لــەم جــۆرە خەڵکــە مان لێ کۆبوونــەوە بــەدەنگی بــەرزتر داخوازییــەکانیان دەخــــستەڕوو. هــەر هەموویان داوایان لێکردم کە گازاندەیی نامە پڕ لە ئێش و ئازارەکەیان بــۆ بگەیەنــە بەیگین. بەڵام ئەوەی نەیان دەزانی ئەوە بوو کە برادەرەکانم لە بەیگین منیــان نــاردبوو بۆ لێکۆڵینەوە کردن سەبارەت کردنی پینگ چانگ بە نموونــە بــۆ هــەموو داهــاتووی چین.

**دیموکراسی له زیاد بووندایه:**

پینگ چانگ لەم رۆژانەدا بۆتە جێگای سەرنجی زۆر کەس، هەر بۆیەش سەردانی دەکەن. نەك بۆ جوانی سروشت و تەندازیاری خانووەکانی یان گەشەسەندنی ئابووری، بەڵکو سەردانەکە لەبەر ئەوەیە کە پینگ چانگ یەکەم هەرێمە لە چین کە ئەندامانی حیزب رێگەیان پێدرا بە شێوەیەکی راستەوخۆ و لە کەش و هەوایەکی ئازاد و لەسەر بنەمای کێ بەرکێ سکرتێری پارتیان بۆ شار هەڵبژارد. ئەم تاقیکردنەوەیە یەکجار پڕ بەهاو بایەخە چونکە تا ئەمرۆش هەڵبژاردن یان دەستنیشانکردنی هەر کەسێك پەیوەندیدارە بە پەیوەندییە تایبەتەکان و دڵسۆز بن بۆ ئەم و ئەو نەمەش لەسەر حیسابی ئەندامی ئاسایی. لە بارودۆخێکی ئاسایی هەر چین و توێژێك لە حکومەت، سەرکردەی توێژی لە خۆیان نزمتر دەستنیشاندەکەن. پارتی نیشتمانیش بەرپرسی هەرێمەکان بەرەو خوارەوە دەستنیشان دەکەن لە حیزب، ئەوانیش بەدەوری خۆیان بەرپرسی حیزبی پارێزگاکان دەستنیشاندەکەن، ئەوانیش بەرپرسی شارەکان دەستنیشاندەکەن و دەبن بە بەرپرس لە دەستنیشانکردنی بەرپرسی حیزبی گوندەکان. بەڵام پینگ چانگ هەرەشە لەم پرۆسێسە دەکات بەوەی سەراوژێریان بکاتەوە. ئەوە بەرزترین لوتکەی ئەو پێشکەوتنەیە کە پەرمەندچینییەکان ناوی دەبەن بە "دیموکراسی ناو حیزب"

لە ساڵی ٢٠٠٦ کە چووم بۆ لێکۆڵینەوە لەم مەسەلەیە، سکرتێری حیزبی پارێزگاکە لیوکیان خیانگ Liu Qian Xiang بە شانازییەوە روونیکردەوە کە هەڵبژاردن پینگ چانگی خستە سەر نەخشە، ئابووریمان زۆر پێشنەکەوتووە بەڵام تاقیکردنەوەی دیموکراسی زۆر پێشکەوتووە.

یەکەم جار ناوی پینگ چانگ م لە برادەرێکم بیست بۆ ناوەندی نووسین وەرگێران کار دەکات (Central Compilation and Translation Bureau). ئەم ناوە گەورەو بێ سوودە هی دەزگایەکی زۆر گرنگ بوو کەلە ساڵانی ١٩٣٠ دامەزراوە کە

بیرو باوەڕی سۆشیالزمی بە چین ناساند، کە چەندین کتێبی گرنگیان وەرگێڕاوە بۆسەر زمـــانی چـــینی. وەك (Das Kaital) ســـەرمایە و مانیفێـــستی کۆمونیـــستی (Communist Manifest) وە کتێبی لینین"Lenin" چ بکرێت لە چـین ( What is be Dow in toChinese) .

ئەم دەزگایە یەکێك بوو لە دەزگـا هـەرە گرنگـەکانی حیـزب تەنانـەت بـەر لـە دروستبوونی کۆماری گەل یان میللـەت. پـاش ئـەوەی قۆنـاخی چاکـسازی هـەر لـە ١٩٧٨ دەسـتپێکرد ئەم بیرۆکە یان دەزگایـە هـیچ رۆلێکـی نـەما. بـە پێـچەوانەی دەزگای لێکۆڵینەوەی (بیرمەنـدنان)ی تـازە کـە بارەگاکـەیان زۆر تـازەو بریقـەدارە، بارەگای بیرۆی نووسین و وەرگێڕان لە تەنیشت کۆگایەکی فرۆشتنی سـەوزە و میوەیـە کە تەنها دەوڵەمەندەکان دەتوانن بیانکرن و هەژاران لێیان بێ بەشن. بەڵام ئێستا ئەو بیرۆیە هۆیەکی دۆزیوەتەوە بۆ ئەوەی بـەردەوام بێـت. ئـەو خـانووە کۆنـەی تێیدایـە کردوویەتی بە خانوویەکی زۆر بەهێز و پڕ لە بیرۆکـەی تـازە " داهێنـانی حکومـەتی هەرێم و باشترین پاداشت".

جێگری بەڕێوەبەری بیرۆکە یـوکیپنگ (Yu Keping) بـووە بـە ئەسـتێرەیەکی گەش کە راوێژکاری نارەسمی سەرۆك هوجینتاوە. پاش تەواو کردنی دکتۆرا نامەکـەی PHD لە زانکۆی بەیجین. کرا بە سەرۆکی دەزگای تازە...

بیرۆکە بەشێکی زانکۆیە، بەشێکی دەزگای لێکۆڵینەوەی بیرمەندان و بەشـێکیش Mckinsg بۆ حکومەت. تەبیعەتی زۆر خۆشـە و کـراوە و نارەسمییـە، لـە هـەمان کاتیشدا ئینگلیزیـەکی چاك دەزانێت کە لە سەفەرە زۆرەکانی بۆ رۆژئاوا فێـری بـووە هەروەها (زمیـل ز ائـن) ە لـە زانکـۆی DUKO لـە USA (Visiting Fellw) یوکیپنیك وەك زهانگ وینگ چاکسازی سیاسییە، ئەمیە سیاسییەکانی وڵات رەنگ دەکات بە هیوای تاقیکردنەوە و گۆڕینی دیموکراسی کە رەنگە رۆژێك دیکتاتۆریـەتی حیزب ولا نێت رۆژێکی تازە دەستپێبکات. هەروەها تاواتخوازەکە تاقیکردنەوەی وەك پنگ چانگ رۆژێك وەك شینز هیتر ببێتە نموونەی دیمۆکراسی سیاسی. چەقی قورسای

پرۆژەکەی بریتییە لە پرۆگرامێك کە خەڵاتی داهێنانی دیموکراسی ناو خۆی وەرگرتووە. کە وایکردووە زۆر گروپ و بیرمەند و شارەزا هانی گۆڕان و چاکسازی پارتی کۆمۆنیست و حکومەت دەدات کە لە ناوەوە چاکسازی دەستپێبکەن دەست پێشخەرییەکان و هەوڵە خۆڕسکەکان تایەتە هەژمار، ئێمە هەوڵدەدەین کە سەرژمێری هەڵسەنگاندن و بەراوردیان بکەین.چاکترین بیرۆکەش خەڵاتیان پێدراوە، لەوەتەی ئەم پرۆگرامە دەستی پێکردووە لە ساڵی ١٩٩٩ ، ٨٠٠ پرۆژە دەستنیشان و پاڵێوراوە و (٣٠) سی خەڵات پێشکەشکراوە بۆ هەوڵی چاکسازی و هەڵبژاردنی سەرۆکی شارو شارۆچکەکان، مەشوەرەتی دیمۆکراسی . ئەوانەی خەڵاتکراون بوون بە جێگای سەرنجی نیشتمانی بۆ نموونە کاتێك هەڵبژاردنی هەرێمی پینگ چانگ خەڵاتی ساڵی٢٠٠٦ بەرکەوت، لە ناکاو ٨٦ گروپی لێکۆڵینەوە هاتن بۆ هەرێمەکە، تا لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەن. تەنانەت جێگری سەرۆکی چین داوای راپۆرتی کرد بوو سەبارەت بە هەڵبژاردنەکان لەو هەرێمە.

یوکیپین بوو بە هۆی دروستبوونی چەندین شەپۆل کاتێك لە دیسەمبەری ٢٠٠٦ وتارێکی نووسی و بڵاویکردەوە لە رۆژنامەی قوتابخانەی ناوەندی حیزب لە ژێر ناونیشانی " دیموکراسی شتێکی باشە" کە تێیدا دەڵێت ئەگەر خەڵك باشترین خواردن و جل و بەرگ و خانوو بەرەو هۆیەکانی هاتووچۆیان هەبێت، بەڵام مافی دیمۆکراسییان نەبێت. ئەوە مانای ئەوەی کەم و کوڕی لە کەرامەتی مرۆڤدا هەیە. سەرەڕای ئەوەش یوکیپینگ توانای خۆگرتن و مانەوەی هەبوو وێڕای ئەو هەوڵانەی کە لە ئارادا هەبوون بۆ لادانی و رامالینی بەوەی لە جیاتی خیتاب دان سەبارەت بە مافی مرۆڤ ئازادییە گشتی و تایبەتییەکان، ئەو هەوڵ و توانای خۆی چڕ دەکردەوە لەسەر پرۆژەی بچووك و کاریگەر. بیرۆکەی سەرەکی ئەو بریتییە...

زیاد کردنی دیموکراسی" Incremental Democracy" بە واتایەکی تر باوەش کردنەوە بۆ دیموکراسی هەنگاو بە هەنگاو... ئەمەش دژ بە تیۆری شۆك و گۆڕینی دیموکراسی چاکسازی لە ناکاوە" Big Bang Political Reform" . بەمەش

پاڵپشتی لە گۆڕینی لەسەرخۆ لە خوارەوە بۆ سەرەوە دەکات. کە هاوتەریب بێت لەگەڵ تۆنی گۆڕانکاری و پێشکەوتنی ئابووری، ئەو پێیوایە چاکسازی نێوان شەو و ڕۆژێك زیانی بەقەد زیانی چارەسەری بە شۆك (صدمە) "Shock Theropy".

یوکیپینگ بۆ چەندین ساڵ بانگەشە و بلنگەوازی بۆ بیرۆکەی شەلال یان ڕووبارێکی بچووك دەکرد کە وردە وردە بەرەو دیموکراسی هەڵدەکشێت بە پشت بەستن بە تاقیکردنەوە سەرکەوتووەکان. کە سەرەتا دەبێت هەڵبژاردن لە ۷۰۰/۰۰۰ گوند دا بکرێت، ئەوجا لە ئاستە بەرزترەکانی حکومەتیش ، لەسەر ئاستی ۳۸/۰۰۰ شارۆچکەو ۲۵۰۰ شار، یان پارێزگا ئەوجا ۳۳۰ ولایەت و دواتریش لە ۳٤ هەرێمدا، بەر لەوەی دەستکاری لە دەسەلات و سیاسەتی حکومەتی ناوەندی بکەین.

پرۆژەکەی یوکیپینگ "Yu Keping" زۆر زیاتر بەرەو پێش چووە و بوو بە جێگەی ئومێد بە تایبەت دوابەدوای هەڵوەشانەوەی سیستەمی کۆمۆنە لە ولاتی چین لە ساڵانی هەشتاکاندا:

لە هەمان کاتدا دەستکرا بە هەڵبژاردنی کۆمیتەی گوندەکان، تا ساڵی ۱۹۹٤ نیوەی دێیەکانی چین هەڵبژاردنی کۆمیتەکانی تێدا ئەنجامدرا بوو. لە ساڵی ۱۹۹۸ یاسایەك دەرچوو بەناوی یاسای سروشتی کۆمیتەی دێیەکان (Ommittees) (OLVC) Organic Law forvillage کە هەڵبژاردنی گوندەکان دەکات بە زۆرەملێ. هەر لەهەمان ساڵدا شارۆچکەیەك لە پارێزگای سیچوان (Sichuan) بە ناوەی بویولن (Buyun) کەوتە ناو مێژوو بەوەی بوو بە یەکەم شارۆچکە دوای گوند کە هەڵبژاردنی ڕاستەوخۆی تێدا ئەنجامدەدرێت و کێ بر کێ یەکی ئاشکراش بەخۆوە بینی کە هەموو کەسێك مافی خۆ پاڵاوتنی هەبوو. لە ساڵی ۲۰۰۱ هەڵبژاردن دوو جاری تریش ئەنجامدرا بەلام ئەمجارە (کۆنگرەی خەلکی شارەکە دووبارە چاوی دەخشاندەوە بە وانەی خۆیان پاڵاو تبوو) یوکیپینگ پێیوایە کە هەڵبژاردنەکان کاریگەریەکی زۆریان لەسەر ژیانی خەلك هەیە. لە کاتی وەرگرتنی خەلاتی (بویوان) دا (Buyanl) گوتی گوندنشینەکان ئێستا دەزانن کە مافی دیموکراسی خۆیان پیادە

دەكـەن... بەرپرسـانی شـار هەسـت بـە بەرپرسـیاریەتی زۆر دەكـەن و خـەمی لێپێـچانەوەیانە، ئـەو بەڵێنانـەی پـاڵێوراوان دابوویـان بـەر لـە هەڵبژاردنـەكان... دووپاتەكرێتەوە لە هەڵبژاردنی وەرزیداو هـەموو مانگێـك لـە (بویـوان) دا خـەڵك دەتوانێت راستەوخۆ پرسـیار و نیگەرانییـەكانی خۆیـان ئاراسـتەی بەرپرسـانی شـار بكەن... و سـاڵێ جارێكیـشی لـە ئێـوارەی سـەری سـاڵی تـازەی (سـاڵی مـانگی) "Lunar new year" سـەركردەكانی شـار راپۆرتێـك سـەبارەت بـە پێـشكەوتنی شارۆچكەكە پێشكەش بە دانیشتووانی شارۆچكەكە دەكەن.

بـەلاّم لەوەتـەی رۆژگـارە دژوار و سـەختەكانی سـالاّنی ١٩٩٠ بەسـەر چـوون، پێشكەوتنی دیموكراسی سەقامگیری بەخۆوە بینیوە، بەلاّم تەنها ژمارەیەكی كـەم كـە بە پەنجەكانی دەست دەژمێـردرێن لـە شارۆچـكەكانی تـر رێـچكەی "بویـوان" یـان گرتۆتەبەر. لەوەش زیـاتر تەنانـەت لەسـەر ئاسـتی گوندیـشدا زۆربـەی هـەرە زۆری هەڵبژاردنەكان تەنها یەك تاكە پاڵێوراوی تێدا بوو لـە جیـاتی بـوونی پێـشبڕكێیەكی ئاشكراو ئازاد. لە ناو توێژی بەرمەنداندا لە چین بەبێ بایەخی هەڵبژاردنی دێهاتـەكان هەڵدەسـەنگێنن و دەڵـێن كومیتـەی دێ هـیچ سەرچـاوەی داهاتیانـەی نیـیە پـارە و پوولیان لەبەر دەستدا نییە تا بڕیاری لەسەر بدەن و هەندێك بەرپرسیاریەتی لاوەكی و كەم بایـەخیان هەیـە. یـەكیپنگ و هاورێكـانی پێیـان وایـە ئـەم لەخۆبایيبوونـە و فشەفـشی دانیـشتوانی پایتـەخت و شـارە گـەورەكانن. هـەر چـەندە بەرپرسـەكانی هەڵبژاردوو لە هەڵبژاردنە ناوخۆییـەكان كاریگەریەكی زۆر كەمیان هەیە لەسەر ژیـانی هاوڵاتیـان، بەلاّم لە دێهاتەكاندا ئەوان بەرپرسـیارن لە سیاسـەتی گرنگی وەك " پلانـی خێزانی" باج و دەست بەسەرداگرتنی زەوی و موڵكدا. یـوكیپینگ لـەم بۆچـوونەیدا پشت ئەستوورە بە لێكۆڵینەوەكانی ئابووری نـاس و مامۆسـتا لـە زانكـۆی بـەیگین (یانگ یاو).

Yang Yao كە نیـشانیداوە هەڵبـژاردن یارمەتیـدەرە و هانـدەرە بـۆ بـەگژدا چــوونەوەی گەنــدەڵی و هانــدانی چاكـــسازی لـــە خزمـــەتگوزاری گـــشتیدا. لـــە

لێکۆڵینەوەیەکدا کە لە ماوەی شانزدە ساڵدا ئەنجامدراون و چل و هەشت گوندی لـە خۆوە گرتبوو. یانگ یاو بۆی دەرکەوت کە هەڵبژاردنەکان بوونەتە هـۆی زیـاد بـوونی لەسەرفکردنی گشتی بە ڕێژەی لە سـەدا بیـست و لـە هـەمان کاتیـشدا بۆتـە هـۆی کەمکردنەوەی ڕێژەی خەرجییەکانی فەرمانگە گشتییەکان بـە ڕێـژەی ١٨ لـە سـەد، وەك (خەرجی تایبەتی بەرپرسەکان و خێزانەکانیان).

گەورەترین گرفت لە بەردەم هەڵبژاردنەکاندا بریتییە لە پارتی کۆمونیست لە چین هەر حکومەتێك بەر لە هەموو شتێك دەیەوێت دڵنیا بێت لـە دڵـسۆزی بەرپرسـانی دەوڵەت بەوەی کە دەبێت لەگەڵ خەتی حیزبدابن.لە لایەن چاودێران و ڕەخنەگراندا ئەم هاوتەریبییە وایکردووە هەڵبژاردنەکان بێ سوود و بـێ مانـا بـن چـونکە کۆمیتـەی گوندەکان ڕووبەڕووی دوو ئاغا دەبنەوە، ئەو خەلکانـەی کـە دەنگیـان بـۆ داون و لـە لایەکی تریش حیزب. لە کاتی ڕووبـەڕوو بوونـەوەی بەرژەوەندییەکانـدا، بەرژەوەنـدی حیزب بەسەر هی خەلکدا زاڵبێت. یوکیپینگ دان بەوە دادەنێت کە ئەمە ڕەخنەیەکی شیاو و بەجێیە. هەر لەبەر ئەمەش بەم دواییە زۆر سـەرسـوڕماو و خوشـحاڵ بـوو بـە هەڵبژاردنەکانی پینگ چانگ (Ping Chang).

کە ئەمە هەوڵێکەبۆ بە دیموکراسی کردن لەناو جەرگەی پارتی کۆمۆنیست. لەبەر ئەوەی حیزب کۆنترۆلی هەموو شتێك دەکات، ئەم کارە جێگای خۆشحاڵی و هیوایـە. کە حیزب بە دیموکراسی گرا یان بە گۆڕانی بنەڕەتی دیموکراسی بەسەر هات، گـۆڕانی سروشتی بەسەر وڵاتدا دێت. ڕەنگە یوکیپینگ تۆزێك زێدەڕۆی بکات لە گەشـبینی، بەڵام بیرۆکەی دیموکراسی ناو حیزب جێگای سەرنجە.

**دیموکراسی ناو حیزب:**

هەرێمی پینگ چیانگ" Ping chang" بـۆ یـوکیپینگ وەك گوندی زێڕاکـان وایە، نیشانیدەدات کە لە یەکچوونێکی زۆر هەیە لە نێوان دنیای سیاسەت لە لایـەن مێژووی چاکسازی ئابووریی زهانگ وییـنگ و نێوان ئاوات وئومێدی بـڵاو کردنـەوەی

دیموکراسی لە نێو ریزەکانی حیزب، کە بەمەش دواتر بڵاو دەبێتەوە لەناو کۆمەڵگادا. چۆن یەکەمجار هەرێمەکانی سەرکەنار ڕێگەیان پێدرا کە دەوڵەمەند بن، هەر بەمجۆرەش دەخوازێت یەکەمجار ئەندامانی حیزب بەر شەپۆلی دیموکراسی کەون. یوکیپینگ دەڵێت با یەکەمجار هەڵبژاردنی ئازاد لە نێو ریزەکانی حیزب ئەنجامبدرێت. هەروەها دەڵێت چۆن هەرێمەکانی سەرکەنار بە سوود وەرگرتن لە نزیکیان لە هۆنگ کۆنگ و زمانی کۆنی چینی (Cantonese) و بەستنەوەی هۆکانی هاتوچۆ توانیان گەشەسەندن و پێشکەوتنی ئابووری بە ئەنجام بگەیەنن، بە هەمان شێوە ئەندامانی حیزب ئەو فرسەتەیان لە بەردەمە ئەندام بوونیان لە حیزب ئاستی بەرزی رۆشنبیری و تێگەیشتنیان و رۆڵی گرنگی خۆیان ببینن بەوەی سەرکردەی گەلن بە بەرپا کردنی لێشاوی دیموکراسی لەناو حیزب بە بڕوای ئەو تاقیکردنەوەی پینگ چیانگ رەنگە ڕێگا بکاتەوە بۆ چاکسازییەکی بنەڕەتی لە پێکهاتە و بونیادی حیزب.

کەواتە دیموکراسی ناو حیزب مانای چییە؟ بە شێوەیەکی سەرەکی بریتیی دەبێت لە بەهێز کردنی مافی ئەندامانی ئاسایی حیزب بۆ خۆ پاڵاوتن لە هەڵبژاردنەکان. دەنگ بدەن بۆ نوێنەرەکانیان و رەخنە ئاراستەی بەرپرسە هەڵبژێردراوەکان بگرن. ئەم بیرۆکەیە دەبێتە هۆی تازە کردنەوەی حیزب لە خوارەوە بۆ سەرەوە بە جۆرێک کە بوارێکی راستەقینە بخوڵقێنێت بۆ پێشبڕێکی بۆ هەموو پۆستەکانی حیزب. لە ساڵەکانی رابردوودا ئەم کارە لەسەر ئاستی پارێزگاو کۆنگرەی نیشتمانی حیزب کاری پێکراو دەستەی بەڕێوەبردنی هەڵبژاردن بە رێژەی ١٥-٢٠ لە سەدی کاندیدی زیاتریان هەبوو لە پۆستەکان. بەڵام ئەم جۆرە کۆنگرانە کارتۆنین و تەنها بە روخسار کۆنگرەن لە راستیدا نەبوونەتە سەنتەری هێز. لە مەودای دوور رەنگە دیموکراسی ناو حیزبە پلە بەرزەکانی ناو حیزبیش بگرێتەوە تا دەگاتە سکرتێری حیزب. دەرئەنجامێکی سەنتیقی بیرۆکەی دیموکراسی ناو پارتی کۆمونیست دوو باڵ دروستدەکات کە کێبڕکێی یەکتر دەکەن لەسەر بنەمای ئایدۆلۆژی جیاوازدا بۆ وەدەستهێنانی پاڵپشتی ئەندام و لایەنگران. دوور نییە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ

چەپی تازەو راستی تازە لێکبترازێن و لەناو حیزبدا بێن بە دوو باڵی زەق و ئاشکرا، بگرە رەنگە بێن بە دوو حیزبی جیاواز لە ناو حیزبدا.لە ساڵی ٢٠٠٧ دا گفتوگۆیەکی زۆر گەرم و گوڕ لە ئارا دابوو بەر لە بەستنی کۆنگرەی حیزب سەبارەت بە دیموکراسی لەناو حیزبدا، چونکە پارتی کۆمۆنیستی ڤێتنام کە لاسایی کەرەوەی پارتی کۆمونیستی" چین"ە بڕیاریاندابوو کە هەڵبژاردنی راستەوخۆ و عادیلانە لەناو حیزبدا ئەنجامبدەن.

لە سەرەتای ساڵ، هەرچەندە پارتی کۆمونیستی چین بڕیاریدا بوو وەك ڤێتنام نەکات، بەڵام لە کۆنگرەی حەڤدەهەمی حیزب هەنگاوی زیاتریان نا بەرەو بەشداریکردنی زیاتر لە ئەندامانی حیزب لە بڕیارەکاندا. بە گوێرەی راپۆرتی رۆژنامەنووسەکان کاندید کردنی (خی جینپینگ)ی Xi Jinping بەرپرسی شەنگەهای بۆ ئەوەی بێتە شوێن هوجینتاو تەنها لە ژێر کاریگەری ئەو ئامارە نهێنییە بوو کە پارتی کۆمۆنیست لە راپرسییەکی نهێنی کردبووی. هەرچەندە هوجینتاو " Hu Jintao" کە جێگای خۆی دانێت، بەڵام خی جینپینگ لێی بردەوە و بەسەریدا زاڵبوو.

بیرۆکەی یوکیپینگ رەنگە کاریگەریەکی زۆری لەسەر چین هەبێت، ئەگەر پارتی کۆمۆنیستی وڵاتێکی سەر بەخۆ بوایە کە ژمارەیان ٧٠ ملیۆنە زیاتر لە ژمارەی دانیشتوانی (UK). بەڵام سەرەرای ئەمەش پرۆژە سیاسییەکەی زۆر لە واقیع دوورە. کردنی شارۆچکەیەکی بچووکی دابڕاو وەك پینگچان" Ping chang" بە نموونە بۆ چین کارێکی زۆر ئەستەمە، چونکە بە هیچ جۆرێك بەراورد ناکرێت لەگەڵ شانگەهای، (بەکین) و (شینزهین)ی گەشاوە. تا ئێستاش ئەو ٢،٤٩٩ شارەکانی تری چین هیچیان رێچکەی پینگچانیان نەگرتۆتەبەر، لەمەش زیاتر ئەو راستییەی کە چاکسازخوازی سیاسی وەك یوکیپینگ پەنا دەباتە بەر ماسی کرتن لە ئاوی لێڵ، بۆ گەڕان لە دوورترین گوندی چین تا باس لە ئاقیکردنەوە و سەرکەوتووەکەیان بکات ئەوە نیشاندەدات کە کەش و هەوای سیاسی لە چین چەند ناخۆش و سەختە و چەند

زەحمەتە بلێ لە بلێ یا گفتوگۆ لەسەر چاکسازی سیاسی بکەیت.بە سەرنجدان لە گفتوگۆی نێوان بیرمەندانی چین قەت مەزەندەی ئەوە ناکەیت کە لە دووری کەمتر لە دوو کاتژمێر بە فڕۆکە لە شەنگهای، کۆمەڵگایەکی چینی هەیە، کە حکومەتی چین دەڵێت بەشێکی تەواوکەر و دانەبڕاوە لە چین، کە تێیدا هەڵبژاردنی گشتی و ئازاد ئەنجامدەدرێت بە بەشداری پارتی سیاسی جۆراوجۆر و ئازادی رادەربڕین زامنکراوە مافی تیا پارێزراوە و لە زیاد بوونیش دایە جگە لە پاراستنی مافی کەلتووری و رێژەی بەرزی داهاتی هاوڵاتیان کە دەگاتە ٢٠/٠٠٠ -GDP دۆلاری ئەمریکی بۆ هەر تاکێك. سەرەڕای ئەوەش لەبەر هەستیاری بابەکە کە پەیوەندیدارە بە تایوان، لە یوکیپینگ قەبوولدەکرێت کە باس لە تاقیکردنەوەیەکی هەژاری وەك ئەوەی سەرەوە بکات لە ناوەوەی چین لە بری باسکردن و لێکۆڵینەوە لەسەر تایوان.

لێکۆڵینەوەکان و هەوڵەکانی یوکیپینگ کە بە شێوەیەکی تەکنوکراتییە نیشانەی کاتە. لە ساڵانی حەفتاکاندا قوتابیانی چین دیوارێکیان دروستکرد لە بەمیگین بەناوی دیواری دیموکراسی کە تیایدا پۆستەریان هەڵواسیبوو داوای هەڵبژاردنی ئازادیان دەکرد. لە ساڵانی هەشتاکاندا باس لەوە دەکرا چ جۆرە سیستەمێك پیادە بکەن ئەگەر باوەڕشیان بۆ دیموکراسی کردەوە. ئایا سیستەمی سەرۆکایەتی ئەمەریکی پیادەبکەن کە هەرسێ دەسەڵاتی سەرۆکایەتی ویاسادانان و داد بە تەواوەتی لێك جیا دەکاتەوە یان نموونەی وێستمنستر (UK) ی دیموکراسی کە حکومەت لە لایەن پەرلەمان هەڵدەبژێردرێت، کە زیاتر لەگەڵ نموونەی چین دەگونجێت؟

هەندێکی تر داوای سیستەمێکی تێکەڵ و متوریە کراویان دەکرد لەسەر بنەمای نموونەی فەرەنسی. ئەم گفتوگۆیانە گەیشتنە لوتکەی پەرستن کە خوێندکاران خۆپیشاندانی مەیدانی تیانەمیتیان ئەنجامدا لە ساڵی ١٩٨٩. بانگەشە و داخوازی بۆ زۆرجۆر چاکسازی دەکرا، بەڵام دوابەدوای خۆپیشاندانی مەیدانی تیانەمین هەموو ئومێدەکانی چاکسازی و گۆڕانی چین بەرەو هەڵبژاردنی فرە حیزبی بەبا چوو

بەرپۆەبەرایەتی راگەیاندن و پڕوپاگەندە بەکار هێنانی وشەی مـافی مـرۆڤ و ئازادیـان قەدەغە کرد. باسکردن لە جیاکردنەوەی حیزب و دەوڵەت کەم یان زۆر قەدەغە کران.

یوکیپینگ ئەوە روونەدەکاتەوە کـە گفتوگـۆی سـەبارەت بـە چاکـسازی سیاسـی ساڵانی هەشتاکان کە چڕ ببوونـەوە هەڵبـژاردنی فرەحیزبـی و ئـازاد و جیاکردنـەوەی دەسەڵاتەکان... ئێستا رێگایان چۆلکردووە بۆ داخوازییەکی تازە کراوە یان تازەتر، لە رابردوو بیرمەندەکان دابەش بـوو بـوون لەسـەر چـۆنیەتی چاکـسازی ئایـا یەکـەمجار چاکسازی سیاسی بێـت و دواتـر چاکـسازی ئـابووری بـە دوادا بێـت... یـانیش بـە پێچەوانەوە؟ بەڵام ئەمڕۆ بە دڵنیاییی باس لەوە دەکەن رێـرەوی کۆتـایی وڵات دەبێـت چی بێت. ئەمڕۆ چاکسازی لە چین ئەبەستراوەتەوە بە ئـازادی و مـافی مـرۆڤ بـەڵکو زیاتر وابەستەی دۆزینەوەی رێگای شەرعیین بۆ بەردەوام بوونی پارتی کۆمۆنیـست لـە دەسەڵات. لە جیاتی هەوڵدان بۆ دۆزینـەوەی رێگـای ئـازادی و دیمۆکراسـی، زۆر لـە بیرمەندان لە رێگایەك و نموونەیەکی جیاواز دەگەڕێن.

دیموکراسی = بەرەڵلایی (Chaos)

پان ویی "Pan Wei" ئەستێرە گەشەی زانکۆی بەیگین لـە یەکـەم دیـداردا بـەم وشانە پێشوازی لێکردم: تۆ بە جۆرێك باس لـە دیموکراسـی دەکـەیت کـە وەك ئـایین وابێت و بخوازێت لە هەموو دونیـادا بڵاو بکرێتەوە. بەڵام هەڵبژاردن هیچ لەو کێـشە و گرفتانەی کە ئەمڕۆ رووبەڕووی چین بوونەتەوە چارەسەر ناکات. سـەر زەنشتی کردم بۆ ئەوەی گرنگییەکی زۆرم داوە بە تاقیکردنەوەی دیموکراسی لە چین و بەهارم هێناوەتـە چۆکان. پێیگوتم تاقیکردنەوەی سیـچوان "Sichuan" ئەزۆکـە و ناگـات بـە هـیچ دەرئەنجامێك. سەرکردەکانی ئەو شارە تەنها مەبەست و گۆلی سیاسییان هەیە، تەنها دەیانەوێت بناسرێن. بەڵام تاقیکردنەوەکە سەرکەوتوو نەبوو. بەڵکو سیچوان بەرزترین رێژەی نارەزایی و خۆپیشاندانی تێدایە. ئەو شوێنانەی دەیانەوێت لاسایی یـان کـۆپی تاقیکردنەوەکە بکەن زۆر کەمن.

زۆر بەداخەوە ئەم رایەی پان ویی رەنگــە راسـت بێـت. لــە ســاڵانی هەشــتاکان و نەوەدەکان زۆر لە لێکۆڵەرەوەکان پێیان وابوو دیموکراسی پێویستییەکی زۆر گرنگ بــە پەلەی گەشەسەندن و پێشکەوتنی سیاسی و ئابووریـە.

بەڵکو لە لای هەندێکیان مەرجی سەرەکی گەشەسەندن بوو. بـەڵام لـەم ســاڵانەی دواییدا بە تایبەت دوای گەشەسەندنی ئابووری لە چین- ئەم جۆرە پەیوەندییــە کەوتــە ژێر شك و گومان و پرسیار. چیتر دیموکراسـی وەك تاکــە گــوڵ و ئارمــانجی ســەرەکی تەماشا ناکرێت، بەڵکو وەك کەرەستەیەکی سەرەکی دەبینرێت وەك رێگا خۆشکەر بۆ خۆشگوزەرانی و سەقامگیری سیاسی. هەر بۆیەش رێگا لە بەردەم پــان ویــی" Pan wei" خۆشکرد کە هێرشی توند بکاتەسەر دیموکراسی و دەڵێت هەڵبژاردنــەکان هــیچ لە کرفتە هەنووکەییــەکانی چین چارەسەر ناکەن...

زیــاد بــوونی نــارەزایی و خۆنیــشاندان، ئــەو کەلێنــە گــەورەی نێــوان هــەژار و دەوڵەمەند، نزیك بوونەوەی ئــابووری دیهــات لــە ئیفلاس کــردن، کــەمی ســەرف و خەرجکردنی ناوەخۆ، یانیش زیادبوونی گەندەڵی لە نێوەندی نوخبە سیاسییەکان. لــە راستیدا پان ویی پێیوایە کە دیموکراســی شــتەکان بــە ئاراســتەیەکی خــراپ دەبــات. هەرچەندە بەرپرسە سیاسییە هەڵبژێردراوەکان داخوازیان زیاد بێت، زیاتر پێویــستیان بە پارە دەبێت و هەمیشە خەڵکی دەوڵەمەندیش حازر و ئامــادەن بــۆ دابینکردنــی پارە بۆ سیاسەتمدارەکان ئەویش لە بری یارمەتی حکومەت بۆ پرۆژەکانیـان. ئەمـەش وادەکات کاتێك هەڵبژێردران دەبێت خزمەتی دەنگدەران لە لایەك ئەو دەوڵەمەندانەی پارەیان پێدا بوون لە لایەکی تر بکەن. بەلای خەڵك گرنگ نییــە کــێ لــە دەســەڵاتە، بەڵکو چۆن دەسەڵات بەرێوە دەچێت. پان ویی دەڵێت چاکــازی سیاسی دەبێت لە ژێر کاریگەریی کێشە کۆمەڵایەتییەکان بێت نەك لە ژێر کاریگەری جیهان یــان پرنــسیپە رۆژئاواییــەکان.

زۆربەی تیـۆرستە (Theorists) کانی دیموکراسی ئەوە لە پان ویی قەبوول ناکــەن کە چۆن حکومەت بەرێوە دەچێت و چــۆن ســەرکردەکانی دەستنیــشاندەکرێن چــونکە

حکومەت بەرهەمی سەرکردە سیاسییەکانە. ئەو شەرعیەتەی کە لە هەڵبژاردن وەدەستدێت ئەو حکومەتە بەهێز دەکات کە دەیەوێت مامەڵە لەگەڵ کێشەکانی چین بکات لەسەر ئاستی ناوخۆ و نێودەوڵەتیدا. ئەو دید و بۆچوونەی پان ویی پڕ لە رق و قین، لەوە دەچێت رەگی قووڵتری هەمێت لە گفتوگۆ یەکی هزری. ئەو دەڵێت دیموکراسی سێ یادەوەری زۆر ناخۆشیان بیردەخاتەوە کە لە بیر و رۆحی هەموو "چین"ی یەك بوونیان هەیە: رووخان و هەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤیەت کە لە ئەنجامی ئازادیخوازی گۆرباتشۆف روویدا، لەگەڵ ئەوەی پێیدە گوترا "دیموکراسی خەڵك" یان شۆڕشی کەلتووری چین و مەترسی جیابوونەوەی تایوان.

کاتێك ماو ویستی دەوڵەتێکی سۆسیالست لە چین دامەزرێنێت سوودی لە تاقیکردنەوەی سۆڤیەت وەرگرت وەك نەخشەی سەرەکی یان کۆپی کردنی وەك نموونە، لە دەزگاکانی دەوڵەت و دروشمەکان و تەنانەت نیشانەکانیشی (Ironography) هەر هەمووی بە کۆمەڵ لە سوڤیەتەوە هێنران و تەنها گۆڕینێکی زۆر کەمیان بەسەردا کرا. لە کاتی شەڕی ساردا روسیا هەمیشە لە لایەنی تەکنەلۆژی بەسەر "چین" دا زاڵبوو. واش دیار بوو کە ئەم زاڵبوونە تا هەتایە بەردەوام دەبێت. بەلام لە ساڵی ۱۹۹۱ ئاشکرا بوو کەسۆڤیەت پلنگی لەکاغەز دروستکرا بوو. کاتێك گۆرباتشۆف دەسەلاتی لە دەستدا، ئیمپراتۆریەتی سۆڤیەتی هەڵوەشایەوە و بوو بە چەند بەش، سەرمایەداری مافیا ئابووری ولاتیان تالان کرد دەرئەنجامی داهاتی ناوخۆ GDP بوو بە نیوە. نوخبە دەسەلاتدارەکانی چین ئێستاش لە مشتومڕی ئەوەدان داخوا بۆچی ئەوە روویدا: ئەوان پێیان وایە هەڵەی چاکسازی سیاسی بەرلە چاکسازی ئابووری گرنگترین یا خود تاکە فاکتەر بوو. هەر بۆیەش لە خۆیان گرتووە کە هەڵەی وا دووبارە نەکەنەوە.

لەوەش پڕ ئازارتر ئەو شۆڕشە فەرهەنگییە یان کەلتوورییە کە ماو لە ساڵی ۱۹٦٦ بەرپایکرد، کە ویستی پاشماوەی بۆرژوا لەناو بەرێت تاکەمەکەیشی بریتیبوو پتر لە دە ساڵ توندوتیژی و گێوە شێوێنی، ئابووری سەقەتکرد و بناغەی کۆمەلایەتی

وێرانکرد و نزیکەی نیو ملیۆن قوربانی لێکەوتەوە. زۆربەی بیرمەندانی ئەمڕۆ ئەم ساڵانەیان لە دێهات بەسەربرد. وەك کرێکاری تونێل و کارگەکان یان کێڵگەکان، جوانترین و خۆشترین کاتی ژیانیان کە منداڵییەتییە لێ زەوتکرا.فرسەتی تەواوکردنی خوێندنی زۆربەیانی وێرانکردن. بەم دواییە ژمەی ئێوارەم لەگەڵ یەکێك لە بیرمەندە ناسراوەکانی چین خوارد کە خوێندنی لە ڕۆژئاوا تەواو کردووە زۆر هاندەر و سەرسوڕماوە بە نازاری تاك و رادەربڕین لە ڕۆژئاوا. بەڵام لەبەر ئەوەی تاقیکردنەوەی شۆڕشی کەلتووری ماوی لە یادە، زۆر لە دەرئەنجامەکانی دیموکراسی دەترسێت. بە گشتی پیاوێکی زۆر (میثالی) بە ئایدیالییە.

باسی خۆی دەکات و دەڵێت: من لە لاوێتیم زۆر ئایدیالی بووم دەمویست دەروێشێکی شۆڕشگێر بم. چووم بۆ لادێ و دە ساڵم لەوێ بەسەر برد بە کرێکاری لە کارگەکان، کاری زۆر ناخۆش وسەخت و پیسم دەکرد. هەندێك جار ژیانی خۆمم دەخستە مەترسی. هەندێك جار دە پفکە لە دەستەکانم هەبوو وامدەزانی جوتیاران و هەژاران پاڵەوانی مێژوون و دەبێت ئێمەش خۆمان بگۆڕین تا وەکو ئەوانمان لێ بێت: من لە خێزانێکی زیرەك و ڕۆشنبیرەوە هاتووم. بەڵام دواتر بۆم دەرکەوت کە ئەوانیش وەك ئێمە مرۆڤن. بە چاوی خۆم بینیم کە کۆمەڵێك قوتابی ئەشکەنجەی مامۆستایان دا تا مرد، تەنها لەبەر ئەوەی نمرەی کەمی پێیداون. ناچار بووم لەگەڵ هاوڕێکانم گروپ دروستبکەین بۆ پاراستنی ژیانی مامۆستاکانمان لە هەر هێرشێك. ئەگەر خۆت شلبکەیت، یان سەندوقەکە بکەیتەوە کۆنترۆلت بەسەر خەڵك نامێنێت. هەر بۆیە تاکە ڕێگا چارە ئەوەیە چاکسازی لە سەرەوە بۆ خوارەوە ئەنجامبدەیت. ئەمە زۆر زەحمەتە، بەڵام دەگرێت.

لە ئینگلستان لە سەردەمی زێڕینی شۆڕشدا و سەردەمی ڤکتۆری کێشەیەکی گەورەی بەرژەوەندی سەرمایەداری و دەوڵەمەندان هەبوو، بەڵام ئەوان زانیان چاکسازی لە دوا ڕۆژ لە قازانجیان دایە هەر بۆیەش بەردەوام بوون لەسەری.

(پان ویی) یش مەترسی ئەوەی هەیە کە هەڵبژاردن ببێتە هۆی ئەوەی (دێوەکـە) لەناو شووشە دەربێت ئـازاد بێـت. کـە دەبێتـە هـۆی دوژمنکـاری نێـوان جوتیـارە هەژارەکان و چینی ناوەڕاست کە ڕەنگە ببێتە هۆی هەڵوەشانەوە و لەت لـەت بـوونی وڵات. شەڕی مان ونەمانی چین و توێژەکان لە شەستەکان و حەفتاکاندا بۆ بە شـەڕێك هەموو دژی هەموو دەجەنگان، کەس ڕێزی لە یاسا نەدەگرت و کەسیش بـە دۆرانـدن ڕازی نەبوو... شەڕێکی زۆر خوێناوی بوو. سەرەڕای ئەمەش، یاسکردنی تایوان وا لـە پان ویی دەکات بە زمانێکی ڕەنگاوڕەنگ بێتە ناخاوتن. ئەم دورگەیەی کـە چـین بـە دابڕاوی لە قەڵەم دەدات (هەرێمی دابڕاو) لە ژێـر حـوکمی ئـەتوکراتی بـوو کـە دژ بـە سیستەمی کۆمونیـستی بـوون بـاوە ڕمـاوی نزیکـەی پـەنجا سـاڵ بـەر لـەوەی یەکـەم هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی تێیدا ئەنجامبدرێت لە ١٩٩٦ ئەمـەش ئـەوە دەردەخـات کـە کەلتوور و دیموکراسی "چینی" دەتوانێت بەراورد بکرێت. پان ویی دەڵێت ئەم هەڵبژاردنە بوو بە هۆی ئەهامەتی بۆ تایوان. تووشی زۆر کێشە هاتن لـە وانـە تۆمـەتی گەنـدەڵی خراوەتە پاڵ سەرۆك چین شـیو -بیـان"Chin Shui-Bian" و خێزانەکـەی. چـین زۆر بەخێرایی وا خەریکە دەکاتەوە تایوان لە لایەنی ئابووری. بـەلام کـە بـاس لـە نموونـەی تازەی دیموکراسی تـایوان دەکرێت، ئـەو دەڵێـت بۆتـە هـۆی دروستبوونی ناسـنامەی نیشتمانی تایوانی. ئـەوەی چینییەکان زۆر تـورە دەکـات ئـەم هەڵـسەنگاندنانەیە بـۆ سیستەمی سیاسی تایوان و دەڵێن ئەگە مەترسی لەشکری چین ئـەبێت بەسـەر تـایوان ئەوا ئەوان دەنگ بۆ جیابوونەوە دەدەن. ئەگەر ئەو مەترسی لەشکریشی بۆ سەر تـایوان ڕاست بێت، ئەوا هەمان هەڕەشەم بۆ سەر ئەتەوەکانی تری کە لە چین دادەژیـن ڕاسـت دەبێت، ئایا خەلکی تبت دەنگ بۆ سەربەخۆیی دەدەن؟ ئەدی خەلکی ئیگهرس خنجیان "Uighurs of Xinjian". چـین هـەروەك یەکیـەتی سـۆڤیەتی جـاران زیـاتر لـە ئیمپراتۆریەت دەچێت لەوەی لە دەوڵەتێکی یەك ئەتـەوە. یـان "دەوڵـەتی ئەتـەوەیی". تاقیکردنـەوەی یەکیـەتی سـۆڤیەت سـەلماندی کـە دیموکراسـی ڕەنگـە ببێتـە هـۆی هەڵوەشانەوە و لەت لەت بوونی ئەتەوە. بۆ پان ویی هەروەك زۆران لە نوخبەکانی چین،

دیموکراسی مانای فەوزاو بەرەڵایە: لە ڕۆژهەڵات خەڵك لە دەسەڵاتی سیاسی و جۆری ململانێیان لەگەڵ یەکتر ڕاهاتوون. بەڵام من پشتگیری لە سیستەمێکی سیاسی ناکەم کە هانی بەرژەوەندی بە جیاجیاکان دەدات دژ بە یەکتر ململانێ بکەن بۆ دەست بەسەرداگرتنی دەسەڵات. لە چینی دۆڕاو قەت ئەم سیستەمە پەسند و قەبوول ناکات.

زۆر سەختە بتوانیت دەستنیشانبکەیت چەند لە وتار و خیتاب و بیروڕاکانی سەرچاوە لە هەستی خۆپاراستن کردن لە دەست دەوڵەت و، چەندیشی سەرچاوە لە ژێر کاریگەری پڕوپاگەندەی حکومەت هەڵدەگرێت.بەهەر حاڵ بۆمن زەحمەتە لەو دیموکراسییە ساوایە تێبگەم کە"GDP" یەکەی دەجار لەهی چین زیاترە. تایوان کێشەی زۆرن بەڵام هەڵگەڕانەوەی سیاسی بەهی هیچ شوێنێکی تری وەك ئەورووپای ڕۆژهەڵات ناچێت ئەوانەی خاوەن دیموکراسی تازەن وەك ئەورووپای ناوەڕاست. تەنانەت ئەو گەندەڵییە ڕەنگاوڕەنگەی کە سەرۆك و دەست وپێوەندەکانی گرتەوە. نیشانەی پێشکەوتنە چونکە لە ژێر سایەی سیستەمی تۆتۆگرامی کۆن کێشە وابە ئاسانی پینە و دیزە بە دەرخوونە نەدەکرا. بڵاو بوونەوەی سەروەری یاسا ڕەنگە بەهەمان خێرایی دیموکراسی نەبێت لە تایوان، بەڵام بنەما و بناغەی پتەوی دیموکراسی و شەفافییەت و میدیای ئازاد کەرەستەی زۆر بەهێزن دژ بە گەندەڵی.

### "ڕێڵانی زۆرینەیانی Meritocracy"

پان ویی سەرزەنشتی ڕۆژئاواییەکان دەکات بۆ بە هەڵە تێنەگەیشتن لە سیستەمی سیاسی خۆیان و دەڵێت: ئەم وڵاتانە سەقامگیر و گەشەسەندوون لەبەر دیموکراسی، بەڵام ئێمە خۆمان تووشی سەرلێشێوان دەکەین سەبارەت ئەو قازانجانەی لە سایەی دیموکراسی بەدەستمان دەکەوێت لەگەڵ ئەوانەی لە سایەی دەوڵەتی یاساو سەروەری یاسا وەدەستنێین. پان ویی پێیوایە کە دیموکراسی و دەوڵەتی یاسا مەرج نییە بە یەکەوەبن.لە ڕاستیدا هەروەك ینگ و یانگ" Ying and Yang" هەمیشە لە دژایەتیدان.

دیوکراسی پەیوەندیدارە بە دانی دەسەڵات بە خەڵك، بەڵام سەروەریی و دەوڵـەتی یاسا بریتییە لـە چـوار چـێوە دانـان و کـەم کردنـەوەی ئـەم دەسـەڵاتە. دیوکراسـی حکومـەت دادەمـەزرێنێت، بـەڵام سـەروەریی و دەوڵـەتی یاسـا (Rule of Law) ڕێکیان دەخات دیوکراسی بریتییە لە دەرکردنی یاسـا، سـەروەریی و دەوڵـەتی یاسـا دەیان سەپێنێت.

سەرچاوەی هێزی دیوکراسی ئەو بەرپرسانەن کـە ئێمـە دەنگیـان بـۆ دەدەیـن وەك، پەرلەمانتاران، وەزیران، و سەرۆکەکان، بەڵام سەرچـاوەی هێـزی سـەروەریی و دەوڵـەتی یاسا ئەو کەسانەن کە بە ئەنقەست هەڵنابـژێردرێن، وەك، فەرمانبـەرە سـەربەخۆ و بـێ لایەنەکانی دەوڵەت، دادوەرەکان، ژمێریارە باوەڕ پێکراوەکان (Auditors). لە کاتێـك دیوکراسـی شـەرعیەت لـە هەڵبـژاردنی گشتی یـان لـە پەرلـەمان وەردەگرێـت ئـەوا سـەروەریی و دەوڵـەتی یاسـا شـەرعیەت لـە تاقیکردنـەوە و پێداچـوونەوەی ئـەنجامی کارەکانیان وەردەگرن. دیوکراسی واتە حوکمی زۆرینە بەڵام سـەروەریی دەوڵـەتی یاسـا واتە میریتوکراسی (خەڵکی بە توانا). پان ویی دەڵێت ئێمە لە ڕۆژهەڵات گەیـشتوینەتە ناستێکی باش لە خۆشـگوزەرانی ومـۆدێرنیزم بۆیـە دەتـوانین سـوود لـە هـەردووکیان وەربگرین بۆ بە یەکەوە ژیان بە هاوتەریبی و لە هەمانکاتیشدا پارسـەنگێکی چـاك لـە نێوانیاندا دروستکەین. بەڵام تازە پێگەیشتووەکان ئەم فرسەتەیان بۆ ئەڕەخـساوە تـەنها دەبێت یەکێکیان هەڵبژێرن. زۆر لـەو وڵاتـە تـازە پێگەیـشتوانە، یوگـسلافیا، ڕوانـدا، ئەنگۆلا و لوبنان دیوکراسـیان هەڵبژارد بەبێ سەروەریی و دەوڵەتی یاسا ناکامەکەیـشی بەرهەڵای و گێرە شێوێنی بوو. ڕژێمە ئەتەوەییەکان کێشەی ئەتەوەیی و ڕەگەز پەرسـتیان زۆر خراپ بەکار هێنا بۆ وەرگرتنی دەسەڵات و بەردەوام بـوون. پـان ویـی پێیوایـە پـێ نەگەیشتنی تێگەیشتنی دیوکراسی و هەوڵەدان بۆ پیادە کردنی بوون بـە فاکتـەری لـە بلر بردنی دەوڵەت و سەروەریی و دەوڵەتی یاسا و مودێرنیزم. ئەوەش وا لە سەرکردەکان دەکات کە گەوادی بکەن" Pander" لە ڕێگای یاریکردن بە هەسـت و ئەسـتی خـەڵك لە جیاتی وەرگرتن یان دەرکردنی بڕیاری ئازایانە و بوێر بۆ چاکـسازی پـڕ ئـازار کـە لـە

مەودای دوور سوود بە گشت لایەك دەگەیەنێت. لەلایەکی تریش تەنها ژمارەیەکی کەم لە ولاتانی جیهانی پێگەیشتوو، سەنگاپور، هۆنگ کۆنگ سەروەریی و دەولەتی یاسایان پیادە کرد ئەمەش بوو بە مایەی سەرکەوتنێکی یەکجار مەزن بۆیان. توانیان سەرمایەیەکی زۆر بۆ ولاتەکانیان لە پارەی بیانی راکێشن هەروەها توانیان گەندەڵی نەهێلن و ناسنامەیەکی نیشتمانی بەهێزیش دروستبکەن.

دەسەلاتدارە کۆمونیستەکان بەوردی گوێ لەم بیرو بۆچوونانەی پان ویی دەگرن کە دەڵێت دەبێت شتە خەیالییەکان لە دیموکراسیەت جیا بکرێنەوە و دەبێت زۆر بە روون و ئاشکرای لە سەروەریی و دەولەتی یاساجیا بکرێتەوە. لە ژێر سێبەری ئەم بۆچوونەش دامەزراندنی سیستەمێکی تایبەت بۆ دامەزراندنی کارمەندی بێ لایەن لە ولات دەبێتە فاکتەرێکی زۆر چاك بۆ دامەزراندن و سەپاندنی سەروەریی و دەولەتی یاسا و دەرکردنی یاسای بەجێ کە توانای جێ بەجێ کردنیان هەبێت، دادوەرەکانیش دەتوانن ببن بە پاسەوانی راستەقینەی دەستووری چین.هەرچەندە ئەم کارە زۆری ماوە تا جێ بەجێ بکرێت پان ویی پێشبینی دیکتاتۆریەتی راوێژکاری پێشکەوتوو دەکات کە پشت ئەستوور دەبێت بە نوێترین تەکنەلۆژیا کە تیایدا هەلبژاردن بوونی نییە، بەلام بریارەکانی حکومەت بە کوێرەی یاسا و لە ژێر کاریگەری داخوازییەکانی جەماوەرگوێ گرتن لێیان دەبێت.

**سەراوژێر کردنی دیموکراسی رۆژئاوایی:**

وەنگشاوز گوانگ سەربە چەپی تازە کۆکە لەگەل رایەکی پان ویی کە دەڵێت سەرکردە بەرزەکانی چین هەولدەدەن، رێگای تازە بدۆزنەوە بۆ پیادە کردنی جۆرێك لە سیاسەت کە رەنگدانەوەی سیاسەتی رۆژئاوایی بێت بە پشت بەستن بە سەروەریی و دەولەتی یاسا و بەشداری پێکردنی هاولاتیان لە بریاردان لە جیاتی هەلبژاردن. وەنگشاوز گوانگ (Wang Shaoguang) دەڵێت هەموو دیموکراسییە پێشکەوتووەکان لە قەیراندان، ژمارەی بەشدار بووانی هەلبژاردنەکان لە کەمبوونی

بەردەوام دان، بڕواو متمانە بە سەرکردە سیاسییەکان نەماوە، حیزبەکان ئەندامەکانیان لە دەستدەدەن و پۆپیولزم Populism پش لە زیاد بووندایە (ململانێی توندی ناو حیزب بۆ گەیشتن بە پلە و پایە). سەرکردە رۆژئاواییەکان بۆ گێڕانەوەی متمانەی خەڵك بە بەردەوام لە ڕێگا و تەکنیکی تازەدا دەگەڕێن. تا رادەی ئەوەی بەسەر حیزبەکانیشیان پاز دەدەن بۆ وەدەستهێنانی دەنگی خەڵك. لەسەر ئاستی نیشتمانی ئەو ریفراندۆمەی لە هۆڵەندا و فەرەنسا ئەنجامدران سەبارەت بە یەکێتی ئەورووپی بوون بە نیشانەی گەڕانەوە بۆ دیموکراسی راستەوخۆ. لەسەر ئاستی ناوەخۆش پارێزگارو (Mayors) ئەنجوومەنی شارەکان بە بەردەوام کۆبوونەوەی گشتی پەیوەندیدار بە مەسەلە گرنگەکان ئەنجامدەدەن، وەك بڕیاردان لەسەر پلان و نەخشەی شار یان شارەوانی، خەتی هاتوچۆی پاس.هەر چەندە لە رۆژئاوادا ئەنجامدانی هەڵبژاردنەکانی فرەحیزبی ناوەڕۆکی پرۆسەی سیاسی رۆژئاواییە، بەڵام ئەم جۆرە کۆبوونەوە گشتییانەش بوون بە بەشێکی دانەبڕاو کە لەم کۆتاییە سەریان هەڵداوە کە پێیان دەڵێن راوەرگرتنی راوێژکاری.

وانگاوۆ گوانگ دەڵێت چین کارەکان بە شێوەیەك و ڕێگایەکی تر ئەنجامدەدات حکومەت بە بەردەوامی ڕێگای تازە دەدۆزێتەوە بۆ راوێژکاری و بەشداری پێکردنی خەڵك لە بڕیارە گرنگەکانی پەیوەندیدار بە سیاسەتی ناوخۆ راوەرگرتنی گشتی و دیدلری شارەزایان و راپرسی بوونەتە شتێکی زۆر گرنگ لە بڕیار دروستکردن لە چین. هەروەها دەڵێت ئەو رۆژانەی بڕیاری گرنگ و چارەنووساز کە تەنها سەرۆکێك دەیدا وەك ماو زیدۆنگ یان دنگ خیاو پینگ بەسەر چوون. لە داهاتوودا دیموکراسی راوەرگرتن"Deliberative Dewocracy " دەبێتە چەقی قورسایی سیاسەت لە چین کە وادەکات هەڵبژاردن رۆڵێکی تەواوکەر ببینێت لە جیاتی رۆڵی سەرەکی.

ئەم بیرۆکەیە جارێکی تر بۆمن باسکرا بەڵام بە شێوەیەکی زۆر کەم بەها و بێ قیمەت لە لایەن فانگ ننگ"Fang Ning" ی زانا لە بواری سیاسی لە ئەکادیمیای زانستە کۆمەڵایەتییەکان لە بەمەجازی نموونەی چێشتخانەیەك دەهێنێتەوە. ئەمو

دیموکراسی رۆژئاوایی دەشوبهێنێت بە چێشتخانەیەکی کە مانیوی دیاریکراوە کە میوانەکانی دەتوانن بڕیار بدەن چ جۆرە وەستایەك (شێف) خواردنیان بۆ ئامادە بکات، بەڵام لە هەمان کاتدا ناتوانن داوا لە (شێف)ە کە بکەن کە چ جۆرە خواردنێکیان بۆ ئامادە بکات. دیموکراسی لە چین تەنها یەك وەستا (شێف) ی هەیە، ئەویش پارتی کۆمۆنیستە. بەڵام جۆری سیاسەتەکان پێشکەشدەکرێن، هەر هەمووی بە یەك نرخی دیاریکراو بۆ هەموو جۆرە خواردنەکان"ala carte".

فانگ ننگ"Fang Ning" کاتێك ناسراو و ناودار بوو، کە لەگەڵ نەتەوە پەرستی جوداخواز وانگ خیاودۆنگ " Wang Xiaodoing" کتابێکی هاوبەشیان نووسی بە ناوی " ڕێگای چین لە ژێر سێبەری جیهانگیری" ئەمەش وایکرد کە ببێتە کەسێکی خاوەن کاریگەریەکی زۆر. هەر خۆیشی یارمەتی حکومەتی دا بۆ دارشتنی پرۆژەی حکومەت بۆ دیموکراسی لە ساڵی ٢٠٠٥ " White Paper". لەگەڵ پلان ویی کۆکە سەبارەت بە دژایەتی هەڵبژاردن، چونکە بە لای ئەو ئەمە دەبێتە لەت لەت بوونی چین و دەڵێت: رۆژئاواییەکان هیوا دەخوازن کە هەڵبژاردنەکان لە شارەکانیش ئەنجامبدرێن، بەڵام من پێموایە هەڵبژاردنێکی پڕ لە پێشبڕکێ تەنها لەسەر ئاستی گوندەکان ئەنجامبدرێن، لەبەر ئەوەی ئەوان بەشێك نین لە بنیادی دەسەڵات. بەڵام ئەم بەو بۆچوونەی سەبارەت کەمکردنی هەڵبژاردن تەنها لەسەر گوندەکان داننانێکی ئاشکرایە بە ناشەرعیەتی... هەربۆیەش دەکەوێتە سەرشانی دەسەڵاتدارانی چین لە ڕێگای چارە بگەرێن بۆدانی شەرعیەت بە بڕیارە سیاسییەکانیان. گرنگترین پرسیاریش سەبارەت بە سیستەمی دادی سەربەخۆ نییە، بەڵکو خەڵك دەبێت مافی بەشداریکردنیان هەبێت. کاتێك پرسیارم لێکرد ئایا هیچ نموونە هەیە بۆ بیرۆکەکانی کە لە واقیعدا ڕوویاندا بێت، ئەوەی ڕەوانەی لایەکی تر کرد لە تاقیکردنەوەیەکی سیاسی کە خەڵاتی یوکیپینگ وەرگرتووە"Yu Keping" مانگ ننگ دەڵێت گەر دەتەوێت داهاتووی سیاسەتی چین ببینیت برۆ بۆ شیونگ کینگ Chong qing.

**تاقیکردنەوەی بەشداریکردنی لە شۆنگ کنگ:**

(سەقفی) بانی فرۆکەخانــەی شــۆنگ کــنگ کــە لــە شووشــەیەکی پێچاوپێــچی شەپۆلاوییە و لاسایی کردنەوەیەکی زنجیرە چیای (ولـەنگ) ە Wulong کـە مانـای عەزیازی رەشە "Black Drangon". خەرمندەکەی بە جۆرێك نەخشە کێشراوە کـە نیشانەی ئومێد و خەون و زیاد بوونی کاریگەری سـەر شـارەکە و دەســەڵاتەکانیەتی. بۆردێکی راگەیاندن کە بە ئینگلیزییەکی زۆر سادە نووسراوە ئـەو دووپـات دەکاتـەوە کە شۆنگ کنگ تامی شـامپانیـای کـردووە. (نیـشانەی خۆشـگوزەرانی) . زۆربـەی خەڵکی رۆژئاوا ناوی ئەم شارەیان نەبیـستووە، بەڵام شۆنگ کنگ بـە ۲۰ ملیـۆن لـە دانیشتووانی گەورەترو زۆرترە لـە ۲۲ وڵات لـە کـۆی ۲۷ وڵاتـی یـەکێتی ئـەورووپا، ساڵانەی ۵۰۰ هەزار زیاد دەکـات. شـارەکە کەوتۆتـە بەرزاییـەکانی نێـوان هـەردوو رووباری یانگتزی"Yangtze" و چەیلن جیـانگ "Jialin Jiang" و هـەر لـەوێش یەکتر دەگرنەوە. بۆتە پردێك لەنێوان رابردوو داهاتووی چین. زۆر لە چـینییەکان دێنـە ئێرە بۆ سەردانی ئەو ماڵەی کە سەرۆکی کۆمونیستی جاران زهاو ئـن لای "Zhou En Lai" لەگەڵ خێزانی تێدا ژیابوون و لـە ۱۹۳۹-۱۹٤۷ بـۆ ئـەوەی بـە نهێنـی رۆژنامەی حیزبی لێ دەربکەن و رێکخـستنەکان بـەڕێوە ببـەن بـۆ شـەڕکردن دژ بـە ژاپۆنییەکان. سەرەڕای ئەمەش چەند دەقیقەیەك لەو لاتر داهاتووی (چین)ە. هـەروەك پەڕینەوە لە نێوان رۆماو مانهاتن. شۆنگ کنگ بە جۆرێك بڵاو بۆتەوە لە نێوان سـەر بەرزاییـەکان و باڵەخانە بەرزەکانی وەك جەنگەڵستانە لە باڵەخانەی بەرز. کـە بەقـەد بەرزاییـەکان بەرزن. لە شـەودا کە چراکان دادەگیرسێنن وەك رێگای کافرۆشانی لێدێت و هێندە بە شەوق و رەنگدارە لە سوور و سەوز و زەرد کە شەوقەکەی دەدرەوشـێتەوە لە مەیدانی سەربەخۆیی کە مونیومنتێکی لە ساڵی ۱۹۵۰ لێ دروستـکراو بـۆ یـاد کردنەوەی کۆتایی شـەڕ لەگـەڵ ژاپـۆن شـۆنگ کـنگ لـە هـەلی ئـەوە دایـە ببێتـە تاقیگەیەکی زیندوو بۆ بیر و باوەڕەکانی پان ویی، وانگ شۆکانگ و مانگ ننگ: کە

هەوڵدەدەن بۆ بەهێز کردنی (Rule of law) و راوەرگرتنی گشتی سەبارەت بە بڕیارە گرنگەکان. لی دیانخیون"Li Dianxun" بەڕێوەبەری نووسینگەی یاسایی حکومەت بۆتە سەرەڕمی ئەم پرۆسەیە. پیاوێکی پڕ لە جوولە و کەشخەیەکە قاتێکی زۆر جوان و بۆینباخێکی ناسکی لەبەرە. تەمەنی تەنها چل ساڵە و لە چواردە ساڵی رابردوو دوانزدە جار (ترفیع) ی کردووە.

کە لەم ماوەیەدا لە ئەزموونی سەروەریی و دەوڵەتی یاسا، هەرێم و حکومەتی شۆنگ کنگ و قوتابخانەی ناوەندی حیزب، تا گەیشتە ئەو پۆستەی ئێستای کاری کردووە. یەکێك لە ئەندامە بە تەمەنەکانی حیزب پێیگوتم ئەگەر جارێکی تر بێتەوە بۆ سەردانی ئێرە بۆ بینینی لی ، ئەوا رەنگە بوو بێت بە بەڕێوەبەری ئێرەش. لی دیانخیون کۆمەڵێك خەڵکی وەك خۆی زیرەك و پرووزەی لە خۆی کۆ کردۆتەوە،هەر هەمووشیان دەرچووی یاسار خاوەن هەندێك شارەزایی ژیانن لە هەندەران و ئینگلیزییەکی چاکیشی دەزانن.

لی دیانخیون"li Dianxun" بە شانازییەوە باس لە خاڵەکانی یاسای ئازادی زانیاری دەکات، هەروەها باس لە ئەو بڕیارانە دەکات کە پەیوەندیدارن بە لێپێچینەوە. کە رێگا دەدەن بە لێپێچینەوە و ئاراستە کردنی پرسیار لە بەرپرسەکانی حکومەت ئەگەر بڕیاری گرنگ و جێی پرسیاریدا. بەڵام لە هەموویان گرنگتر ئەو بڕیارەیە کە سەرجەم بڕیارو یاسا گرنگەکانی کە حکومەت دەریاندەکەن. دەبێت خەڵك رای خۆیانی بەئاشکراو بە گشتی لەسەر بدەن، وەك تاك یان لەسەر TV ، یان لە رێگای ئینترنێت. تا ئەمڕۆ توانیویانە ٩٠٠ کۆ بیستنی گشتی"Public Hearings" ئەنجامبدەن کە ١٠٠ هەزار کەس تیایدا بەشدار بوون، کە بابەتەکانیشی بریتیبوون لە: قەرە بوو کردنەوەی جوتیاران کە زەویەکانیان لە لایەن دەوڵەت دەستیان بە سەرداگیراوە، سەبارەت بە کەمترین رێژەی مووچە، هەروەها سەبارەت بە دیاریکردنی نرخی خزمەتگوزارییە گشتییەکان وەك ئاو و کارەبا و گاز و رێگا و پرد و خوێندن، خزمەتگوزاری تەندروستی و گواستنەوەی گشتی و زێراب و ئاوی پیس.

هەروەها دەسەڵاتداران شانازی بەم جۆرە گوێ بیستنە گشتییانە دەکەن، وەك نرخی بلیتی شەمەندەفەری ناوخۆ، کە وایکرد نرخەکە لە ۱۵ Yuan دابەزێت بۆ تەنها ۲یان Yuan. نموونەیەکی تریشی ئەو گوێ بیستە گشتییە بوو کە سەبارەت رۆکێت هەڵدانی رەنگاورەنگ لە بۆنەکاندا (العـاب نارية) "Firework". کە لە بەهاری رابردوو قەدەغە کرابوون دوابەدوای رووداوێکی ئاگر کەوتنەوەی زۆر گەورە. بەڵام لە دەرئەنجامدا بڕیاری دەرکردنی یاسایەك درا کە مۆڵەت بەم جۆرە کارە بدرێت. لی دەڵێت ئەگەر حکومەت نەتوانێت لەگەڵ پێشکەوتنی یاساو رێسای تازە دەرکات و گوێ لە خەڵك نەگرێت ئەوا کێشەی گەورە دروستدەبێت. هەروەها دەڵێت دەبێت ئێمە زیاتر ماف بدەین بە خەڵك بۆ ئازادی گشت لایەك. دەبێت هەندێك تاقیکردنەوەی پێشکەوتوو لە دەرەوە بهێنین. ئەوەش وایکردووە کە شۆنگ کنگ ببێتە جێگای سەرنجی نیشتمانی. ٦٠ هەزار وتار و باس لەسەر ئەم شارە نووسراوە لە وڵات. لی دیاریون پێیگوتم کە سەرکردە بەرزەکان داوایان لێکردووم.

کە راوێژکاری بکەم بۆ سەرۆك هوجینتاو، "Hu Jintao" سەرۆك وەزیران وین جیاباو"Wen Jiabao" و بەرێوی سیاسی حیزب داوەتیان کرد تا باسێك پێشکەشبکات لە بارەگای حکومەت لە زهۆنگنا" Zhong nanhai" و ئەم تاقیکردنەوانە لە شارەکانی تری چین دووبارە دەبنەوە.

شۆنگ کنگ شارێکی زۆر گەورەیە، تەنانەت بە پێوەری چینیش یەکجار گەورییە دانیشتوانی بریتین لە ۳۰ ملیۆن مرۆڤ تاقیکردنەوە بێ هاوتاکەیشی لە راپرسی جێگای سەرنجی نیشتمانییە. بەڵام نومێد و نائیندمیەکی گەش سەبارەت بە راپرسی گشتی لە جیاتی هەڵبژاردنەکان زیاتر لەسەر ئاستی تاقیکردنەوەی نزمتر هەستیان پێدەکرێت، بە تایبەت لە شوێنەکانی کە زیاتر گونجاو و لەبارن لە بەشەکانی تری چین. لە هەمووشیان سەرنجڕاکێشتر ئەوە بوو کە لە شارۆچکەی زیگێوی سەربە پارێزگای وینگلینگ"Wenling" کە کەوتۆتە هەرێمی دەوڵەمەندی زهیچیانگ" "Zhejiean.

ئەوەی وایکرد کە راوێژکاری گشتی" Consultation" لە زیگیۆ"Zeguo" دەگمەن و بێ هاوتا بێت. نەك تەنها لە چین ، بەڵکو لە هەموو جیهاندا، ئەو تەکنیکە داهێنەرانە بوو کە ناویانتنا" دەنگدانی راوێژکاری" " Deliberative Polling" بۆ بڕیاردان سەبارەت بە خەرجە گشتییەکان. ئەم میتۆدە یان بیرۆکەیە هی زانایەکی سیاسی ستانفوردە بەناوی جەیمس فشکن" James Fishkin" کە لە بنەڕەتدا دامەزراوە بۆ ئەوەی یارمەتی دەسەڵاتدار و بڕیاردەرلن بدات ئەوەی راوێژکاری لەگەڵ هاوڵاتیان بکەن. ئەمەش گەڕانەوەیە کە بە جۆرێك لە دیموکراسی کە جیاوازە لە دیموکراسی رۆژئاوایی لە حیزبە سیاسییەکان لە کێبڕکێ دلن بۆ وەرگرتنی دەسەڵات، بەڵکو گەڕانەوەیە بۆ دیموکراسی کۆنی ئەسینایی " Ancient Athens".لە "ئەسینا" یۆنانی کۆن نموونەیەك لە خەڵك دەستنیشاندەکران بۆ بڕیاردان لەسەر مەسەلەی گرنگ کە بوو بوو بە بەشێك لە جموجۆڵییەکانی حکومەت. دەنگدانی راوێژکاری لە بنەڕەتدا دامەزراوە بۆ ئەوەی رێگا چارە بدۆزێتەوە بۆ ئەو تەنگوچەڵەمانەی دەسەڵاتدارانی وەك شۆنگ کنگ و زیگیۆ دووچاریان دەبنەوە. بەڵام لە لایەك ئەگەر راوێژکارییەك، رێکخەن وەك ئەوەی هی سۆنگ کنگ ئەوا تەنها ئەوانەی دەنگیان بەمرزە و زمان درێژن ئامادە دەبن کە ئەوانیش تەنها نوێنەرایەتی بەرژەوەندییەکانی خۆیان دەکەن مەرج نییە نوێنەرایەتی هاوڵاتیان بکەن. لە لایەکی تریش ئەگەر شۆنگ کنگ هەوڵیدا راستەوخۆ راپرسی بکات لە رێگای سەندوقی راپرسی گشتی راستەوخۆ، ئەوا بۆیان دەردەکەوێت کە هاوڵاتیان زۆر کەم دەزانن و ئاگادارن سەبارەت بە وردەکارییەکانی سیاسەتێکی دیاریکراو کە جێگای پرسیارو راپرسییە. لە دەرئەنجامیشدا خەڵك رەمەکی خەت بە یەکێك لە چوارگۆشەکاندا دەهێنن و شتێك هەڵدەبژێرن خۆشیان نازانن چییە؟

ئەمەش لە جیاتی هەڵبژاردنی چوارگۆشەی نازانم لە راپرسییەکە. راوێژکاری گشتی هەوڵدەدات ئەو گرێ ئاڵۆزانەی سیاسەت شیکاتەوە لە رێگای دەستنیشانکردنی رەمەکی بۆ ئەوەی نموونەیەك لە دانیشتوان هەڵبژێرن، دواتریش

لەگەڵ کۆمەڵێك شارەزا راوێژکاریان پێبکەن دواتریش داوایان لێدەکەن کە دەنگ بدەن و بریاری خۆیانی لەسەر بدەن. زیگیـۆ"Zeguo" ئـەم تەکتیکـەی بـەکار هێنـا بـۆ بریاردان لەسەر چۆنیـەتی سـەرفکردنی ٤٠ ملیـۆن یـوان"Yuan" بودجـەی گـشت. دووسەد و حەفتا و پێنج کەس رەمەکی هەڵبژێردران و داوەت کران بۆ بەشداربوون لەو بەرنامەیە کە ناونرابوو (دیموکراسی دڵ بـۆ دڵ). لـە بـری ئـەوەش بلیتـی پاسـی بـە خۆرایییان پێدان لەگەڵ (RMB ٥٠ ) کە دەکاتە (٣,٣٠$) (نزیکەی ٧ دۆلار). بـۆ هەر یەکێکیان. ئەم هاوڵاتیانەش رازی بوون لەسەر ئەوەی کە ئەم رۆژە لـەوێ بەسـەر بەرن و شارەزاکان باسی ٣٠ پرۆژەیان بۆ کردن کە بە نیاز بوون لە شارەکە ئـەنجامیان بدەن، هەر لە پرۆژەی ژێرابەکان و پارك و شەقام و مەیدانی گشتی شار.

لە کۆتایی رۆژەکەدا داوایان لێکرا کە تەنها دوانزدە پرۆژە هەڵبـژێرن کـە رەنگـە حکومەت هەوڵی دروستکردنیان بۆ بدات. دواتریش لیـسـتە کورتکراوەکـەیان خرایـە بەردەم کۆنگرەی گـەلی شـارەکە (حیـزب). ئـەوانیش رەزامەنـدیان لەسـەر تـەواوی لیستەکەدا.

هەتا ئێستاش ئاقیکردنەوەکەی زیگیۆ ئاقانەیە، بەڵام جەیمس فشکن" Fishin" و هی باوگانگ" He Baogang" ی زانای زانستە سیاسییەکان. کـە راوێـژیکاری حکومەت بوون بۆ سەرخستنی میکانزمی راوێژکاری، بروایـان وایـە کـە دیموکراسـی راوێژکاری رەنگە ببێت بە نموونەیەك و قاڵبێك بۆ چاکسازی سیاسی لە چین. ئەمـەش ئەوە نیـشاندەدات کـە حکومـەت بـەبێ ململانـێ و منافـسەی حیزبـی یـان بـەبێ دامەزراوی ناسلیی وەك ئەوەی لە رۆژئاوادا پیادە دەکرێت بتوانێت کـەم یـان زۆر بـە ئەندازەیەکی باش رێز لە بەها بنەرەتییەکانی دیموکراسی بگرێت و لە هەمان کاتیشدا راوێژکاری و یەکسانی سیاسی دابینبکات.

**سەروەری یاسا یان سەروەری مرۆڤ:**

پێشکەوتنێکی بەرچاو نەهاتۆتە دی لە بەهاکانی تری دیموکراسی وەك ئازادی رادەربڕین، ئازادی دامەزراندنی رێکخراوەکان، یانیش تەنانەت ئەوەی یان ویی کە زۆر بەگەرمی بانگەشەی بۆ دەکات، سەروەری یاسا بە درێژایی چەندین سەدە، عەرز و حاڵ نووسین بۆ دەسەڵاتدار جێگای سیستەمی یاسایی گرتبۆوە لە چین ئەمەش شێوازێکە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئیمپراتۆریەت. بەڵام تا ئەمڕۆش ئەم دیاردەیە هەر باوە و خەڵك زۆر بە بڵاوی پەنای بۆ دەبەن. کاتێك بە پێ گەڕامەوە دوابەدوای دیدارم لەگەڵ لی دیانگخون "Li Dianxun" لە بارەگای حکومەتی شۆنگ کنگ لە ساڵی ۲۰۰٦، رووبەڕووی خاتوو وانگ Wang هاتم، باشترین و جوانترین جلی لەبەر بوو، لەگەڵ جووتێك پێڵاوی بریقەدار و لێوەکانی زۆر بە ئاسکی سوور کردبوو، لەبەر ئەوەی ویستی کاریگەری لەسەر من جێ بهێڵێ گوتی بەیانی زوو لە خەو هەڵساوم هەروەك هەموو رۆژێك، بۆ ئەوەی چاوی بکەوێت بە فەرمانبەرە گشتییەکان بەر لەوەی بچن بۆ فەرمانگەی شارەوانی ئەو بەشێك بوو لە کۆمەڵێك فەرمانبەری بە تەمەن کە هەموویان جل و بەرگی چاکیان پۆشتبوو و راوەستابوون بەرامبەر دەرگای سەرەکی باڵەخانەکە. زۆربەیان بێزەر بوون کە پتر لە سی ساڵ خزمەتیان هەبوو، دواتر دەرکرابوون و تەنها ٤۰۰۰ رینمنبی (پارەی چینی) پێدرابوو وەك قەرەبوو. بەڵام ئەوان داوای پارەی زیاتریان دەکرد وەك خانەنشین هەروەها بە گشتی داوای مووچەیەکی گونجاویان دەکرد بۆ خانەنشینان. هەر هەموویان فایلەکانیان نیشانی من دەدا کە مۆری رەسمی پێوە بوو، ئەمەش نیشانەی ئەوە بوو کە گلەییەکانیان بە رەسمی دابوو بە حکومەت. هەندێکیان ماوەی چوار ساڵ بوو داوای قەرەبوویان دەکرد، کە بە بەردەوامی خۆپیشاندانیان لە بەردەم بارەگای شارەوانی ئەنجامدەدا. خاتوو وانگ سێ جار چوو بوو بۆ بەیگین بۆ ئەوەی عەرز و حاڵەکەی بدات بە حکومەتی ناوەندی. بەڵام بێ سوود بوو، هیچ وەڵامێکیان نە بە خۆی وتە بە ئەوانی تر نەدابوو. لەوە دەچێت دەسەڵاتداران زۆر ناڕەحەت نەبن بە ئەم جۆرە خۆپیشاندانە بچووکانە و کاریان تێناکەن.

نارەزایی دەربڕینەکەی وانگ تەنها یەکێکە لە ٢٥٠ کە رۆژانە لە چین بەرێوە دەچن ئامارەکانی وەزارەتی ئاسایشی گشتی ئەوە نیشاندەدەن کە ئەو جۆرە رووداوانەی کە ناونراون " رووداوی گەورە" کە مانگرتن و خۆپیشاندان و راگرتنی هاتووچۆ دەستبە سەرداگرتنی بالەخانە لە زیاد بووندان بە رێژەی دەجار. لە ماوەی تەنها دە ساڵدا، لە ١٩٩٣ دا ٨/٧٠٠ " رووداوی گەورە" هەبوو ، لە ساڵی ٢٠٠٧ ئەم ژمارەیە گەیشتە ٨٧/٠٠٠ خۆپیشاندانەکانیشی لە زیاد بووندان. لە ١٠ خۆپیشاندان لە ساڵی ١٩٩٠ بۆ زیاتر لە ٥٠ ئەمڕۆ . لە نیوەی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٥ دا حەڤدە خۆپیشاندان زیاتر لە ١٠/٠٠٠ کەسی لە خۆوە گرتبوو.هەمووشیان ئاشتی خوازی نەبوون و شەڕو پێکدادانی لێکەوتەوە. لە نیوەی یەکەمی ٢٠٠٥ دا ١٧٠٠ کەس بریندار بوون ١٠٠ کەسیش کوژران لە خۆپیشاندانەکاندا. هەر هەموو خۆپشاندانەکانیش لەبەر ناعەدالەتی و نایەکسانی کراون. زۆربەی داواکاریەکان بریتیبوون لە چاککردنی باری کرێکاران و شوێنی کاریان، مووچە و مووچەی خانەنشینی و قەرەبوو کردنەوە. راپۆرتێك کە لە ئەکادیمیای زانستە سیاسییەکان نیشانیداوە کە ٤٠ ملیۆن جوتیار و هەژار زەوی و موڵکیان لە لایەن دەوڵەت دەستی بە سەرداگیراوە بۆ ئەوەی، فرۆکەخانەو، جادە و شەقام و بەنداو و کارگە و مامەڵەی تایبەت بە زەوی و زار لەسەر دروستبکرێت. لە هەموو ساڵێکدا . جگە لەوەش دوو ملیۆنی تریش خانوو و موڵکیان لەدەستدەدەن بۆ رێگا خۆشکردن بۆ گەشەسەندن و دروستکردن کە زۆربەی جاریش قازانجی ئەم پرۆژانە تەنها بۆ بەرپرسە حیزبییەکانە.

لە وڵاتێك کە سیستەمی سیاسی بە گوێرەی نارەزووی دەسەڵاتداران بەرێوە دەچێت ئەم جۆرە گرفتانە زۆربەی جار لەسەر شەقامەکاندا لە شێوەی نارەزایی دەربڕین و خوپیشاندان چارەسەر دەکرێن. بەڵام لە ترسی گێرە شێوێنی و ئاژاوە، دەسەڵاتداران پەنا دەبەن بۆ بەر دیکتاتۆریەتی راوێژکاری " Deliberative Dictatarship". بۆ ئەوەی بتوانن بەسەر سیستەمی عەرز و حاڵ نووسیندا زاڵبن. بۆ چارەسەری گرفتەکان کە چینییەکان هەرلە سەردەمی ئیمپراتۆریەتەوە بەکار

دەهێنن بۆ لابردنی زوڵم: پان ویی چینییەکان هانیدەدات بۆ ئەوەی سیستەمی تاکەکەسی و حوکمی تاکە کەسی و بڕیاردان بە گوێرەی حەز و ئارەزوو بەرژەوەندی دەسەڵاتداران بگۆڕن بە حوکمی سەروەری یاسا و دەوڵەتی یاسا. هیواداریشە کە چین بتوانێت ئەمە بکات بە جیا کردنەوەی سیاسەت لە حکومەت و بە ڕاستیش سیستەمی فەرمانبەری مەدەنی"Civil Service" دامەزرێنن و دەزگایەکی پاکی دادوەری و دژە گەندەڵی پێکبهێنن. بەڵام کە پرسیاری لێ بکەیت کە چۆن ئەم هەموو گۆڕانکارییە شۆڕشگێڕیانە روو دەدەن. پان ویی هێشتا دڵنیا نییە.

هێشتا ڕێگایەکی زۆر ماوە بۆ چین تا بگات بە قۆناغی دەوڵەتی یاسا. هەتا پارتی کۆمونیست لە دەسەڵات بێت و لە سەرووی یاسا بێت. خەونەکانی پان ویی زەحمەتتر دێنە دی. بەڵام سەرەڕای ئەمەش پان ویی رەنگە بتوانێت بڵێت گۆڕانکاری روویداوە. چین تاکە وڵاتی تاکە حیزبە کە ڕێگای داوە بە هاوڵاتیان لە دادگاکاندا شکایەت لە حکومەت بکەن. پێنج ساڵ بەر لە ئەمڕۆ تەنها ۱۰/۰۰۰ شکایەت هەبوو دژ بە حکومەت، بەڵام ئەمڕۆ لە ماوەی یەك ساڵدا بۆتە ۱۰۰/۰۰۰ کەیس. ڕێژەی ئەو کەیسانەی کە خەڵك دەیانبەنەوە لە زیاد بووندان.

ڕێژەی کەیسە بردراوەکان دژ بە حکومەت دەگاتە ٤٠٪. بە گوێرەی پان ویی جۆری گوێ گرتنە لە ناو هۆڵەکانی دادگا وردە وردە بەرەو باشی دەڕوات: پانزدە ساڵ لەمەوبەر زۆربەی داوەرەکان پێکهاتبوون لە ئەفسەرو بەرپرسە خانەنشین کراوەکان بوون. بەڵام ئەمڕۆ هەر هەموویان شارەزایی یاساییان هەیە.

لەوە دەچێت حکومەت هەستی بەوە کردبێت پێش خستنی دامەزراوەکان کە پەیوەندیدارن بە مامەڵە کردن لەگەڵ شکایەت و گازاندەی خەڵك هۆکارێکی سەقامگیرییە ئەگەر سیستەمێکی یاسایی هەبێت بۆ بە دواداچوونی ستەمکاری و زوڵم، ئەوا هاوڵاتیان قەرەبوو دەکرێنەوە ئەگەر مافیان خورابێت یان زوڵمیان لێکرا بێت." Flaxible approch" . بۆ گوێ گرتن لە گلەیی ڕاستی و قەرەبوو کردنەوەی زەرەرمەند، لە هەمان کاتیشدا سزا دانی خەتاکار، یان بەرپرسان. سەرکردە

بەرزەکانی وڵات چەندین جار تەدەخولیان کردووە لە چەند کەسێکی گرنگ. بۆ نموونە لە مانگی چواری ٢٠٠٥ سەرۆك وەزیران خۆی تەدەخولی کرد بۆ ڕاگرتنی دروستکردنی بەنداوێك لە ڕووباری نوجیانگ "Nujiaung" زهی جیانگ "Zhejiang" کرێکاران ڕێگایان پێدرا کە بە بەشداری لەگەڵ خاوەن کارەکان ڕاستەوخۆ مفاوزات بکەن. لە ینچوان "Yinchuan" مانگرتنی شۆفێرەکانی تاکسی بە جۆرێك چارسەر کرا کە حکومەت شۆفێرەکانی ڕازیکرد و بوو بە جێگای سەر سوڕمانی گشت لایەك. هەتا ئەمڕۆ خۆپیشاندان و ناڕەزاییەکان لەسەر ئاستی هەرێمەکان بوون. سەرۆك هیوجینتاو و سەرۆك وەزیران و ین گیاباو توانیویانە خۆیان لە ڕەخنە و سەرزەنشت بپارێزن بەوەی داکۆکی لە بەرپرسە گەندەڵەکانی هەرێمەکان نەکەن، لەوەش زیاتر پاڵپشتی خۆیان بۆ خەڵکی ئاسایی و ساف خوراو دەردەبڕن. بەڵام ئەمە ڕەنگە لە داهاتوودا زۆر ئاسان بێت.

## یاسای گۆ سەروەر بێت؟

ئەو گفتوگۆیەی سەبارەت بە چاکسازی سیاسی لە ئارادیە، هەروەك ئەوەی سەبارەت بە ئابووری وادەکات هەندێك جار چەپی تازە لەگەڵ ڕاستی تازەدا دووچاری ڕووبەڕوو بوونەوە بێت. هەر چەندە هەندێ ئەندامی ڕاستی تازە بە تەواوی بڕوایان بە دیموکراسی هەیە، بەڵام هەندێکی تریان هەموو تواناى خۆیان چڕ کردۆتەوە سەر بانگەشە کردن بۆ دەوڵەتی یاسا و سەروەری یاسا، ئەمەش بۆ بچووك کردنەوەی قەبارەی دەوڵەت، هەروەها کەمکردنەوەی کاریگەری لەسەر بازاڕ. لە لای چەپیشەوە پشتگیرییەکی زۆر هەیە بۆیە بۆ ئەنجامدانی هەڵبژاردن وەك ڕێگا چارە بۆ زیاد کردنی شەرعییەتی حکومەت بۆ هەنگاونان بەرەو دووبارە دابەشکردنی داهاتی وڵات.

ئەوان مەترسی ئەوەیان هەیە کە دیکتاتۆریەتی ڕاوێژکاری ببێتە هۆی هەژاری و نموونەیەکی نیستهلاکی سیاسی.

وانگ هیوو Wang Hui دەڵێت، جێ بە جێ کردنی ئەجنێدای سیاسی چەپی تازە ئێستەمە بەبێ ئەنجامدانی چاکسازی لە ئاستێکی فراوانتر، چونکە دەوڵەمەندە تازەکانی چین دەستیان بە قورگی سیاسەتەوە گرتووە. تۆ پێویستیت بە دیموکراسی هەیە بۆ بەهێز کردنی دەوڵەت بۆ ئەنجامدانی کز کردنەوە و سەپاندنی باج تا بتوانێت پێویستییە گشتییەکان جێ بەجێ بکات. لە ساڵانی نەوەدەکاندا ۱۹۹۵ دابەشبوونێکی زەق هەبوو لە نێوان بازاڕی ئازاد و دەوڵەتی داپڵۆسێنەر. خەڵك وایان دەزانی کە چاکسازییەکان کاریگەریان هەیە و ئەمەیش دەبێتە هۆی روودانی چاکسازی لە دەوڵەت. بەڵام ئەمڕۆ بۆمان دەردەکەوێت کە زۆربەی ئەو گیروگرفتانەی کە رووبەڕوویان دەبینەوە لە ئەنجامی چاکسازیی ئابوورییەوە سەریان هەڵداوە و پێویستیان بە چاکسازی سیاسییە بۆ راست کردنەوەیان.

پان وی Pan Wei کە زیاتر هاوسۆزی راستی تازەیە، دان بەوەدا دەنێت کە پابەند بوونی ئەو بە دەوڵەتی و سەروەریی یاسا رەنگدانەوەی ئەجنێدای بازاڕی ئازادە. کە دەڵێت دیموکراسی سەرچاوە لە هەڵبژاردنی سەرکردەی باشەوە هەڵدەگرێت. لە کاتێك دەوڵەتی یاسا سەرچاوەی بڕواو متمانە بە کەس ناکات. بڕوا بە هیچ دەسەڵاتدارێك ناکات. کەواتە لە پان وی بەردی بناغە بریتییە لە حکومەتێکی زۆر بچووك کە گرنگترین ئەرکی بریتی دەبێت لە جێ بەجێ کردنی یاسا نەك دەرکردنی (تشریع). چونکە دەرکردنی یاسا دەبێتە کارێکی زۆر ئەستەم لەبەر چاودێری و کەم دەسەڵاتی.

لە لایەکی تر وەك هیوو Wang Hui دەڵێت دەوڵەتی یاسا بەبێ دیموکراسی بێ مانایە هەموو ساڵێك کۆنگرەی خەڵك (پەرلەمان) سەدان یاسا دەردەکات کە هیچ کاریگەریان نییە: ئێمە هەموومان دەوڵەتی یاسامان دەوێت. بەڵام گوێ لە کام یاسا دەگرین و کامیان جێ بە جێ دەکرێن. تەماشای یاسای کارو یاسای مافی موڵکایەتی هزری بکە. هەردوو یاسا ■ ساڵ دەبێت دەرچوون بەڵام سەبارەت بە یاسای کار هیچ شتێك روونەداوە، لە هەمان کاتدا یاسای موڵکایەتی هزری هەموو شتێك روویداوە. بەبێ بەشداری و هەماهەنگی گشتی تەنها گوێ بۆ یاسا و بەرژەوەندی سەرمایەداری

گرێت. ئەگەر تەماشای بکەین چینی ناوەند لە چین زۆر بە پەرۆشی دیموکراسی نین نموەك ببێتە هۆی لە دەستدانی سەروەت و سامان و دەسەڵاتیان.

## زانست و دیموکراسی:

زۆر لە چاودێرە سیاسییەکان باس لە سیاسەتی چین دەکەن وەك ئەوەی لە ٣٠ ساڵی رابردوودا لە فریزەر هەڵگیرداببێت لەو کاتەی کە هەموو دەورو بەرەکەی گۆڕانی بەسەردا هاتبێت. بەڵام راستییەکە ئەوە کە سیاسەتی چین بە هەمان ئەندازەی گۆڕانکارییە ئابوورییەکانی گۆڕانکاریان بەسەردا هاتووە، بەڵام بە ئاراستەیەکدا کە بە پێچەوانەی ویست و ئارەزووەکانی رۆژئاوا بێت. رۆژئاوا چاوەڕوانی سیستەمێکی لیبرال دیموکراتی بوو لە چین، بەڵام ئەو سیستەمەی کە لە چین دروستبوو دیکتاتۆریەتێکی زۆر ئاڵۆز و جیاواز بوو.

وەنگ شاوگوانگ Wang Shaoguang دەڵێت سیاسەتی ئەمڕۆی چین زۆر جیاوازە لە سیاستی سەردەمی ماوزیدونگ و دینگ خیاو پینگ. ئەو سەردەمە بە سەرچوو کە تاکە سەرکردەیەك بەبێ گەڕانەوە بۆ هیچ کەس و لایەنێك بە سەرچوو، بڕیاردانی سیاسی ئەمڕۆ لە ژێر کاریگەری بیرو بۆچوونی شارەزایان و میدیا و رای گشتین (ئەمەش لە رێگای راپرسیدا ئەنجامدەدرێت). بۆ نموونە وین جیاباوۆی سەرۆك وەزیران رێگەی بە زیاتر لە ١٠٠ دەزگا و دامەزراوەی ئەکادیمی دا بۆ سازدان و ئامادە کردنی یانزدەهەمین پلانی پێنج ساڵ، ئەم دەزگایانەش بەرپرس و ئەندامانی بەشە جیاجیاکانی هەردوو حکومەتی ناوەندی و هەرێمەکانی لەخۆ گرتبوو. پارتی کۆمونیست بەم کارە دەڵێت زانست و دیموکراسی، بەڵام لە رۆژئاوا رەنگە پێی بڵێن تەکنۆکرات "Technocratic" چونکە زیاتر رێگاو هێز بە شارەزایان دەبەخشێت لەوەی بە رای گشتی و سەرکردە سیاسییەکان.

بەشێکی کەم لەم گۆڕانکاریانە لە لایەن چاودێرە رۆژئاواییەکان هەستیان پێکراوە. وەنگ شاوگوانگ دەڵێت: دەزگا شیکەرەوەکانی رۆژئاوا "Analytical"

ناتوانن بە تەواوەتی لەو گۆڕانکارییە سیاسییانەی بگەن. لە دەیان ساڵی رابردوودا تیروانینی چاودێران و شیکەرەوە سیاسییە رۆژئاواییەکان زۆر دواکەوتوو بووە چونکە ئەوان هەر لە سەردەمی دوا پاشای چینییەوە تا ساڵە بەرایییەکانی سەردەمی کۆماری و سەردەمی میر و بازرگانانی شەڕ و جیانگ جیشی "Jiang Jieshi" و ماوزیدۆنگ و جیانگ زەمین بەیەك چاو تەماشای سیاسەتی چینیان دەکرد. سیاسەتی چین لەو ماوەیە دوور و درێژەدا دونیای گۆڕی، کەچی مۆرە کۆنەکەی هەر پێوەماوە.

هۆکاری ئەوەی کە تەنها ژمارەیەکی لە رۆژئاواییەکان هەستیان بە گۆڕانکاری سیستەمی سیاسی لە چین کرد دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی کە چاکسازییەکان بە رێڕەوی پاراستنی سیستەمی تاك حیزبی بوو، لە جیاتی باوەشکردنەوە و پیادە کردنی سیستەمی لیبراڵ دیمۆکراسی. تیۆرستە رۆژئاواییەکان خەریکن پاشگەز دەبنەوە لە حەقیقەتی دیموکراسی بوونی چین. هەندێکیان دەڵێن هەرکات GDP سەرجەمی داهاتی نەتەوەیی چین گەیشتە ٦٠٠٠ دۆلار ئەوا چین دەبێت بە وڵاتێکی دیموکراسی. هەندێکی تریش دەڵێن دروستبوونی چینی (طبقة) ناوەندی لە کۆمەڵگای چینی دیموکراسیەت دەکات بەشتێکی حەتمی. گروپێکیش کە وڵ هەتن Will Hutton زمان حاڵیانە دەڵێن پێویستە پراکتیکییەکانی ئابووری مۆدێرن لە (لێپێچینەوەی ئازاد، ئازادی زانیاری، سەروەریی و دەوڵەتی یاسا) بەم زوانە وا لە چین دەکات بە ناچاری خۆی یەکلا کاتەوە، یان ئیفلاس یانیش دیموکراسی هەڵبژێرێت. لە کۆتاییشدا قوتابخانەیەکی فکری تر هەیە کە دەڵێن بووژانەوەی کۆمەڵگای مەدەنی دەبێتە هۆی ئازاد بوونی سیاسی.

ئەم تیۆرانە رەنگە لە مەودای دوور راستبن، بەڵام پێدا گرتن لەسەر ئەوەی کە گۆڕانکارییە سیاسییەکان دەبێت بە رێڕەوێکی دیاریکراودا بڕوات وای لە زۆر لە چاودێران کردووە کە ئەو هەموو گۆڕانکاریانەی چین بەسەر سیستەمی سیاسی خۆیدا هێناوە نەبینن. دوای ٣٠ ساڵ لە چاکسازی چین توانی پێشکەوتنی جێگیر و دروستکردن و دامەزراندنی سەروەریی و دەوڵەتی یاسا بە ئەنجام بگەیەنێت و

گۆڕانکاری و تازە کردنـەوە و بـە پرۆفیـشنالکردنی "Proefessionaliziation" کارمەندە میرییـەکان بکات "Civil Service"، بـەڵام زۆر بـە کـەمی بنـەماکانی لیبراڵ دیموکراسی پیـادە کـردووە. لـەوەش گـرنگتر دەسـەڵاتدارانی دوابـەدوای هـەر چاکسازییەك زیاتر لە دەسەڵاتەکانی پارتی کۆمۆنیستی فەرمانڕەوا کـەم دەکەنـەوە و زیاتر چوار دەوری دەدەن. ئەم راستییانەشمان بە زەقی بۆ دەردەکـەوێت کاتێـك باسـی ئەنتەرنێت دەکەین. ئەنتەرنێت یەکێك بوو لەو هێزانەی گۆڕانکاری چینیان مـسۆگەر کرد. بەڵام لە راستیدا چین ئینتەرنێتی گۆڕی، وای لە کۆمپانیا زلەکانی وەك گوگل و مایکرۆسۆفت کرد بە گوێرەی مەرج و پرەنسیپەکانی چین کارو یاری بکەن.

زۆربەی دیکتاتۆر و سیستەمەکانیان ئینتـەرنێت وەك بارومـەتری کـەش و هـەوا دەبینن، لە کاتی باران بارین خۆیان دادەپۆشـن، بـەڵام تـاتوانن کۆنترۆڵیـان بـە سـەر وەرزەکاندا هەبێت. بۆ نموونە هەر کاتێك وێب سایتەکانی زێمبابۆی رەخنە ناڕاستـەی رژێمی حوکمی رۆبەرموگای بکەن دادەخرێن، هەروەك ئەوەی لـە کـاتی بـاران بـارین چـەتر هەڵـدەیت، بـەڵام ئـەم جـۆرە هەڕەشـەیە نابێتـە هـۆی رێگـە گـرتن ١٠٠٪ بڵاوبوونەوەی هەواڵ زانیاری بۆ دەرەوەی وڵات، هەروەها بە پێـچەوانەشەوە. بۆرمـا و ڤێتنام و ئێران و تونس هەوڵی زۆریاندا بـۆ دروسـتکردنی دیوارێـك بـە چـوار دەوری وڵاتەکەیان، بەڵام هەوڵەکانیان وەك بێژینگ وان نـەك دیـوار. عەرەبـستانی سـعودی سـەرکەوتوو تـرە لـەم هەوڵانـە، هـەموو هێڵـەکانی ئەنتـەرنێت بـە یـەك سـەنتەر بەستراوەتەوە، هەر وێب سایتێك کە لەگـەڵ بـیرو باوەڕەکانیـان نـەگونجێت قەدەغـەی دەکەن و بە ئانیـسلامی لە قەڵەمی دەدەن. بەڵام چین ٦٠ جار لە عەرەبستانی سعودی گەورەترە، رێژەی بەشـدار بـوونی ئەنتەرنێتیـشی یـەکجار زۆرن و کـۆنترۆڵ کردنیـان ئەستەمە، سەرەڕایی ئەوەش بەچین بە چاکی سازو ئامادەیە و رووبەڕووی ئـەم گرفتـە بۆتەوە بە پارە و مرۆڤ و تەکنەلۆژیا، ١٠٠ هەزار پۆلیان هەیـە کـە کـار و پیـشەیان بریتییـە لە چاودێری کردنی نێت. تۆری ئەنتەرنێت، هەندێك سایتیـان قەدەغە کـردووە و ژمارەیەکی زۆریشی لە ئیمەیل رادەگرن. رەنگە ئـەم ژمارانـە زێـدە رۆییـان تیـادا

کرابێت، بەڵام زانایانی کۆمپیوتەر لەسەر ئەوە کۆکن کە چین بەلانی کەم چوار جۆر فلتەرو فایەرۆلی بەکار دەهێنێت"Firewall".

دوای ئەم سەرنجانە بۆمان دەردەکەوێت کە وڵاتی چین بەو سانسۆرە بەهێزەی هەیەتی و لە رێگای" دیواری مەزنی ئاگرین" (بۆ چاودێری کردنی ئەنتەرنێت) توانیویەتی چین بپارێزێت. بەڵام ئەو لە یەکچوونە زۆرەی نێوان چینی ئەمرۆ و رووسیا و وڵاتانی ئەوروپای رۆژهەلاتی سالانی ١٩٨٠ تووشی هەڵەمان دەکات، چونکە حکومەتەکانی بلۆکی یەکییەتی سۆڤیەت و دام و دەزگاکانی پروپاگەندەیان هیچیان پێ نەدەکرا بەرامبەر ئەو وێنە جوان و رەنگا و رەنگانەی رۆژئاوا بلاوی دەکردنەوە سەبارەت بە ژیانی خۆشگوزەرانی رۆژئاوایی. چین لە لایەکی تر بەشێکە لە جیهانی سەرمایەداری. چین لەزانیاریدا نقوم بووە و پڕە لە کالاو هەتا گەردەنیش کەوتۆتە نێو بلقەکانی کۆمەڵگای خەرجکەر"Consumer Society".

ساڵ بە ساڵیش ژمارەی ئەوانەی سوود لەم خزمەتگوزارییانە وەردەگرن زیاتر دەبن.

هەر کاتێك ببێتە هۆی هەرەشە یان بنکۆڕ کردنی رژێمی سیاسی لە چین زۆر بە توندی بەرپەرچ دەدرێتەوە لە لایەن دەسەڵاتدارانەوە. ئەو کۆمپانیایانەی خزمەتگوزاری ئینتەرنێت دابیندەکەن سانسۆر و چاودێرییەکی زۆر توندیان هەیە لەسەر بابەتە سیاسییەکان، بۆ نموونە ئەم بابەتانە قەدەغەن و بلاو ناکرێنەوە: هەر بابەتێك لەسەر تایوان، تبت، مەیدانی تیانیانمین و هەر رەخنە گرتنێك لە پارتی کۆمۆنیستی فەرمانڕەوا، یان هەر بابەتێك لەسەر گرووپی ئایینی فلوان گۆنگ " Falun Goug". ئەم هەوڵانە بۆ ئەوە نییە تا چین لە جیهانی دەرەوە بپچڕێت، بەڵکو بۆ ئەوەیە تا لە نرخ و توانای جیاوازی و ملمڵانێی سیاسی کەمبکەنەوە یانیش نەیهێڵن. بۆ نموونە گوگڵ پێیوایە کە تەنها ٢٪ ئەنتەرنێت سانسۆر دەکرێت.

دەسەڵاتدارانی چین زۆر بە لایانەوە گرنگ نییە چ جۆرە زانیارییەك دێتە ناوەوەی چین، بەڵام مەترسییەکی زۆریان هەیە لە راگۆزینەوە و قسەکردنی خودی چینییەکان

لەگەڵ یەکتر. یاساکانی ئازادی پێکهێنانی کۆمەڵە و ڕێکخراوەکان زۆر دڕندانەیە لەم وڵاتە. ڕێکخراوە خێرخوازی و کۆمەڵە ئایینی و یەکیەتییەکان لە ژێر چاودێرییەکی زۆر توندوتیژ و ناو، بە ناوەش قەدەغە دەکرێن. ئەو توند و تیژییەی کە پارتی کۆمۆنیستی فەرمانڕەوا دژ بە ڕووەکییەکان و Herbivorous میانڕەوەکانی فلوان (Falun Gong) بەکاری هێنان چاودێرە سیاسییەکانی جیهانیان تووشی سەرسوڕمان کرد. بەبێ لەو ئاترسێت کە لە کۆبوونەوەکان باسی چی دەکەن، بەڵکو تەنانەت خودی کۆبوونەوەمەترسییەکی زۆر گەورەیە بۆ دەسەڵاتداران. مێژووی شۆڕشە چینییەکان کە لە لایەن ڕێکخراوە ئایینییەکان ڕێکخرا بوون وای لە حکومەتەکانی چین کردووە کە زۆر وریابن و لە هەر جموجۆڵێکی لەم جۆرە بترسن. لە وڵاتێك کە کۆبوونەوەی سیاسی تیادا قەدەغەیە، گەورەترین مەترسی دەسەڵاتداران، بریتییە لە بەکار هێنانی ئەنتەرنێت بۆسازدانی کۆبوونەوە و ناڕەزایی دەربڕینی گەورە.

دیواری مەزنی ئاگرین پڕە لە کوون و درز، کاتێك نوێترزسیونی بەرهەڵستکار مایکل ئانتی Michael Anti داخرا، هەموو بابەتەکانی کۆپی کران و لە چەندین سایتی تر بڵاوکرانەوە. ژمارەیەکی زۆریش لە چینییەکان پەنا دەبەن بەر جیهانی دیجیتاڵ و وێنە و بابەت لە مۆبایلەوە بۆ موبایل دەگوازنەوە و بڵاودەکەنەوە. یانیش وەك Attachmeats لە ڕێگای ئیمەیلەوە بڵاویان دەکەنەوە و بەمەش لە دەست سانسۆر ڕزگاریان دەبێت. بەشێکیشیان نامەی کۆددار دەنووسن. بەڵام تا ئەمڕۆش حکومەت تازەترین تەکنەلۆژیا بەکار دەهێنێت بۆ سەر کوتکردنی هەر بەرهەڵستکارێك و بۆ درێژە دان بە ماوەی دەسەڵات و خۆ گونجاندن لەگەڵ گۆڕانکارییە تازەکان.

## ئایا دیکتاتۆریەتی راوێژکاری ئەلتەرناتیڤێکی راستەقینەیە؟

گەورەترین پرسیار ئەوەیە ئایا پارتی کۆمۆنیست دەتوانێت بەردەوام بێت لە خۆ گونجاندن و گۆڕاندا؟ ئایا دەتوانرێت بسەلێنرێت کە دیکتاتۆریەتی راوێژکاری ئەلتەرناتیڤێکی راستەقینەیە بۆ دیموکراسی لیبڕالی؟ زۆر بە دڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین دەسەڵاتداران بە نیازن هەموو داهێنانێکی سیاسی تاقیبکەنەوە.

لە پینگچانگ Ping chang ئامادەن کە رێگە بە پرۆسەی دیموکراسی لە نێو ریزەکانی حیزب بدەن. لە چۆنگ کینگ Chongqing یش وازیان لە هەندێك دەسەڵات هێنا لە قازانجی دادگاکان بۆ رێگەدان بۆ بیستنی رای گشتی. لە زگیۆZeguo حکومەتێکیان پێکهێنا کە هەمیشە گوێ لە راو بۆچوونی خەڵك دەگرێت سەبارەت بە مەسەلەی گرنگ. وا پێدەچێت کە هێڵە گشتییەکانی چاکسازی لە چین لە هیچ کاتێك مەترسی لەسەر پاوانکردنی دەسەڵات پارتی کۆمۆنیستی فەرمانڕەوا قبووڵ ناکرێت. گرنگیش نییە ئ ناوێکی لێدەنێت بە مەرجێك ناوی لیِ نەنێت هەڵبژاردنی گشتی .

ئایا دەسەڵاتێکی سەرکوتکەری بە دەنگ داواکارییەکانی خەڵکەوە هاتوو دەتوانێت گەشە بکات و بگۆڕێت بۆ حکومەتێکی شەرعی و جێگیر؟ هۆکاری دارِمانی ئابووری پلاندانراوی سۆڤیەتی دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی پلاندانەرەکان توانای کۆ کردنەوەی زانیاری راست و دروستیان نەبوو بۆ دەستنیشان کردنی سەرچاوەی گونجاو و قازانج بەخش بۆ زیاد کردنی بەرهەمهێنان و دەوڵەمەند بوون و هاندانی خەڵك بۆ خۆشگوزەرانی و ژیانێکی باشتر.

هەر چەندە کۆمەڵگا پێشکەوێت ئاڵۆزتر دەبێت، ئەمەش وادەکات بەرژەوەندییەکانی گروپەکانی ناو کۆمەڵ ئاڵۆزتر دەبێت کە دەرئەنجامەکەیشی بار گرژی و رووبەڕوو بوونەوەیە چونکە بەرژەوەندییەکانیان جیاوازن لە کۆتاییشدا سیستەمی سیاسی ئەخشە کێشراو تووشی گرفتی زۆر گەورە دەکات. بەڵام ئایا تەکنەلۆژیای تازە دەتوانێت باشترین زانیاری سەبارەت بە مەزاجی خەڵك پێشکەش بە سەرکردەکان بکات؟ لە وەڵامدا رەنگە بتوانین بڵێین بەڵێ ئەویش لە رێگای، راپرسی، راپرسی سەر ئەنتەرنێت و گوێ گرتنی گشتی رەنگە بین بە یارمەتیدەری دەسەڵاتدارانی بەچین تا ئاگاداری مەزاجی خەڵك بن.

هەرچەندەی چین تالۆزتر دەبێت ئەوا بەم جۆرەش بەرژەوەندی هەژاران رووبەرووی دەوڵەمەندە تازەکان دەبێتەوە، دانیشتوانی شار لەگەڵ دێ، خاوەن پیشەکان (سەهم) لەگەڵ فەرمانبەران زۆر سەختە بتوانێت هەموو کەس رازی بکەیت لە هەموو کات. لەم جۆرە کەش و هەوایەدا بڕیاری شەرعی و بەجێ لە لایەن حکومەت کە دۆڕاو و براوەکان قەبووڵی بکەن نەستەمە. هەڵبژاردنی دەستنیشانکراو (Deliberative Polls) وەك ئەوەی زیگۆ Zeguo کە ۲۷۵ کەس لە کۆی ۱۲۰ هەزار کەس بەشداریان تێدا کرد بوو بە شەرعی لە قەڵەم دەدرێت؟ رەنگە لە دوارۆژدا دەوڵەتی چینی تاکە حیزبی برووخێت، بەڵام وادیارە لە ماوەی نزیك رژێم خۆ دەگونجێنێت و رێگاو تەکنیکی زۆر تالۆز بدۆزنەوە بۆ بەردەوام بوون لە دەسەڵات بە هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی رێگا چارەیەك بۆ گرفت و نەهامەتییەکانی خەڵك.

هە ریژیش حکومەتی چین زۆر پراگماتیانە مامەڵە لەگەڵ داخوازییەکانی خەڵك دەکات و بە پەیڕەوە دەچێت و چارسەریان دەکات. لە هەمان کاتیشدا سوودێکی زۆر لەو رەخنانە وەردەگرێت کە ئاراستەیان کراوە بە دواداچوون و لێکۆڵینەوەیان لەسەردا دەکات بۆ چارەسەر کردنی خاڵە لاوازەکان. بۆ نموونە هەرکات راپۆرتێك یان لێکۆڵینەوەیەك سەبارەت بە رووخانی سیستەمی تاك حیزبی چین بنووسرێت و بڵاوبکرێتەوە ئەوا دەستبەجێ چینییەکان لێکۆڵینەوەی خۆیان لەسەر هەمان بابەت ئەنجامدەدەن. پارتی کۆمۆنیستی دەسەڵاتدار سوودێکی یەکجار زۆر لە تاقیکردنەوەی دیموکراسییەتە پێشکەوتووەکان وەردەگرێت و هەمیشە بە دوای میکانزمی تازە و گونجاودا دەگەرێن بۆ درێژەدان بە تەمەنی سیستەمی تاك حیزبی چین، بەڵام هیچ سوود لە تاقیکردنەوەی رژێمە سەرکوتکەرەکان نابینن. چین توانیویەتی مانای جیهانگیری بگۆڕێت بە سەلماندنی ئەوەی کە رژێم و سیستەمی تاکە حیزبی و سەرکوتکەر توانای ئەنجامدانی گەشەسەندنی ئابووری هەیە. لە داهاتووشدا رەنگە لە رێگای نموونەی دیکتاتۆریەتی راوێژکاری بسەلمێنن کەدەوڵەتی تاکە حیزبی دەتوانێت سەقامگیری دابینبکات.

# بەشی سێیەم
## هێزی نیشتمانی سەرتاسەری
## "Comperhensive National powe r"

سروشت بووژانەوەی چینی مسۆگەر کردووە. لە دوو هەزار ساڵی رابردوو چین چەندین جار بووە بە دەوڵەتێکی مەزن "Super Powev" . تەنانەت لەم دواییانەشدا لە ساڵی ١٨٢٠ تەنها بیست ساڵ بەر لە شەڕی ئۆپیۆم"Opium" ئەو ساڵ چین ٣٠٪ لە GDP جیهانی پێکدەهێنا. ئەم جۆرە مێژووە وایکردووە خەڵکی چین زۆر شانازی بکەن بە رابردووی خۆیان لە لایەك، لە لایەکی تریش زۆر ناڕەحەتن لە رۆڵی چین لەسەر ئاستی جیهانیدا لە حاڵی حازردا. ئەمڕۆ خەڵکی چین واهەستدەکەن دەبێت ئەم هەڵەیە چاکبکەنەوە و چین رۆڵی شیاوی خۆی ببینێت لەسەر ئاستی جیهاندا. یان جیوتونگ لە کتێبی بووژانەوەی چین بە چاوی چینییەکان.

Yan Xuetong "The Rise af china in chinese Eyes"

لە ژێر سێبەری کۆشکی هاوینەی پڕ رەمزو هێما کە دەکەوێتە باکووری خۆرئاوای بەیگین، چاوت دەکەوێت بە قوتابخانەی حیزبی پارتی کۆمونیستی ئەم خەڵوەتگە ناو خۆییەی کە تا ساڵی ٢٠٠٢ لە لایەن هیو جینتاوز Hu Jintao بەڕێوە دەبرا بەر لەوەی سەرکەوێت و ببێت بە سەرۆك. ئەم قوتابخانەیە ئاخنراوەی بە ئایدۆلۆژی رەحی دەوڵەت و حیزب، بەرپرسە لە بیروباوەڕی حیزب و وەك (وحی) وایە لەسەر حیزب. هەر لێرەش سەرکردەکانی داهاتووی حیزب دەستنیشان و ئامادە دەکرێن.

بەر لەوەی کادیرەکان تەرفیع بکرێن و بەر پرسیاریەتی زیاتریان پێ بدرێت دەبێت بەشدار بن لەو کۆرسەی کە ١٠٠ رۆژ دەخایەنێت کە بە جۆرێك دارێژراوە بۆ ئەوەی پارتی ئایدۆلۆژی ئەم کادیرانە شەحن بکرێتەوە.

قوتابخانە کە زۆر" زەخمە" یەکجار جوان و قەشەنگە لە رووی تەلارسازییەوە. پێکهاتەیەکی سەیرو تێکهەڵکێشە لەگەڵ چاکسازییە سیاسییەکانی سۆسیالستی. شەقامەکانی پڕ دارو درختی گەورە و جوانن ئەو باڵەخانەی کە ئاهەنگی دەرچوونی تێیدا دەکرێت.

لە تەنیشت چەند باڵەخانەیەکی ترە کە لە بالکۆنییەکانیانەوە ژمارەیەکی زۆر پەرۆك و ئالاَ شۆڕ کراونەتەوە.

لەسەرەتای ساڵی ٢٠٠٥ لە یەکێك لەو ژوورانە دانیشتبووم، چوار دەوردرا بووم بە هەندێك لە ژیرترین بیرمەندی سیاسەتی دەرەکی چین، کە تەماشای پاوەرپوینیتی یان دەکرد "Pawer Point" کە لە لایەن ئابووری چەپی تازە هیو ئانگانگ" Hu Angang" ئامادە کرابوو و پێشکەشدەکرا. ئەم شوێنە وەك ئیسفەنج وایە کە حکومەت بیرو بۆچوونی سەرجەم بیرمەندەکانی سەرتاسەری وڵاتی لێوە وەردەگرێت و هەڵیان دەڵێنجێ. هەر لێوەش گفتوگۆ لەسەر زۆربەی مەسەلە گرنگەکان دەکرێت لە لایەن ژیرترین عەقڵی چین. بەڵام ئەوەی تازە بوو و جێگای سەرنجێکی زۆر گەورە بوو کە حکومەت بۆ یەکەمین جار بڕیاری دابوو کە شارەزایانی سیاسەتی بیانی داوەتبکات بۆ بەشداریکردن لە گفتوگۆکان، منیش لەگەڵ نێودەرزەن لێکۆڵەرە نێودەوڵەتییەکان کە زۆر بە وردی هەڵبژێردرابوون خۆمان لە قوتابخانەی حیزبی پارتی کۆمونیست دۆزییەوە"ccqps " لە ژێر دروشمی" چین و جیهان و ستراتیجیەت و رۆڵی هێز" . گفتوگۆکە لە لایەن لی جونرو Li Junru کە جێگری سەرۆکی قوتابخانەکەیە و زمانحاڵ و توێژەری بیرو باوەڕی حیزبە. بەم وشانە گفتوگۆکەی دەستپێکرد" قوتابخانەی حیزبی جێگای سەرسوڕمانە، بەڵام ئەمڕۆ بە رووی هەموو جیهان کراوەتەوە. ئەمەش بە کاتێك و رووداوێکی زۆر گرنگ تۆمار دەکرێت لە مێژوومانیدا.

**هێزی نیشتمانی سەرتاسەری:**

چین رەنگە خۆی سکرترین هێزی گەشەسەندوو بێت لە مێژوودا.زۆر سەختە بتوانین خەیاڵ بکەین کە راوێژکارانی ناپلیۆن، لۆرد پالمرستن" Lord Palmerston" بسمارك "Bismark" یان تەنانەت جۆرج بۆش پلان و نەخشە بۆ وڵاتەکانیان دارێژن کە لایەنی ئابووری و سیاسی و سەربازیی لە خۆوە گرتبێت بۆکێ برکێ کردن لەگەڵ جیهاندا. بەڵام ئەم کارە ئەوەیە کە هونانگانگ Hu Angang هەولـدەدات بە ئەنجامی بگەیەنێت لەم سیمنارەدا. بەڵام ئەویش بە تەنها نییە. پێوانی رێژەو ئەندازەی هێزی نیشتمانی سەرتاسەری CNP " Comprehensive National Power" بووە بە خولیایەکی نیشتمانی. CNP زۆر زیاترە لە تەنها چەند پیتێك کە ستراتیژ دارێژەرە چینییەکان هەمیشە بە کاریان دەهێنن.

چینییەکان هەر لە سەردەمی سەن زی "Sun Zi"یەوە بۆیان دەرکەوتووە کەتەنها لە رێگای تەماشا کردن و تێروانینی خاڵە لاوازەکانی نەیارانەوە دەتوانێت هێز و توانای خۆی ببینێت.

هەر یەك لە بیرمەندە"Think- Tanks" شارەزلییەکانی بواری سیاسەتی دەرەکی رێگای تایبەتی خۆیان دۆزیوەتەوە بۆ ئەوەی بتوانن بە ژمارە هێزی هەر نەتەوەیەك نیشانبدەن. ئەکادیمیای زانستە کۆمەڵایەتییەکانی چین (CASS) سەر قافلەی دەزگا ئەکادیمیاکانی ترە لەم بوارەدا. کە خشتەیەکیان داهێنا کە پێکهاتبوو لە شەست و چوار خانە یان نیشاندەری (Indicators) هێز لە ساڵی ١٩٩٠. لە لایەکی تر دەزگای پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانی هاوچەرخ. کە دەزگایەکی زۆر گرنگ و زۆر گەورەیە کە خەڵکی بیرمەند و ژیری لە وەزارەتی ئاسایشی نیشتمانی لە خۆوە گرتبوو، رێگایەکی تریان دۆزییەوە بە بەکار هێنانی شارەزایانی خەملاندن (Surveys)، شارەزایانی بواری دواکەوتن رووخان (Regression)، شارەزایانی بواری دەربڕینی چاك و بە رێز (Nerve Networks) وە شیکەرەوەی زانیارییە جۆراوجۆرەکان. لە ساڵی ١٩٩٩ هێزی سەربازیشی بوو بە ئەندام لە لیژنەی حیزب و

ئەوانیش لە لای خۆیانەوە دەزگایەکیان پێکهێنا بە ناوی ئەکادیمیای سەربازی چینی کە هاوکێشە یەکیان داهێنا بۆ پێوانی هێزی نیشتمانی (P=KXHXS).

لە سەردەمی جیهانگیری و نموونە جیهانییەکاندا (Universal Norms)، جێگای سەرنجە کە ستراتیژ دارێژەکانی چینی زۆر بێ شەرمانە باس لە هێزی نەتەوەیی دەکەن (نیشتمانی). بیرۆکەی وەدەستهێنانەوەی سەروەری لە ئابووری جیهانی و هێزەکانی کۆمپانیاکان و تەنانەت گروپ و کەسانیش وەك تیرۆرستەکان بووە خەمی سەرەکی هەموو کەسێك و کەرستەی شۆڕشی تازەی چینە بۆ تێڕوانینی جیهان.

بیرۆکەی سەرتاسەری بوون وادەکات بە شێوەیەکی تایبەت چینییەکان بە هەموو خشتەکانی (CNP) یەوە کە نیشانەی سیاسی و ئابووری، هەروەها سەربازین بیر لە بە خۆدا چوونەوە بکەن بۆ بەهێز بوون لە گشت لایەنەکان. بەم دواییەش خەریکی دۆزینەوەی ڕێگای تازەن بۆ سەرنج ڕاکێشانی دەرەکی و ناوەکی بۆ سەرنجڕاکێشانی کەلتووری . کەسێکی ئەکادیمی ئەوە روون دەکاتەوە بۆچی سەرتاسەریی بوون (Comprehensiveness ) کلیلی هێزە بە بەراورد کردن بە رابردوو. پرۆفیسۆر یان خیوتۆنگ (Ysn Xuetong) زیوتۆنگ دەپرسێت بۆچی یەکێتی سۆڤیەت بەهێزتر بووە لە ژاپۆن لە سالانی ۱۹۸۰ دا؟ لە کاتێکدا GDP سۆڤیەت تەنها $۷٤۱.q ملیار بوو بە بەراورد بە $۱/۲۲۰ ی ملیاری ژاپۆن.لەو کاتەی ژاپۆن شێرێکی ئابووری بوو لە هەمان کاتدا مشکێکی سەربازی بوو. یەکێتی سۆڤیەتی هەژار لە لایەکی تر دەزگایەکی سەربازی هەبوو کە ململانێی لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا دەکرد و هاوسەنگی هەبوو لە تیوانیاندا لەم بوارەدا. هەر بۆیەش دەڵێت هێزی سەرتاسەری یەکێتی سۆڤیەت بەزهێز وەسفدەکرا، لە کاتێك ژاپۆن بە حاڵ بە هێزێکی گەورە لە قەڵەم دەدرا.

دەرئەنجامەکەیشی روون و ئاشکرایە: بە هەمان شێوەی کە پێشکەوتن و گەشەسەندنی بەلانسکراو ئاماژەی سەرەکی و گرنگی چاکساز خوازنە لە ناوە خۆدا،

هەر بەم ئەندازەیەش زۆر گرنگە بۆ چین جۆرە بەلانسێکی هەبێت کە ئەکادیمییەکانی ئەو وڵاتە بە خشتەی بەلانسکراوی هێز لە ناوی دەبەن (Balanced Power-Profile). بە وتەیەکی تر هێزی ئابووری دەبێت بەلانسکراو بێت لەگەڵ هێزی سەربازی و سیاسی لەگەڵ قورسایی و رادەی هێزی ئەخلاقی.

بەڵام سەرەڕای ئەو مەنهەجە (Mot hodologies) ئاڵۆزەش کە بووە بە پێوەری هێز، لێکۆڵەرە چینییەکان زۆر بە زەحمەت فریای ئەو گەشەسەندنە سەختەی وڵات دەکەون. لە پێشبڕکێی ساڵانی ١٩٩٩ بەیەکێن لە دوای USA ، ژاپۆن روسیاو چەندین وڵاتی ئەوروپایی دەهات. بەڵام ئەمڕۆ بە گوێرەی چەندین ئامارو خشتەدا چین هەموویانی جێ هێشتووە و لە هاوسەنگی دایە لەگەڵ USA . بەڵام ئەوەی جێگای سەرنجە هەر چەندە چین بە هێزتر دەبێت ئەوەندەش بەرمەندەکانی سیاسەتی دەرەوەی وڵات بە عاقڵانەترو مەندتر مامەڵە دەکەن و زیاتر هەست بە شانازی دەکەن. Nourishin Obscurity

بە شانۆگەری" گالیلۆی" (برخت)دا پاڵەوانی شانۆگەرییەکە کە فەلەکناس بوو دەیتوانی باس لە هەموو زانیارییە ئەستێرە ناسییەکانی بکات و بیاغاتە روو و خۆی پێبادات تەنها گرنگترین راستی نەبێت کە نەیدەتوانی باسیبکات ئەویش خولانەوەی زەوییە بە چوار دەوری خۆرەوە. بۆ ماوەیەك نزیكەی ئەوەیەك (جیل) دارێژەرانی سیاسەتی دەرەکی چین تووشی هەمان گرفت بوو بوون: چینییەکان خۆیان دەپاراست لە خۆنیشاندان بەوەی پێشدەکەون و بە دوای رۆڵی زلهێزیدا دەگەڕێن. تەنانەت بەکار هێنانی وشەی بووژانەوە"Rise" کە دەکاتە جیوکی بە زمانی چینی" Jueqi" وەك قەدەغە کراو وابوو.

بەڕپرسە چینییەکان مەترسی ئەوەیان هەبوو کە جیهان بووژانەوەی چین بە هەڕەشە حساببکەن، کە رەنگە ئەمەش ببێتە هۆی ئەوەی وڵاتانی جیهان پیلانیان بۆ دارێژن. ئەوان پێیان وابوو ئەگەر خۆیان باس لە بووژانەوە و گەشەسەندن نەکەن رەنگە دونیاو وڵاتانی تری بە لایان پەسندتر بوو کە باس لە پێشکەوتن بکەن کە ئەمەش تەعبیرێکی جوان و ئاسکترە کە خەڵك ئاسانتر قەبوولیبکەن.

بــە گــوێرەی تــەعبیری جــۆرج ئۆرویــل "Orwell" (نووســەری خــەیاڵی زانستی)،دەتوانن ناو لە شتەکان بنێن بەبێ ئەوەی وێنــەیان بــۆ دروســتبکەن (بــەڵکو خەڵك هەرکەسە و وێنەی خۆیانی تێدا بدۆزێتەوە).

ئەو پێشکەوتنە زەق و بەر چاوەی چین لە ژێر کاریگەری دروشمێکــی دیــنگ زیــاو پینگ" کە بە چینەی دەکــات تــاو گــوانگ یــانگ هیــو Tao Guang Yang hui واتە" ژیری بشارەوە و لێلی و نادیاری بڵاو بکەوە" Hide brightness , Nourish Obscurity". کە یەکەم جار ئەو رەحی ئەم دەستەواژەیە بــەکار هێنــرا بــەم جــۆرە وەرگێردرابوو سەبر بگرەو چاوەروانی کــاتی خــۆت بــە، لــە پاشــان توناکــانی خــۆت پێشبخە" Bide Our Time and build our Capabilities" دیــنگ زیــاو پینگ مەبەستی لەم دەستەواژەیە ئەوە بوو کە چین وڵاتێکی هــەژار و لاوازە، دەبێــت خۆی لە گرفت بپارێزێت و تواناکانی چڕ بکاتەوە لە پێناو پێشکەوتنی ئابووری. چــۆن خۆی لە پلاندانانی ناوەندی مارتسی تونگ پاراستبوو هەر بــەم جــۆرەش تــوانی چــین رزگار بکات لە باری قورسی سیاسەتی دەرەکــی و شۆرشــگێری ســەردەمی مــاو کــە بریتیبوو لە پاڵپشتی وڵاتە کۆمۆنیستەکانی باشووری خۆرهەڵاتی ئاســیا: شــەرەکانی نێوان هند و ڤێتنام هەروەها تەماشا کردنی هەر گرد بوونەوەی چــەند دەزگایــەك بــە چاوی شك و گومانەوە.

ستراتیژیەتی نوێی دیــنگ زیــاو پیــنگ کــە بریتییــە لــە سیاســەتێکی نادیــاری دەرەکی، مانای ئەوەیە کە چین هەڵوێستی بێ لایەنی هــەبێت لــە هــەر شــەرێك کــە هەڵبگیرســێت، یــان لەهــەر کێشــەیەك ســەبارەت بــە دەســەڵات بەســەر ســەرچاوە سروشتییەکان- هەروەك خۆی دەڵێت

" سەرت دەرمەخە". بۆ سەرکەوتنی ئــەم بــۆ ســەرکەوتنی سیاســەتەش بــەیگێن دەبێت زۆر بە لەخۆ بوردەیی و تەنها خەریکی هەنــدێ مەســەلەی بچووك بێــت کــە لەمەودوا قازانجی ستراتیژی دەبێت. لە هەمان کاتدا دەبێــت واز لــە خــووە کۆنەکــەی بهێنێت کە بریتیبوو لە دۆســتایەتی لەگــەڵ وڵاتــە سۆسیالــستەکاندا. لەمــەولا چــین

دەبێت باوەش بکاتەوە بۆ هەر وڵاتێك کە رەنگە ببێتە یارمەتیدەر بۆ خواستی چین بۆ بازاری تازە و سەرچاوە سروشتییەکان و یارمەتی سیاسی.

بۆ ستراتیژ دارێژە ئەمریکییەکان وەك پۆل ولفوتز "Paul Wolfowitz" و رۆبەرت کاگەن Robert Kagan یان جۆن میرشێمر" John Mearsheimer " کە بە دوای بەلگەدا دەگەرێن هەرەشەی چین بسەلمێنن، بەلام هەلسوکەوتی" کۆماری گەل" ئەوان تووشی سەر لێشێوان دەکات، هەر چەندە، ئەوان دەلێن کە چین لە شوێنێك دەگەرێت لە ژێر خۆر، هەروەك هێزە گەشەسەندووەکانی رابردوو بەلام بەیگین لە هەولی بەردەوام دایە بۆ پووچەلکردنەوەی نیەتی کانیان، لە جیاتی لاسایی کردنەوەی هەلسوکەوتی شەرانگێزی ئەلمانیا.

لە ژێر حوکمی قەیسەر ولهێلم " Kaiser wilhelm ". یانیش ئیمپراتۆری ژاپۆن. وادیارە چین هەموو هەولێکی ئەرخاندەکات بۆ ئەوەی خۆی لەو کێشە بە دوور بگرێت تا رادەی دەروێشی.

ئەم بیر و بۆچوونە سەرچاوە لە رابردوویەکی زۆر دوورەوە هەلدەگرێت. هەر لە رۆژگارەکانی هونەری شەری" زی" Zis Art at war : بیرمەندە چینییەکان شەریان بە رووخانی ستراتیژیەت وەسفکردووە. بە لای ئەوان پەسندترە کە هەموو رێگایەك تاقیبکەنەوە بۆ دۆزینەوەی چارەسەر لە هەموو بارودۆخێکدا بەبێ ئەوەی تەنانەت یەك تاقە فیشەك بتەقێت. هەر چەندە ئامانجەکانیان زۆر کۆنن، بەلام ناوەرۆکی ستراتیژیەتی چین زۆر تازەیە. زۆربەی بیرۆکە ئالۆز و پێشکەوتووەکان کە لە لایەن بیرمەندە ستراتیژییەکانی رۆژ ئاواوە بەکار دێت، ئەوا لە لایەن بیرمەندە چینییەکان داهێنراون.

ئەوان بۆیان دەرکەوت کە (تعذیة العصوض) زۆر سەختە بە تایبەت وڵاتەکەت زۆرترین ژمارەی دانیشتوانی جیهانی پێکهێناوە. ئابوورییەکەیان سالانە ١٥٪ زیاد دەکات. بودجەی سەربازی و خۆپاراستن زۆر زیاترە لە جاران بەردەوام لە زیاد بووندایە. کۆمپانیاکان لە هەموو شوێنێکی جیهاندا کاردەکەن وەبەرهێنان دەکەن. لە

زانکۆکان و دەزگای بیرمەندانندا دەنگۆیەکی یەگجار زۆر هەیە لە لایەن بیرمەندانندا بۆ وازهێنـان لـە بنـەمای بیرۆکـەی دینـگ زیـاو پینـگ. لـە کۆتـایی سـاڵی ٢٠٠٣ پالەپەستۆکە زۆر زیاتر بوو.

**ڕووخانی گەشەسەندنی ئاشتی خوازی:**

جوانترین شوێنیان هەڵبژاردبوو بۆ ڕاگەیاندنی ئاشکرای (لادانی تحریم) گەشـانەوەو بووژانـەوەی چـین. دورگـەکانی هاینـان" Hainan "، جوتیـارەکـان و هـەژارەکانیـان شەبقەی لە قامیش دروستکراویان لەسەر کردبوو، گامێشی ناوی، کێڵگەی بـرنج کـە جۆرێکە لە بەهەشتی تازە و مژدێرن بۆ ئەو ڕۆژئاواییانەی کـە پەیوەنـدی و تـارەزووی کەلتووری چـینین. جـوانترین شـوێنیش کـە دەکەوێتـە شارۆچـکەی بـۆواو (Boao) کەوتۆتە ناو ئەرخەبیلو" Archipelago" لە هوتێلی زۆر نایاب چـواردەور دراو بـە دارخورما، باخچەی یەکجار زۆر جوان و قەشەنگ، مەلەوانگە کە لاسـایی کردنـەوەی سروشت بوو پڕ بوو لە لە بەردی گەورە و شەلال، یاریگەی گۆلف کـە هێنـدە جـوان و ڕێك بوو دەتگوت بە کۆمپیوتەر دروستکراوە. هەر لێرە لە بەردەم میـوانێکی زۆر کـە داوەتکرابوون ، وەك جۆرج بوش و سەرکردەکانی جیهان کە سیاسەتی جیهان بە ڕێـوە دەبەن سەرکردەکانی چین هەڵسانەوە و بووژانەوەی چینیان بە ئاشکرا بۆ یەکەمین جـار ڕاگەیاند.

زهینـگ بیجیان" Zheng Bijian" کە ئەم دەستەواژەیەی داهێنا بەکار هێنـا، وەك بالیۆزی بیرمەندانی چین بوو بۆ سەرکردە چـینییەکان هـەر لـە کۆتـایی سـاڵانی ١٩٧٠ وە. زهینـگ بیجیان لەسەر داخوازی دینگ زیاو پینگ چوو بۆ ڕۆژئاوا لەگـەڵ گروپێك لێکۆڵەرەوە.

کاتی خۆی جێگری سەرۆکی قوتابخانەی حیزبی بوو بۆ نوخبە (کاتێك سەرۆك هـو جینتـاوز " Hu Jintao" سـەرۆکی ئـەم قوتابخانـە بـوو). هـەروەها وەزیـری پروپاگەندەش بووە. بەڵام ئەوەی جێگای سەرنجە، کارێکی زۆر نائاسایی بوو کەسێکی

دەرەوەی حکومەت ئەم کۆنسێپتە گرنگە (Concapt) بە ناری حکومەت راگەیەنێت.

لە یەکێك لە سەفەرەکانی زەهینگ جیجیان بۆ ئەمریکا تووشی سەر سوورمان هات لەوەی چۆن ژمارەیەکی زۆر لە خەلك بووژانەوە و هەڵسانەوەی چین بە هەرەشە دەبینن. هەر بۆیەش بۆی دەرکەوت بێ دەنگی کاریگەریەکی هەیە بۆ رەوانندنەوەی ئەم ترس و هەرەشەیە، چین دەبێت هەلسێتەوە سەر پێ و بە ئاشکرا گەشەسەندنەکەی بۆ جیهان باسبکات.

لە ئاهەنگی کردنەوەی (منتدى) (Forum)ی بۆیاو Boao گوتی: بووژانەوەی (Rise) تازەی چین دیاردەیەکی نەبینراوە لە مێژووی جیهاندا. روونیشی کردەوە کە چین وەك ئەلمانیا ناکات لە شەری جیهانی یەکەم، یان ئەلمانیا و ژاپۆن لە شەری جیهانی دووەم کە هێزیان بەکار هێنا بۆ بە تالأن بردنی سامانە سروشتییەکان بۆ زالبوون بەسەر جیهان. ئەوەك یەکێتی سۆڤیەت کە پێشکەوتنەکانیان لە جیهان دابراو بوون، چین ناوێتە و تێکەڵی ئابووری جیهانگیر دەبێت، دەبێت بە بازار و هەلی ئابووری دەخولقێنێت بۆ جیهان. هەروەها ئێمە ئامانەوێت وەك ئەمریکا ببین بەو هێزەی کە کۆنترۆلی دنیا بکەین. ئامانەوێت بەرە دروستبکەین وەك NATO کە بە جۆرێك دروستکراوە دژ بە هەندێك ولات بێت. تۆمەتەکانی کاگان" Kaggan" و ولفوتیز"Wolfowitz " و میرشیمێر "Mearsheimer" گوتی بووژانەوەی چین حالەتی بردنەوە- بردنەوە (Win-Win) دروستدەکات بۆ جیهان بۆ بلاو کردنەوەی ئاشتی، گەشانەوەی ئابووری.

بیروباوەری زەهینگ بیجیان لە لایەن چەندین گرووپی گەشەسەندووی ئەنترناسیۆنالیستە ئازادیخوازەکانەوە پالپشتی لێ دەکرێت لە چین. ئەم بیرمەندانەش وەك کن یاکینگ" Qin Yaqing" و شی ینهۆنگ کە پێیان وایە چین دەبێت چیتر رۆلی قوربانی نەگێرێت و رۆلێکی ئەکتیڤتر بدۆزێتەوە لە مەسەلە نێودەولەتییەکاندا. خالی دەستپێکیش دانانە، ئاشکرا کردنی بووژانەوەی چینە. بەلأم بە هاوتەریبی

لەگەڵ ئەو دانتانە، بەبیگین دەبێت ستراتیژیەتێکی ئامادە کراوی هەبێت بۆ نیشاندانی بایەخدانی چین لە بەشداریکردن لە سیستەمی جیهانی تازە لە جیاتی لەبار بردنی. ئەوان دەیانەوێت چین بە دڵنیاییەکی زیاترەوە داکۆکی لە بەرژەوەندییەکانی بکات بەڵام لە نێو چوارچێوەی ئەو سیستەمەی کە هەیە. ئەم تیۆرییەی زهینگ بیجیان هەر لە خۆڕا دروست نەبووە، بەڵکو ئەو بەسەر هەموو هاوڕێکانیدا زاڵبوو لە بۆچوونە بوێرەکانی لە ڤوتابخانەی ناوەندی حیزبی کاتێك سەرۆك هوجینتاوۆ پارە و پسوولی بۆ پرۆژەی لێکۆڵینەوە یەکی زۆر مەزن تەرخانکرد، پرۆژەکە لە لایەن قوتابیانی دکتۆرا PHD بەڕێوە چوو کە پتر لە کەیسی (٤٠) لێکۆڵینەوەی سەبارەت بە هێزە نێودەوڵەتییە بووژاوەکانی کە ڕێگای توند و تیژیان بەکار هێناوە بۆ گەشەسەندن و بڵاو بوونەوە-، بۆیان دەرکەوت کە هەموویان شکستیان هێناوە.

تیۆری بووژانەوەی ئاشتیخواز مقۆمقۆیەکی گەورەی لە زانکۆکانی بەیجین نایەوە و کەوتە بەر هێرشی نەتەوەخوازەکان، ئەوانەش خەڵکی بەهێز و دەستڕۆیشتوون کە بەهەر دوو ناوی کۆمۆنیستەتازەکان.

Neo-comms وە پارێزگارە تازەکان Neo-cons ناسراون، زەماڵیشیان پرۆفیسۆر یان خیوتۆنگ (Yan Xuetong) ی سەرۆکی دەزگای لێکۆڵینەوە نێودەوڵەتییەکانی زانکۆی تسینگهوە یە (Tsinghua) لە ژوورەکەی خۆی پێیگوتم: بووژانەوەی ئاشتیخواز هەڵەیە، ئەمە نامەیەکی هەڵەیە بۆ تایوان کە ڕەنگە جیا بوونەوەی خۆیان ڕاگەیەنن بە ئومێدی ئەوەی ئێمە هێرشیان نەبەینە سەر. زۆر لە ستراتیژ دارێژەرە چینییەکان دەڵێن لە مێژوودا هیچ نەتەوەیەکی مەزن بە هێمنی و ئاشتیخوازی هەڵنەساوەتەوە. لەو کاتەی دەڵێت چین دەبێت هەموو کارێك بکات بۆ ئەوەی خۆی لە شەڕ بە دووربگرێت، بەڵام لە هەمان کاتدا دەڵێت شەڕ لەگەڵ تایوان حەتمییە گەر چین واز لە گێڕانەوەی تایوان نەهێنێت. زۆر تورە و ناڕازییە بەو دەسەڵات و کاریگەرییەی کە ئینتەرناسیۆنالستە لیبراڵەکان بەسەر سیاسەتی دەرەوەی چین هەیانە و دەڵێت جیاوازی نێوانمان ئەوەیە، ئەوان دەیانەوێت خاوەمان بکەنەوە لە

کاتێکدا کە ئێمەش دەمانەوێت چوار دەوریان بدەین و بیانخەینە ژێر چەپۆکی خۆمان ئەوەش USA و ژاپۆن و تایوان دەگرێتەوە، ئاوەڕۆکی گفتوگۆکەش ئەوەیە، ئەوان دەڵێن چونکە چین بێ هێزە ناچارین سازش بکەین، بەڵام ئێمە دەڵێین گەر سازشمان کرد ئەوان داوای زیاتر دەکەن. کێشەی ئێمە لەگەڵ ژاپۆن و تایوان دەرئەنجامی نەرم نواندن و هێور کردنەوەی چەندین ساڵەیە. کاتێك من پێم گوت تۆ پیاوێکی دەسەڵاتدار Neo-con ناسراویت ئەو هیچ لارییەکی نەبوو و لە وەڵامدا گوتی من پێم ناخۆش نییە وام پێ بڵێن، بەڵام زیاتر پێم خۆشە کە پێم بوترێت واقیعی. نازناوی کۆمۆنیستە تازەکان Neo-comms هەر دەمێنێتەوە چونکە چەندین هاوتەریبی و لەیەکچوون هەیە لە نێوان یان خیوتۆنگ خەلکی تر کە وەك ئەو بیر دەکەنەوە لە USA . یان خیوتۆنگ دەقاودەق ناوێنەی " ولیام کریستۆل" ( William Kristol). کە سەرنووسەری هەفتەنامەی (Weekly Standard)، لە واشنتۆن و دامەزرێنەری پرۆژەی رۆشنبیرییە (Educational Peoject) بۆ ( New American Century). لەو کاتەی کریستۆل مەترسی لە چین هەیە و دەڵێت باڵادەستی ئەمریکا تاکە رێگا چارەیە بۆ ئاشتی و سیستەمی جیهانی، بەڵام یان خیوتۆنگ پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت کە تازە کردنەوەی سوپای چینی کلیلی سەقامگیرییە لە جیهان. هەروەك کرستۆل زۆر (معجبة) بە (ونستن تشرشل). هەروەك کرستۆل دەڵێت من تاکە دەنگی بیابانم. هەروەك کرستۆل لە میدیا و پروپاگەندە زۆر زیرەکە و بیرۆکەکانی لە گۆڤارەکان بلاو دەبنەوە وەك" وەك مەسەلەی جیهانییەکان" (World Aftairs) و (Global Times)، هەروەها زۆر ناودار بووە و بەرە و نەتەوە پەرەستی دەچێت.

ئەوانەی راڕان لە دەنگدان و پاڵپشتی کردنی سیاسەتمەدارانی چین گەورەترین کرفتن لە بەردەم سیاسەتی دەرەوەی ولات، چونکە ئەوانە گەورەترین گروپن. ئەم پراگماتیانە زۆر خۆشحاڵ نەبوون بە بیرۆکەی بووژانەوەی ئاشتیخوازی. چونکە بە رای ئەوان دەبێتە هۆی شکست و ناتوانێت ستراتیژیەتێکی سەرتاسەری زامن بکات، لە هەمان

کلتدا تواناییان نییە چیرۆکێك هەڵبەستن بۆ قەناعەت پێ هێنانی وڵاتانی جیهان. وەنگ جیسی "Wang Jisi" کە یەکێکە لەو بیرمەندە قسەزانانەی کە کاریگەرییەکی زۆری هەیە لەسەر سیاسەتی دەرەوەی چین، رایگەیاند کە ئەم بیرۆکەیە هێشتا نیوە کوڵە و کارێکی زۆری دەوێت بەر لەوەی پیادە بکرێت. هێرش دەباتە سەر بیروباوەڕەکە بەوەی کە هیچ چارەسەرێکی تێدا نییە بۆ چاکسازی سیاسی، هەروەها کاریگەری نابێت بەسەر بەڕێوە بردن و کۆنترۆڵکردنی دەرەکی. لە هەمان کاتیشدا زۆر لە پراکماتەکان پێیان وایە بووژانەوەی ئاشتیخوازی هیچ دڵنیاییەك بە جیهان نابەخشێت. ئەوانە دژ بە ئەوەن کە باس لە هەڵسانەوە و بووژانەوەی چین بکرێت، چونکە دەبێتە هۆکاری گەشەکردنی ئاگر دژ بە چین لە جیاتی روونکردنەوەی ئەوەی کە چین نابێتە هەڕەشە بەسەر هیچ وڵاتێك. بە لای ئەوانە چین دەبێت زۆر بە عاقڵانە مامەڵە بکات و زێدەڕۆیی نەکات سەبارەت بەهێز و توانای، بەڵکو هەموو تواناکان بخرێتە گەڕ بۆ چڕکردنەوە لەسەر گەشەسەندنی ئابووری و پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی. دەڵێت حکومەت دەبێت تەنها باس لە پێشکەوتن بکات، چونکە وشەیەکی نەرمترە و نابێتە هۆی مشت و مڕ ئانەوە و کێشە دروستکردن.

بۆ ماوەیەکی کورت "بووژانەوەی ئاشتیخواز" زۆر بە گەرمی باسدەکرا و سەرۆك وەزیران ئەم دەستەواژەیە لە وتارەکانی بەکار دەهێنا لە کۆتایی ساڵی ٢٠٠٣ و سەرەتای ساڵی ٢٠٠٤، سەردانێکی بۆ ئاسیا دەستپێکرد کە بانگەوازی بۆ ئەم دەستەواژەیە دەکرد.

لێرە کێشەیەك سەری هەڵدا، وەزارەتی کاروباری دەرەوە گلەیی لەوە کرد کە ئەوان زوڵمیان لێکراوە و هیچ پرس و رایەکیان نییە لە دروستکردن و هێنانە کایەی ئەم دەستەواژەیە، کە ئەمەش ناوی ساردی بە پرۆسەکەدا کرد. سەرۆکی پێشوو جیانگ زیمین "Jiang Zemin" سەرۆکی کۆمەڵەی شانگەهای کە پاڵپشتی لە سیاسەتێکی دەرەکی توندتر دەکات ئەم هەڵەی قۆزتەوە بۆ ئەوەی دەسەڵاتی خۆیانی دووبارە بسەپێنن.

بووژانەوەی ناشتیخوازی توانای مانەوەی زۆر لاواز بوو دوای ئەو کێشە توندو تاڵەی نێوان بیرۆکراتەکان کە گەیشتە لوتکە کاتێك هوجینتاوۆ لەگەڵ وین باوۆ وازیان لەم دەستەواژەیە هێناو گەڕانەوە بۆ دەستەواژەی ئاشتی و پێشکەوتنی سەردەمی" Deng" دینگ. لە هەوڵێکی زەینگ بیجیان بۆ رزگار کردنی دەستەواژەکەی گۆڕانکاری زۆری بە سەردا هێنا تا رادەی پووچەڵکردنی ناوەڕۆکەکەی. لە وتارێکدا گوتی بەکارهێنانی هێز رێگایەکی شەرعییە بۆ پاراستنی سەروەری بۆ قەدەغە کردنی سەر بەخۆیی تایوان، وەبەر هێنانی نەوت دابین کردنی یەدەکی گاز. هەر چەندە دەستەواژەی "بووژانەوەی ئاشتیخوازی" بە رەسمی بەکار نایەت، بەڵام ئەو گفتوگۆ گەرمەی دروستی کرد هێشتا بەردەوامە.ئەو نەتەوەناسیۆنالیستە لیبرالانەی دەیانەوێت چین بکەن بە بەشێك لە جیهانی رۆژئاوا، تووشی گرفتی گەورە هاتوون ولە کێشەدان لەگەڵ کۆمۆنیستە تازەکاندا "Neo-comms" کە ئامانجی دووریان بریتییە یە لە دروستکردنی سیستەمێکی ئەلتەرناتیڤ کە چین چەقی قورسایی بێت. لەناوەراستیشدا پراگماتییەکان هەن کە پاڵپشتی لە هەر بیروباوەرێك دەکەن بە مەرجێك بەرژەوەندییەکانی چین بپارێزێت و بەرەو پێشی ببات. هەرسێ گروپ بیروباوەری رۆژئاوایی تێکەڵ بە تیۆرە باوەکانی بیرمەندە چینییەکان دەکەن بۆ پێشخستنی کێشەکەیان.

ئەوانە گرنگترین سێ بیروباوەری رۆژئاواییان هێناوە سەبارەت بە جیهانگیریان سەرنجون کردووە. هەموو ئەو دەستەواژانەی کە بەکار هێنراون بۆ وەسفکردنی توانەوەی دەوڵەتی نەتەوەیی"Nation state" بۆ ستراتیژیەتی زیادکردنی هێزی نیشتمانی چینی بەکار هێنراون. بۆ نموونە بیرۆکەی" هێزی نەرم" "Soft Power" کە لە رۆژئاواوە بەستراوە بە سەرنجراکێشانی کۆمپانیاکانی جیهان وەك ماکدۆناڵدز و لیڤایز Levis (کۆمپانیای جل و بەرگ دروستکردن) لە لایەن چینییەکانەوە گۆڕدراوە بە هۆکارێك بۆ گەڕانی دەوڵەت بۆ وەدەستهێنانی بەرمایەکی مەعنەوی بۆ چاك کردنی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانی چین.

بیرۆکەی فرە لایەنی "Multilateralism" لە رۆژئاوادا بەستراوەتەوە بە لاواز کردنی سەروەری نیشتمانی تاکە دەوڵەت بە ویستی دەوڵەت بۆ پابەندبوون بە بڕیار و یاساکانی دەزگا سوپەرناشناڵەکان

"Supranational in stitution" وەك یەکێتی ئەورووپی و ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی. بەڵام ئەوە لە چین دووبارە داڕێژراپەوە. بۆ ئەوەی بکرێت بە کەرەستەیەك بۆ هێنانە کایەی گۆڕانکاری بنەڕەتی بەسەر هێزی نیشتمانی بە جۆرێك کە ڕێگا بەچین بدات پەرە بە پەیوەندییەکانی بدات لەگەڵ ئەو وڵاتە ئاسیاییانەی کە لە پەیوەندییە دەرەکییەکانیان حساب بۆ ئەمریکا ناکەن. لە کۆتایشدا بیرۆکەی شەڕی بەربڵاویان ئەو شەڕەی کە گروپە تیرۆریستەکان دەیکەن"A symmetric- War" کە تاکتیکی گروپە گەریلاییەکانی لە خۆوە گرتەوە وەك ڤیت کۆنگViet Cong

(گەریلاکانی ڤیتنامی باکوور)، یان ڕێکخراوی ئەلقاعیدە، چینییەکان دووبارە لەسەر ئاستێکی زۆر بڵاو بیریان لێکردووە. ستراتیژدانەرە چینییەکان زۆر ڕێگایان تاقیکردووە لە بەکار هێنانی چەکی سەربازی و توانای ئابووری هەروەها یاسای نێودەوڵەتی بۆ بەگژدا چوونی هێزی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە جیاتی ڕووبەڕوو بوونەوەی ئاسایی لەخۆ پرچەککردن و کێ بڕکێ ئاسایی. لەم گفتوگۆیەی خوارەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەنتەرناسیۆنالیستە لیبراڵەکان کۆکن لەگەڵ کۆمۆنیستە تازەکان سەبارەت بە گۆڕینی سیاسەتی دەرەوەی دینگ زیاوپینگ بە بیرۆکەی جیهانی دیوارکراو"Walld World ".

### هێزی نەرم "Soft Power" (نەرمەهێزی):

ئەدمیراڵ یانگ یی"Yang Yi " کە ئەفسەری هێزی دەریاوانی و بیرمەندێکی دەست ڕۆیشتووی سەربازییە، بیروبۆچوونەکانی زۆر زیاتر ستووری تازەترین چەك پەل دەهاوێت. یانگ پێیوایە کە USA توانیویەتی دیوارێکی ستراتیژی بە دەوری چین دروستبکات کە کاریگەریەکی یەکجار زۆری هەیە بەسەر پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان

هەر کاتێك کۆماری میللی هەوڵدەدات کە خۆی بخاتە روو لە پەیوەندییە دیپلۆماتییەکان بۆ تازە کردنەوەی هێزی سەربازی و کردنەوەی پەیوەندی نێودەوڵەتی لەگەڵ وڵاتی تازە، بەڵام USA ئەمە بە هەڕەشە لە قەڵەم دەدات وڵاتانی تریش بە گوێرەی یانگ یی زۆربەی جاریش بەدوای رای USA دەکەون و بە هەڕەشەی لە قەڵەم دەدەن. بەم جۆرەش ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا خاوەن دوا بڕیارە لە دانانی بنەماکانی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان و مەرجەکانی. ئەوان باڵا دەستن لە وتارو خیتابی سیاسی نێودەوڵەتی، زاڵن بەسەر هەر را و بیر و بۆچوونێکی تر جیا لە هی خۆیان لەسەر ناستی بیر و بۆچوونی گشتی نێودەوڵەتی و بنەماکانی هەڵسوکەوت "Rules of Conduct" کەواتە ئەوەی لە واقیعدا روو دەدات لە مەسەلە نێودەوڵەتییەکان، ویلایەتە یەکگرتووەکان گفتوگۆی ئەوە دەکەن کە" تەنها ئێمە دەتوانین ئەم کارە ئەنجامبدەین و ئێوەش ناتوانن ئەم کارە ئەنجامبدەن".

بیرمەندە چینییەکان لە هەوڵی بیرچاندان بۆ خۆ ئازاد کردن لەم تەڵەیە. یەکێك لە گەرمترین وشە یان زاراوە کە بەکار دێت بۆ سەرنجراکێشان لە سیاسەتی دەرەوەی چین بریتییە لە "روان کوانلی" هێزی نەرم"Ruan qunli "، "Soft Power" ئەم دەستەواژەیە لە لایەن زانای سیاسەتی ئەمریکی جۆزیف نای"Joseph Nye" لە ساڵی ۱۹۹۰ بەکار هات. بەڵام سەدا و حەماسەتێکی یەکجار زۆری بە بەیگین دروستکرد لە جیاتی واشنتۆن DC . ئەمەش بە پێچەوانەی دەستەواژە دژەکییەتی هێزی توند یان توندە هێز "Hard Power" کە زۆر شەڕانگێزییە و هەوڵێکە بۆ ئەوەی وڵاتانی تری بەهێز ناچار بکەیت ئەو شتە بکەن کە تۆ دەتەوێت. لە لایەکی تر نەرمە هێز بریتییە لەو توانایەی کە وا لە وڵاتان بکەیت ئەو شتەیان بوێت کە تۆ دەتەوێت"Ability to get Others to want what you want". ئەم کارەش پەیوەندی نییە نە بە گێـزەری ئابووری (هاندانی ئابووری) و نەبە داری سیاسی (هەڕەشەی سیاسی و سەربازی). بەڵام بە شێوەیەکی سەرەکی وابەستەی جوان نیشاندانی کەلتووری و بیروباوەڕەکانە

(کە ولاتان و خەڵك خۆیان بە دوایاندا بگەڕێن). راستگۆیی و شەرعییەت بوونت بە چاوی خەڵکی تر و توانای دانانی بنەماکانی رێکخراوە نێودەوڵەتییەکان هاندەرن بۆ سەرکەوتن لەم ئەرکە.

لێکۆڵەرە چینییەکانی وەك یانگ یی و یان خیوتۆنگ گلەیی ئەوە دەکەن کە لە بیست ساڵی رابردوودا هێزی نەرم لەسەر رۆژئاوا تاپۆ کرابوو: وڵاتە رۆژئاوایییەکان گەورەترین بازاڕیان هەبوو، کەلتوور و مۆراڵ و بەها ئەخلاقییەکانی رۆژئاوا گەورەترین هاندەربوون، هەروەها سەرجەم دەزگا نێودەوڵەتییەکانی دروستبوو دوای شەڕی جیهانی دووەم دەستکردی رۆژئاوا بوو، کە مافی ئەندامیەتی کراوە بوو بۆ گشت دەوڵەتانی جیهان بەڵام تەنها بە مەرجێك ئەگەر هەندێ هەڵسوکەوتی دیاریکراو ئەنجامبدەن. بەڵام ئێستا دەیانەوێت هەموو ئەوانە بگۆڕن. یان خیوتۆنگ ئەمەشی دەکاتەوە و دەڵێت: لە سەردەمی جیهانگیریدا گۆڕەپانی پێشبڕکێ چیتر پەیوەندی نەبە خاك یان سەرچاوە یانیش بازاڕەوە نییە، بەڵکو گەورەترین پێشبڕکێ لەسەر یاسادانان"Rule Making" و بڕیار دەرکردن و پێوەر دروستکردن و هێنانە کایەی ریسای تازە. دوای ئەمانی شەڕی سارد ئەم بنەمایە لە گۆڕاندان. ئێمەش لە جیاتی ئەوەی رۆڵێکی نێگەتیڤ ببینین و دژ بەم گۆڕانانە بین، دەبێت بەشدار بین لەم پێشبرکێیە بۆ ئەوەی بنەماکانی یاری و یاسا نێودەوڵەتییەکان دارێژین.

خاڵی دەستپێکیش بریتیبوو لە دیراسەتکردنی USA . بیرمەندە چینییەکان بەوردی لە کاریگەری ئەمریکا و سومبولبوونیان کۆڵییەوە، چۆن پەیکەری ئازادی و Statue of Liberty و لیستی مافەکان"Bill of Riguts"، کۆکاکۆلا، ماکدۆنالدز، CNN و هۆلیود بوون بە باڵیۆزی زۆر کاریگەری ئەمریکا تێڕوانینیان بۆ جیهان زۆر کاریگەرتر بوو لە حکومەتی ئەمریکی.

لەوەیان کۆڵیەوە کە چۆن بەها ئەمریکییەکان تێکەڵ بە کۆمەڵێك دەزگای نێودەوڵەتی کراون وەك ئەوەی، ناتۆ"NATO"، بانکی جیهانی و (سەندووقی دراوی نێودەوڵەتی) IM، کە بوونەتە هۆکاری ئاوێتە کردنی بیروبۆچوونی ئەمریکی بۆ جێ

بەجێ کردنی کارەکان و پتەوکردنی ئەو بنەما هزری و ئابوورییانە. هەروەها سەرنجی ئەوەشیان دا کە ژمارەیەکی زۆر لە قوتابیانی بیانی لە زانکۆکانی ئەمریکایی دەخوێنن، کاریگەری دەزگاکانی راگەیاندنی ئەمریکی رۆڵێکی زۆریان هەبوو لە گەورە کردن و بەردەوام بوونی بالاّ دەستی و کاریگەری بیرو دیدی ئەمریکی بەسەر مەسەلە جیهانییەکان. چین دەستیکرد بە سوود وەرگرتن لەو هەموو تاقیکردنەوە گرنگانەی ئەمریکا و بە نموونە بەکاریان دەهێنێت و سوود لەو تەکنیکانە وەردەگرێت. وەزارەتی رۆشنبیری ۱۰۰ دەزگای کۆنفۆشی دادەمەزرێنێت بۆ بلاو کردنەوە و ناساندنی کەلتووری چینی، بەهەمان شێوەی کاونسلی بەریتانی و دەزگای گۆس"Goethe-Institut" دەیکات بۆ ناساندنی کولتووری ئەورووپایی (کە تا ئێستا ۳۲ دەزگایان لە ۲۳ وڵات دامەزراندووە). چین کەناڵێکی نێودەوڵەتی تەلەفزیۆنی دامەزراندووە "CCTYq" بە جۆرێك دامەزراوە تا دەنگوباسی جیهان بلاو بکاتەوە تا کێ بڕکێ لەگەڵ CCN بکات، هەروەها دەزگای راگەیاندنی حیزبیان تازە کردۆتەوە بە جۆرێك کە ببێتە جێگای متمانە و وەك رویترز وAP مامەڵەی بکرێت. پلانی ئەوەشیان هەیە ژمارەی ئەو بیانیانەی کە زمانی چینی دەخوێنن چوار قات زیادبکەن تا لە ساڵی ۲۰۱۰ بێن بە ۱۰۰ ملیۆن کەس. زانکۆکانیان کردۆتەوە لە بەردەم خوێندکارە بیانییەکانەدا، ژمارەی خوێندکارانیان دووجار بە قەد هی ئەمریکا دەبێت بە تایبەت ئەوانەی لە ئەندەنوسیاوە دێن. ۱۳۰۰۰ یش لە کۆریای باکوور ساڵانە.

سەرنجراکێشترین بەرنامەی نەرم هێزی چین بریتییە لە نامەیەك کە بانگەشەی بۆ دەکەن و دەیانەوێت وڵاتانی دونیا ببیستن. لە مانگی چواری ۲۰۰٦ لە بەیگین کۆنفرانسێك رێکخرا بۆ راگەیاندنی" خەونی چین". زهینگ بیجیان بە بیرۆکەیەکی تازە هاتە مەیدانەوە، لەم کۆنفرانسەدا دەنگی ئەو لە هەموو دەنگەکان بەرزتر بوو، کە زاڵبوو بەسەر قسەکەرەکانی ترو وەزیرەکانی حکومەت و ئەکادیمیاکان و دیپلوماتکاران. لەم وتارەیدا بووژاندنەوەی کولتووری بە رێگایەکی پەسند ناساند بۆ

بەدەستهێنانی شەرعیەتی زیاتر لەسەر شانۆی دونیا." خەونی چین" کە ئەوان ئاشکرایان کرد هەوڵێك بوو بۆ گرێدانی کۆماری میللی لەگەڵ سێ بیروباوەڕی زۆر بەهێز: پێشکەوتنی ئابووری، سەروەری سیاسی و یاسای نێودەوڵەتی.

چین بوو بە نموونە و پاڵەوانی هەژارترین وڵاتانی جیهان لە پرۆسەی پێشکەوتن و گۆڕانی چۆنیەتی بیرکردنەوە لە پێشکەوتن. لە ساڵی ۱۹۸۹ فرانسیس فۆکۆیاما لە لێکۆڵینەوەیەکدا گفتوگۆ لەسەر ئەوە دەکات کە رەنگە ئێمە ئەوەی دەبینین کۆتایی شەڕی سارد نییە... بەڵکو کۆتایی مێژووە بە جۆرێك کە ئەوەی ئێستا دەبینین خاڵی کۆتایی پێشکەوتنی ئایدۆلۆژی مرۆڤە بە جیهانی بوونی دیموکراسی لیبراڵی رۆژئاوایی بەرزترین جۆر و شێوەی حوکمڕانییە لای مرۆڤ. بۆ ماوەی دە ساڵ زۆر سەخت بوو نکۆڵی لەوە بکەیت کە ئازاد بوونی سیاسی و ئابووری دوو رووی یەك دراون. بەڵام بووژانەوە و هەڵسانەوەی چین، توانی بەرەو پێش چوونی ئابووری لە سەرخۆ و لە ناو چوارچێوەی دەوڵەتێکی بە قەبارە زلی وەك چین لە ژێر سایەی حکومەتێکی ناوەندی داپڵۆسێنەر ئەم بنەما کۆنەی شکاند. هەر بۆیەش لە وڵاتە تازە پێگەیشتووەکاندا وەك ئەفریقا، رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئاسیای ناوەڕاست. نوخبە سیاسییەکان دەڵێن دەبێت ئێمەش چین وەك نموونە وەرگرین چاکسازی ئابووری ئەنجامبدەین لە پاشان چاکسازی سیاسی بکەین. بۆ یەکەم جاریش هەندێ هاوڵاتی بڕوا بەم قسەیە دەکەن. چیتر ئاسان نییە قەناعەت بە خەڵك بهێنی کە دیموکراسیەت و لیبراڵزم بنەمای سەرەکی هەر گۆڕانکارییەك بن.

چین خوازیاری ئەوە بوو کە جیاوازی ببینێت لە نێوان بڕوا هێنان بە سەروەریی و مافی وڵاتان لە ئازادی و دەست واڵا بوون لە مەسەلە ناوخۆییەکاندا، بە تایبەت دژ بە دەستتێوەردانی رۆژئاوایی لە کاروباری ناوخۆی چین لە ژێر ناونیشانی مافی مرۆڤ. چین پاڵپشتی سیاسی و یارمەتی ئابووری و چەك بۆ ئەو رژێمانەی ئەگەر وانەبوایە دەکەوتنە ژێر فشاری کۆمەڵگای نێودەوڵەتی. لە وانەش سودان، ئێران، بۆرما، زیمبابۆی، کۆریای باکوور، ئوزبەکستان، کازاخستان و ئەنگۆلا. راپۆرتی دێسەمبری

۲۰۰۵ بە ناوی راپۆرتی حکومەت سەبارەت بە ئەفریقیا ئاشکرای دەکات کە چین یارمەتی بێ بەرامبەر پێشکەش بەم وڵاتانە دەکات (بێ هیچ مەرجێك).
بەیگین باجی لەسەر مامەڵە کردن لەگەڵ ٤٥ وڵاتی تازە پێگەیشتوو هەڵگرتووە.
دراوسێکان تەواو دەبێت لە باشووری خۆر هەڵاتی ئاسیا، بە ئەندازەیەکی زۆر گەورە یارمەتی دەرەکییەکانیان زیاد کردووە (لە ساڵی ۲۰۰٤ دا بڕی ۱,٥ گملیار دۆلاریان دا بە ئاسیا و ۲,۷ ملیاریشیان وەك یارمەتی دا بە ئەفریقیا). شێوازی دابەشکردنی یارمەتی چینی لەگەڵ پاڵپشتی سیاسی چەقی قورسایە لە سیاسەتی سەرنجڕاکێشان و باوەشکردنەوەی بۆ جیهان. لەو کاتەی یارمەتیدەرە رۆژئاواییەکان هەمیشە یارمەتییەکانیان دەبەستنەوە بە داخوازی پاراستنی مافی مرۆڤ لە وڵاتە وەرگرەکان لەگەڵ چاکسازی سیاسی، ئەوا بەیگین بە ئاشکرا رایدەگەیەنێت کە هەڵسوکەوتی ئەو وڵاتانەیان بەلاوە گرنگ نییە لە کاتی مامەڵە کردن لەگەڵ وڵاتانی جیهانی سێهەم. ئەوان تەنها یەك مەبەستیان هەیە، ئایا ئەم جۆرە پەیوەندییە لە قازانجی چین و پاراستنی بەرژەوەندییەکانیەتی؟ هەر چەندەی چین خۆشحاڵە بە یارمەتی دانی رژێمە سەرکوتکەرەکان، بەڵام نایانەوێت ببن بە سەرۆکی هاوپەیمانەتییەك بۆ رژێمە رووخاوەکان. کاتێك چین تووشی فشار و شەرمەزاری بوو بە هۆی پەیوەندییەکانیەوە لەگەڵ کۆریای باکوور، سودان، زیمبابۆی و بۆرما، ئەوا فشاری خستە سەریان بۆ ئەوەی بە خۆیاندا بچنەوە تا چاکتر قەبووڵبکرێن لە کۆمەڵگای نێودەوڵەتی، لە هەمان کاتیشدا بۆ رێگا گرتن لە بەردەم رۆژئاوا تا بڕیاری توند دژ بەم وڵاتانە دەربکەن.
لە کۆتاییشدا لێکۆڵەرە چینییەکان سەرنجی ئەوەیان داوە کە شەرعییەتی USA لە سەرکردایەتی کردنی دونیادا دەکەوێتەوە بۆ بەهێزی شەفافییەت لە ئاستی سیستەمی سیاسی کە رێگا بە میللەت دەدات کە دەنگیان ببیسترێت لە شەڕی نێوان وەزارەتی دەرەوە و پنتاگۆن (وەزارەتی بەرگری) و کۆشکی سپی. هەر چەندە لەو ساڵانەی دواییدا زۆر لە وڵاتان گلەیی ملهوڕی و بێمنەتی سیاسەتی ئەمریکییان

دەکرد، بەڵام ئەوە هیچ شەفاعەتێکی بۆ نەکردن تا بڕیاری سوپر پاوەر بە شێوەیەکی تر بێت، یانیش نەیانتوانی کاریگەری لەسەر بڕیارو گۆڕینی بڕیارەکانی USA بکەن. چین هەستی بەمە کرد و" دیپلوماسیەتی گوێگرتن" داهێنا کە بووە بنەمای دامەزراندنی هەمە لایەنی بەرامبەر تاك لایەنی ئەمریکی. یان خیوتزنگ دێتە قسە و دەڵێت لەدە ساڵی داهاتوودا وا لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەکات کە بەردەوام بێت لە سیاسەتی بڕیاردانی تاك جەمسەری. لە هەمان کاتیشدا چین بەردەوام دەبێت لە دیپلوماسیەتی هەمە لایەنی بۆ باشتر کردنی پەیوەندییەکانی لەگەڵ دراوسێکانی، هەروەها بەردەوام دەبێت و دەڵێت یەکێتی ئەوروپا و EU لەگەڵ ولاتە تازە پێگەیشتووەکانی شوێنەکانی تری جیهان رەنگە هاوپیمانیەتێکی ستراتیژی دروستبکەن دژ بە USA (زۆر بە گەشبینی و حەماسەوە ئەم رایەی دەخاتە روو).

چاودێرە رۆژئاواییەکان زۆر بە شك و گومانەوە تەماشای چۆنیەتی مامەڵە کردنی چینییەکان دەکەن لە سایەی نەرمە هێزو دەستکەوتەکانیان، ئەوەش روونەکەنەوە کە ژمارەیەکی کەم لە لیبراڵ دیموکراتەکان ئامادەن ئازادییەکانیان بگۆڕنەوە بە بازاڕی ئابووری کۆمونیستی. چای سەوز،جاکی شان و کۆنفۆشیوس، ئەوان دەڵێن ناتوانن شان بە شانی ماکدۆناڵدز، هۆلیود وگێتیسبێرگ ئەدریس" Gettys burg Address " (ئەم شوێنەیە کە ابرهام لینکولن سەرۆکی ئەمریکی لە کاتی شەڕی ناوخۆ بە بەیاننامەیەك کۆیلەکانی ئازاد کرد لەم شارە کە کەوتۆتە ولایەتی ڤێرجینیا). بەڵام چین توانیویەتی خۆی گرێدراوی زۆر بەرپاوەر و بیرۆکەی گەورە و سەرنجراکێش بکات، کە جێگای سەرنجی ولاتانی تازە پێگەیشتوو و مامناوەندی دەرامەتن، بە تایبەت ئەوانەی کە رۆژێك لە رۆژان لە لایەن رۆژئاوا وا داگیرکراو بوون (بە واتایەکی تر ٩٠٪ ولاتانی جیهان). چونکە چین ولاتێکی زۆر گەورەیە رەنگە شەرعییەتێکی زۆریان لێ وەدەستبهێنێت.

زۆر سەخت دەبێت ئەگەر گفتوگۆ لەسەر ئەوە بکەیت کە نەرمە هێـزی چـین لـە گەشە بووندا نەبوو بێت. هۆیـەکی سـەرەکیش دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەوەی چـین لەسـەر ئاستێکی زۆر نزمەوە دەسـتیپێکرد. لـە سـەردەمی مـاودا مەترسـی دروسـتکردووە بەسەر دراوسـێکانی، هـانی شۆڕشـی داوە بۆتـە هـۆی نائـارامی لـە ناوچـەکە. بـۆ بەشەکانی تری دونیاش بە غەریب لە قەڵەم دراوە. بـێ لایـەن نـەبووە و گرنگیـشی نەداوە بە وڵاتانی تر بۆ دەیەها ساڵ. بەڵام دیپلۆماسیەتی ژیرو بـاق و بریقـی ژمـارە جووتەکانی گەشەسەندنی ئابووری وایانکرد دەوروبەر هەست بە زیرەکیان بکـەن. بـەم دوایە "BBC ی خزمەتی جیهانی لە راپرسییەك سەبارەت بە کاریگەری چین بەسـەر جیهاندا کە لـە٢٢ وڵاتـدا ئەنجامـدرا بـوو دەرکـەوت کـە ٤٨٪ پێیـان وابـوو رۆڵ و کاریگەری چین پۆزێتیفە کە ١٠٪ لە ئەمریکا زیاترە.

هەندێك لێکۆڵەری چینی پێیانوایە لە مەودای دوور بەیگین ناتوانێت شـەرعییەت لەسەر ئاستی جیهاندا وەدەستبهێنێت ئەکە گۆڕانکاری گرنگ و گەورە لەسەر ئاستی ناوخۆ ئەنجامنەدات. یان خیوتۆنگ زۆر بە چاکی وەسفی ئەم حاڵەتە دەکات و دەڵێت: ئەگەر تۆ لە ماڵەکەت یان لە وڵاتی خۆت سیستەمێکی سیاسی باشـت نـەبێت، زۆر ئەستەمە بتوانیت پاڵپشتی دراوسێکانت وەدەستبهێنیت. ئەگەر چین بیـەوێت نەرمـە هێزی خۆی زیاد بکات و پەرەی پێبدات"Soft Power" دەبێت چاکسـازی سیاسـی ئەنجامبدات. بەڵام ئێستا و تا ماوەیـەکی مامناوەنـدیش رەنگـە چـین سـوودمەندی سەرەکی بێت لە لاواز بوونی نەرمە هێزی ئەمریکی دوای شەڕی عێراق، ئەمـەش بـە پشت بەستن بە بەناوبانگبوونی چین لە هەوڵـدانی بـۆ ئـەوەی وەك هاوتـای ئـەمریکا ببینرێت.

(Americans Mirror image). لەو کاتەی داڕێژەرانی سیاسـەت لە واشنتۆن پاڵەوانی یەك دەنگین، ئەوا چینییەکان باس لـە سـەرکەوتن و پێشـکەوتنی هـەنگاو بەهەنگاون لەگەڵ کۆمەڵگای بە یەکەوە گونجاو و هەماهـەنگن. لـەو کاتـەی USA شەڕ خوازە، داڕێـژەرانی سیاسـەت لـە چـین باس لـە ئاشـتی دەکـەن، لـەو کاتـەی

دیپلۆماتکارە ئەمریکییەکان بلێن لە گۆڕینی ڕژێم دەکەن، هاوتا چینییەکانیان باس لە ڕێزگرتن لە سەروەری و هەمە جۆری شارستانیەت دەکەن. لەو کاتەی سیاسەتی دەرەکی ئەمەریکی بۆ جێ بەجێ کردنی ناماڵجەکانی پشت دەبەستێت بە سزای ئابووری و دابڕاندن.

"Isoltation"، بەڵام چینییەکان یارمەتی بێ بەرامبەر و بێ مەرج دەبەخشن و بازرگانی بێ باج دەکەن. لەو کاتەی ئەمریکا مەرجەکانی بەسەر دۆست و هاوپەیمانەکانی دادەسەپێنێت. ئەوا چین بە سەنگفراوانییەوە گرێ لە وڵاتانی جیهان دەگرێت. دوابەدوای خستنە ڕووی ئەم هەموو جیاوازییانە دیپلۆماتکارە چینییەکان لەگەڵ پیاوانی دەوڵەتی چینی بۆیان دەرکەوت کە ٨٠٪ سەرکەوتن هەروەك ئەکتەر وەی ئالنWoody Allen دەڵێت وا بەدەر دەکەوێت.

سەرهەڵدانی هێزی هەمەلایەن شەش مانگ لە دوای ڕووخانی یەکێتی سۆڤیەت، سیوچوار کەس لە زیرەکترین سیاسەت دارێژەری دەرەوەی ئەمریکی کۆبوونەوەیەکیان سازدا لە زانکۆی ستانفۆرد "Stanford" بۆ پێکهێنان و دۆزینەوەی" ڕێکخستنی پرنسیپێك بۆ بیرکردنەوە سەبارەت بە جیهان و مامەڵەکردن لەگەڵ ڕووداوەکان" . بە ئومێدی ئەوەی بتوانن بنەما هزرییەکەی جۆرج کێنان"George Kennan"شەڕی سارد کە بریتی بوو لە بنەمای چوار دەوردان بەر پەرچ دانەوە

"Doctrine of Containmeat and deterrence" بگۆڕن بە بنەمایەکی تازە گونجاو بێت لەگەڵ فەلسەفەی دوای ئەمانی شەڕی سارد. لە شوێن ئەمەش بیروباوەڕێکی تازە و مەزن هاتە کایەوە: دروستکردنی ڕژێمێك بۆ" ئاسایشی هەرەوەزی و هەماهەنگی"" "Co- operative Security ئەمەش ڕێگا بە وڵاتان دەدات کە سوودمەند بن لە ئاشتی هەر لایە و بە گوێرەی بەشی خۆی. نەك وەك ناتۆNATO کە بریتیبوو لە هاوپەیمانیەتی دژ بە لایەك یان ئەمیارێك، ئاسایشی هەرەوەزی دەبێتە هۆی دروستکردنی متمانە لە نێوان میللەتان لە ڕێگای شەفافیەت و چاودێری بەرامبەر و هاوکاری.

لەو کاتەی ئەم بیروباوەڕە بوو بووە جێگای سەرنجی زیاترو زیاتر، سەرنجی یان خیوتۆنگیشی راکێشا، یان پێیگوتم کە چۆن خۆشحاڵ بووە و چەندیش گەشبین بووە بە بیستنی ئەم بیروباوەڕە، کە هاریکاری سەربازی مەرج نییە دژ بە لایەنێك بێت.بە پێچەوانەی ناتۆ NATO کە دژ بە روسیا دامەزراوە. ئەمەش وادەکات هەڕەشەی کەمتر دروستبکات. ئەمەش وایکرد کە بکەوێتە پرسیار داخوا ئاسایشی هەرەوەزی دەبێتە هۆی داپینکردنی میکانیزمێك کە چین خۆ تازە بکاتەوە و هێزی سەربازیش نوێ بکاتەوە بەبێ ئەوەی شك و گومان لە لای دراوسێکان پەیدا بکات، رێك پێچەوانەی ئەوانەی کە دەیانەوێت لە سایەی ئاسایشی هەرەوەزی. لەم قۆناغەدا یان خیوتۆنگ لێکۆڵەرەوە بوو لە دەزگای پەیوەندییە نێودەوڵەتییە تازەکانی چین- کە دەزکایەکی بیرمەندانە و سەر بە وەزارەتی ئاسایش ، لەوێش گروپێکی پێکهێنابوو توێژینەوەی لەسەر ئەم بنەمایە. ئەم کارەش بوو بە هۆی دروستبوونی دەزگایەك لە بیرۆکە و بیروباوەڕ کە لە کۆتاییدا ناسران بە" بیروبۆچوونی تازەی ئاسایش" ( New Security Concept) .

بیروبۆچوونی تازەی ئاسایش جیاوازی دەکات لە نێوان هەڕەشەی ئاسایشی ئاسایی (مەترسی داگیرکردن لە لایەن وڵاتانی تر) و هەڕەشەی ئاسایشی ناناسایی (تیرۆرزم، جودا خوازی"Secessionism"، کارەساتی ژینگە، نەخۆشی (کۆمەڵکوژ). یان خیوتۆنگ چاکی بۆچووە کە دەڵێت هاوکاری و هاوپەیمانی سەربازی داهاتوو رەنگە لەسەر مەترسییە تازەکان بە ئاسانی ئەنجامبدرێت وەك هەڕەشەی ئاسایشی ناناسایی. وڵاتان کۆ بکاتەوە بۆ رێکەوتن دژ بە دوژمنە زەقەکان وەك" تیرۆرزم". بەڵام نەك دژ بە میللەتان یان وڵاتان. لە پەنای بیروبۆچوونی ئاسایشی تازەی یان خیوتۆنگ هاندەرێکی زۆر بەهێز هەبوو بۆ ئەوەی چین واز بهێنێت لە دژایەتی کردنی دەزگا فرە لایەنەکان (دوو دەوڵەت یان زیاتر)"Multilateral Institution" . چونکە دەستیکرد بە سوود وەرگرتن لە جیهانگیری و خۆی سازو ئامادە دەکرد بۆ ئەندامبوون لە رێکخراوی بازرگانی نێودەوڵەتی. یان خیوتۆنگ گفتوگۆی لەسەر ئەوە

دەکرد کە دەبێت چین دووبارە پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ دراوسێکانی دابڕێژێتەوە و لە چوار دەوری دەزگای لەم جۆرەدا کۆببێتەوە. بەڵام زۆری پێ نەچوو تا بیروبۆچوونەکانی یان خێوتۆنگ ببن بە راستی.

یەکەم هەنگاوی چین بەرەو دراوسێکانی رۆژئاوا بوو. چوار ساڵ دوابەدوای رووخانی یەکێتی سۆڤیەت، چین کۆبووە لەگەڵ رووسیا، کازاخستان، قەرغیزستان و تاجیکستان بۆ پەرە پێدان و دروستکردنی رێکخستنی کاروباری ئاسایشی هەرەوەزی (Co- Operative Security) کە ناویان نا (پێنجی شانگەهای). سەرەتا دەستیانکرد بە وتو وێژ سەبارەت بە پەیمانامەی چەك دامالین کە سنووری ٤٣٠٠ میل دەگرێتەوە کە بەشدارن تێیدا، دواتریش پەرەیان بە هاوکارییەکەیان داو بۆ ئەوەی ئاسایش و بازرگانی بگرێتەوە. لە ساڵی ٢٠٠١ ئۆزبەکستان بوو بە ئەندام، بەم جۆرەش ناوی گروپەکە گۆڕدرا بۆ رێکخراوی هاریکاری شەنگەهای"SCO ".

ئەم رێکخراوە تازیە بارەگایەکی عەمەلیاتی هەیە لە ئۆزبەکستان بە ناوی " بارەگای دژە تیرۆری هەرێمی"، "ئەنجومەنێکی بەرزی لە مۆسکۆ"و " سکرتاریەتێکی هەمیشەیی لە بەیگین". تا ئەمڕۆ توانیویانە هاوکاری ئابووری و جێ بەجێ کردنی پاساو پاراستنی سنوور، هەروەها دوو مانۆڕی سەربازی هاوبەشیان ئەنجامداوە. هند، پاکستان، مەنگۆلیاو ئێران بوون بە ئەندامی چاودێر لە"SCO". ئەمریکا راستە ئەگەر نیگەران بێت لەم پێشکەوتنە. چونکە ئەگەر رۆژگارێك چاودێرەکان ببن بە ئەندامی تەواو لە SCO ئەوا چوار دەوڵەتی خاوەن ئەتۆم لە یەك رێکخراو کۆ دەکاتەوە لەگەڵ سێ ئابووری زۆر بەهێز و ئەندازەیەکی زۆری سەرچاوە سروشتییەکان.

رێکخراوی هاریکاری شانگەهای بێ هاوتایە. ئەم رایە بە درۆ دەخاتەوە کە تەنها وڵاتانی رۆژئاوایی توانای دامەزراندنی رێکخراوی فرە وڵاتی سەرکەوتوو دامەزرێنن. رێکخراوەکە ناوی شارێکی چینی هەڵگرتووە. بەهاکانی دەوڵەتی چینی گرتۆتەخۆ. هەر چەندە جیاوازی هەیە لە نێوان مۆسکۆ و بەیگین، چونکە رووسیا زیاتر باس لە ئەمن و ئاسایش دەکات، چینیش هەوڵدەدات ئەم رێکخراوە بەکار بهێنێت بۆ گەیشتن

به گاز و نەوتی ناوەراستی ئاسیا، بەلام هەردوو سوپر هێز"Superpowers" یەکگرتوون لەسەر بەڵێنەکانیان سەبارەت بە سەروەریی و سیستەمی حوکمڕانی سەرکوتکەری"Authoritarian". یەکێك لەو تومیدانەی کە رووسیا، چین و کۆمارەکانی ئاسیای ناوەراست هەیانە بە"SCO" بریتییە لە رێگە گرتن لەهەر شۆڕشێکی تری لە چەشنی شۆڕشی رەنگاورەنگ وەك: شۆڕشی گوڵ لە جورجیا، شۆڕشی پرتەقاڵی لە ئوکرانیا، یان ئەوەی ناونرا شۆڕشی گوڵی تولیپ" Tulip revolution" لە قرغیزستان. مۆسکۆ و بەیگین بە جیا پاڵپشتییەکی بەهێزیان کرد لە سەرۆکی ئۆزبەك ئیسلام کەریمۆف کاتێك بە توندی دژ بە خۆپیشاندەرانی دیموکراسی وەستا لە پایتەخت ئەندیجان Andijan لە مانگی ئایاری ٢٠٠٥، هەر لەو کاتەشدا چین راهێنان و مەشق پێکردنی بەهێزی پۆلیسی ولاتانی ئاسیای ناوەراست دەکرد.

بە واتایەکی سیاسی یان سەربازی، SCO وا خەریکە دەبێتە هاوتایەکی بەهێز بۆ ململانێ کردنی دژ بە NATO لە ئاسیای ناوەراست: لە لوتکەی ٢٠٠٥ کە لە ئەستانەی پایتەختی کازاخ بەسترا، ولاتانی ئەندامی SCO راگەیاند نامەیەکیان ئیمزا کرد و بلاو کردەوە کە داوا لە USA دەکەن کاتێك دیاریبکات بۆ کێشانەوەی هێزەکانی لە ئاسیای ناوەراست. لە کۆبوونەوەکانی SCO ی سالّی ٢٠٠٦ دا کە پێنجەم سالّیادی دامەزراندنی بوو، ئەندامانی "SCO کۆمەڵێك رێکەوتننامەیان مۆر کرد، وەك هاریکاری بواری وزە، جگە لە پشتگوێ خستنی رۆژئاوا بە ئاشکرا لە رێگای شەرمەزار کردنی سەرۆکی ئێران مەحمود ئەحمەدی نەژاد. لە مەودای دوور رەنگەSCO ببێتە بناغەی دامەزراندنی "هاوپەیمانییەتییەك بۆ سەروەری" گرنگترین ئامانجیشی بریتی دەبێت لە تەگەرە خستنە بەردەم هەوڵەکانی رۆژئاوا لە دەست تێوەردان لە کاروباری ولاتانی تر و بلاو کردنەوەی دیموکراسی. کە ئەمەش دەبێتە هۆی سەرنجراکێشانی ولاتانی جیهانی سێهەم بۆ "فەلسەفەی دەست تێوەرنەدان".

لە سەرەتادا بەیگین زۆر شك و گومانی هەبوو لە تێکەڵبوون لەگەڵ ولاتانی رۆژهەلاتی ئاسیا، چونکە مەترسی ئەوەیان هەبوو کە USA ئەم گروپ و ولاتانە

بەکاردەهێنێت بۆ چوار دەوروانی چین.بەڵام کاتێك بۆیان دەرکەوت کە ئەمریکا بە پەسندتری دەزانێت کە یەکە یەکە و بە جیا لەگەڵ هاوپەیمانانی و دۆستانی مامەڵە بکات وەك ژاپۆن، ئوسترالیا، فلیپین، کۆریاو تایلند لە جیاتی مامەڵە کردنی بە کۆمەڵ، ئەوا ئەم هەڵەیان قۆزتەوە و توانیان چین وەك پاڵەوانی یەکخستنی ئاسیا بخەنە روو. لەساڵی ۱۹۹٦ دا یان خیوتۆنگ هانی وەزارەتی دەرەوەی دا کە پێشنیازی ئەوە بکەن" بیروباوەڕی ئاسایشی تازە" بخەنە بەردەم ڕێکخراوی هەرێمی پاسفیکی ئاسیایی"Asian Pacific Region" بۆ ئەوەی قەبوولێبکەن و کاری بۆ بکەن. کیان کیچین"Qian Qichen" کە ئەوسا وەزیری دەرەوە بوو بە ڕەسمی ئەمەی خستە بەردەم گروپی هەرێمی ئاسیایی "ASEAN Regional Forum" ئەمەش گروپێکە کە ۱۰ وڵاتی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیایی لەخۆوە گرتووە. هەر لەو کاتەوە چین زۆر بە پەرۆشی پتەوکردنی قوولکردنی پەیوەندییەکانیەتی لەگەڵ ئەم وڵاتانە و دراوسێکانی. سەرکردەکانیان ئەنانەت باس لە پێکهێنانی یەکێتییەکی ئاسیایی وەك یەکێتی ئەورووپی ئاسا دەکەن. لە ساڵی ۲۰۰٤دا چین داوای پێکهێنانی کۆمەڵگای ڕۆژهەڵاتی ئاسیایی کە تاساڵی ۲۰۲۰ دراوی تایبەتی خۆی هەبێت. یان خیوتۆنگ وای بۆ دەچێت ناوچە بوونی هەرێمی"Regional Integration" وا لە نەیارانی چین دەکات، ژاپۆن و ئەمریکا کە زۆر بە تونـدی دژی ئەم کارە بوەستن چونکە لە ڕاستیدا دەبێتە هۆی دروستکردنی دەزگای هەرێمی بۆ دوور خستنەوەی USA و کەمکردنی کاریگەرییەکەی دژایەتی کردنی ئەمریکا بۆ هاوپەیمانانی چین لە ئاسیا ژاپۆنی تووشی تەنگ و چەڵەمە و سەر شێوان کردووە لە ناوچەکە لە کاتێك ژاپۆن نزیکترین دۆستی ئەمریکایە. یان خیوتۆنگ دەڵێت: ژاپۆن بۆ ئەوەی پەیوەندییەکەی لەگەڵ ئەمریکا بەباشی ڕاگرێت پیادەی جۆرە سیاسەتێك دەکات کە بریتییە لە دروستکردنی کۆسپ و تەگەرە لە بەردەم دروستبوون و پێشکەوتنی کۆمەڵگای ڕۆژهەڵاتی ئاسیا. ئەم سیاسەتەی زۆر لەو سیاسەتە دەچێت کە بەریتانیا گرتۆتەبەر لە پەیوەندییەکانی بە یەکێتی ئەورووپی.سیاسەتی ژاپۆن دژ بە هەرێمی کردنی

ڕۆژهەڵاتی ئاسیا ڕەنگە لە کۆتاییدا بە زەرەر و زیانی ژاپۆن خۆیدا تەواو بێت و پێگەی سیاسی لەق بکات لە ڕۆژهەلاتی ئاسیا. یان خیوتۆنگ دەڵێت ژاپۆن وەك بەریتانیا لە یەکێتی ئەورووپا دەبێتە ئەندامێکی پڕ کێشە و گرفت و بەنابەدڵی دەبێت بە ئەندام و دەبێتە هۆی بە فیڕۆدانی سەرمایەی سیاسی و لە هەوڵی بەردەوام دایە و دەبێت بۆ خاو کردنەوەی پرۆسەکە، لە جیاتی ئەوەی سەرکردایەتی بکات و ڕۆڵی پێشەنگی خۆی ببینێت کە بە پلەی یەکەم بە قازانجی خۆیان تەواو دەبێت.

لیبڕاڵ نەتەرناسیۆنالستە چینییەکان زۆر خۆشحاڵن و ئومێدێکی زۆریان هەیە بە" بیروڕای ئاسایشی تازە" هەروەك کۆمۆنستە تازەکان"New- comms" بەڵام بە هۆکاری جیاواز. کاتێك کنی یاکینگ"Qin Yaqing"ی ئەستێرە گەشەی لیبڕاڵ نەتەرناسیۆنالستەکان بابەتێکی پێشکەشکرد لەبەردەم بیروی سیاسی لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٤، ئەو هەلە دەگمەنەی قۆزتەوە بۆ ئەوەی کەیسی تێکەڵبوونی چین لەگەڵ دەزگا هەرێمی و جیهانییەکان. بەڵام لەو کاتەی یان خیوتۆنگ لە میکانزمێك دەگەڕێت تا ڕێگا بە چین بدات هێزی زیاتر وەدەستبهێنێت. ئەوا کن یاکینگ تێکەڵ بوونی لەگەڵ ڕۆژهەلاتی ئاسیا بە ڕێگا چارە دەبینێت بۆ ئەوەی چین پێشبڕکێ لەگەڵ دراوسێکانی کەمبکاتەوە، بەهەمان شێوەی یەکێتی ئەورووپی ڕێگا خۆشکەر بوو تا زلهێزەکان واز لە شەڕانگیزی بهێنن و بەیەکەوە بژین.

کن یاکینگ پەیوەندییەکانی چین لەگەڵ دراوسێ کانی بەراورد دەکات لەگەڵ عەلاقێك "Giant" مامەڵە لەگەڵ کورتە بالآیان دەکات. لە کتێبی سەفەرەکانی گالڤەردا"Gullivers Travels"،کورتە بالآکان یانیش (مرۆڤە چکۆلانەکان) گالڤەری " عەلاق" لە عەرز دەبەستنەوە بە سەدان پەتی باریك و لاواز. کن یاکینگ دەڵێت هەمان شت دەبێت لە ئاسیا ڕوو بدات. بەڵام لە جیاتی ئەوەی چاوەڕوان بین وڵاتە چکۆلانەکان، ئەم کارە ئەنجامبدەن و دەستپێشخەر بن، ئەوا چین دەبێت خۆی خۆی بە عەرز ببەستێتەوە بۆ ئەوەی هەموو ئەو شك و گومانانە بڕەوێنێتەوە کە دراوسێکانی هەیانە. کن یاکینگ تێکەڵبوونی ڕۆژهەلاتی ئاسیا بە باشترین ڕێگا

دەزانێت بۆ چین تا خۆی ببەستێتەوە بە کۆمەڵێك پێوەر و نموونە و بنەما کە ئەمانە نەك تەنها دەبنە هۆی ئەوەی وڵاتانی تر چین بە هەڕەشە نەبینن لەسەر خۆیان، بەڵکو وادەکات چین چیتر بیر لە هەڕەشە کردن نەکاتەوە: کاتێك چین بوو بە ئەندام لە هاریکاری هەرێم، چیتر بە چاوی دژایەتی یان هێزێکی شەڕخواز نەبینرا لە لایەن "ASEAN"، چین هەڵسوکەوتی کۆڕا بەرامبەر هەرێمی ئاسیا" Asian Regionalis" هەر چەندە چین، ژاپۆن و کۆریای باشوور بە یەکەوە ٩٠٪ ئابووری رۆژئاوای ئاسیا پێکدەهێنن، بەڵام رێگایان بە ١٠ وڵاتی (مرۆڤە چکۆلەکان) داوە تا بنەمای ئاسایش دامەزرێنن بۆ تێکەڵبوونی هەرێم. کن یاکینگ دەڵێت کورتەباڵاکان سەرکەوتوانە توانیان چین مالی بکەن (پشت) بکەن. یەکەم کۆبوونەوەی لوتکەیان لە ٢٠٠٥ بەست. چین وازی هێنا لەبەر هەڵستکاری کردنی هند و ئوسترالیا، سەرەڕای ئەوەی مەترسیان لەم دوو وڵاتە هەبوو کە یەك بگرن لەگەڵ ژاپۆن بۆ دروستکردنی بەرەیەکی دژ بە چین کە پێکهاتبێت لە وڵاتانی رۆژهەڵاتی ئاسیا. دیسان کن یاکینگ دەڵێت: ئەگەر چین دژی بڕیاری ASEAN بوەستابا. ئەوا تەنها سووکایەتی نەدەبوو بۆ ASEAN ، بەڵکو دەبووە هۆی دروستبوونی بێ متمانەیی و زیانی بەهاریکارییەکە دەگەیاند و پرۆسەکەی زۆر خاو دەکردەوە. کن یاکینگ درێژە بە قسەکانی دەدات و نیشانیدەدات کە چۆن تێکەڵبوونی هەرێمی هەڵسوکەوتی چینی گۆڕی لە پێناو بەرژەوەندی، هەروەها بادانەوەی چین بەرەو یەکیەتی ئاسیا بێگومان بوو بە هۆی پتەو کردنی کاریگەری چین لە ناوچەکەدا، هەروەها دڵنیایی بەخشی بە دراوسێکانی.

## سوپەر هێزی نەگونجاو "The asymmetric Super power"

هەر چەندە ئەدمیراڵ یانگ یی"Yang Yi" وەك هاندەرێك و پاڵپشتێکی زۆر بەهێز دەرکەوت بۆ بیرۆکەی نەرمە هێزی چین، بەڵام ئاماجی سەرەکی ئەو پێکهاتووە لە وەدەستهێنانی شەرعییەت بۆ پتەوکردنی هێزی هەمە لایەنەی چین. ئەدمیراڵ

یانگ یی دەڵێت: چین هێزێکی مەزنە و دەڵێت ئێمە دەتوانین هێزێکی سەربازی هاوهێز و گونجاو لەگەڵ پێگە و سومعەی نێودەوڵەتی دروستبکەین. لە وتارێکدا کەلە Global Times بڵاوکرایەوە گلەیی ئەوە دەکات کە کەلێنێکی گەورە دروستبووە بەردەوامە لە گەورە بوون لە نێوان خشتەی ئابووری چین و بەرژەوەندییەکانی و توانای چین لە پارێزگاری کردن لێیان.

ئەو مەترسی لە خێرایی بڵاو بوونەوەی بەرژەوەندییە ئابوورییەکانی چین هەیە لە کارگە و کارخانە و وەبەرهێنان لە بواری وزە و بەرهەمهێنانی کەرەستەی خاو، بازارە تازەکان وەك قارچك بڵاو بوونەتەوە بە چواردەوری دنیا، ئەمەش زۆر زۆر لە توانا سەربازییەکانی چین زیاترن، چونکە ناتوانێت پارێزگاریان بکات. یانگ یی دەپرسێت، چین چۆن دەتوانێت هاوڵاتیانی لە دەرەوەی وڵات بپارێزێت؟ چۆن دەتوانێت بەشدار بێت لە یارمەتیدان دوابەدوای کارەساتی سالی سروشتی؟

یان ئۆپەراسیۆنی دژە تیرۆر لە دەرەوەی وڵات، پێشکەشکردنی یارمەتی مرۆیی یان ئۆپەراسیۆنی ئاشتی پارێزی UN بەو هێزە سەربازییەی سەقەتەی کە هەیەتی؟ یان بۆ گەڕانەوە بۆ پرسیارە ئەزەلییەکەی بازنەی سیاسەتی دەرەکی چین، چۆن چین دەتوانێت پارێزگاری لە خۆی بکات لە بەردەم USA لە کاتی ڕوودانی جەنگ لەسەر کێشەی تایوان؟

لەو کاتەی یانگی یی هیچ دەرفەتێك بەفیڕۆ نادات بۆ گفتوگۆ کردن و هاندانی زیاد کردنی خەرجییە سەربازییەکانی چین، بەڵام لە هەمان کاتیشدا نایەوێت بەیگێن بکەوێتە پێشبڕکێ لەگەڵ USA بۆ خۆ پڕ چەککردن. ڕاستییەکی نەشاردراوە هەیە لای چینییەکان کە یەکێتی سۆڤیەت خۆی بوو بە هۆی لە ناو چوونی خۆی، چونکە زۆر بە مەغروری کەوتە پێشبڕکێ بۆ زاڵبوونی سەربازی. لە جیاتی هەوڵدان بۆ یەکسانی سەربازی لەگەڵ USA ، فڕۆکە بەرامبەر فڕۆکە و مووشەك بەرامبەر مووشەك، چینییەکان ڕێگای تازە تاقیدەکەنەوە زۆر لە سەرووتری ستراتیژیەتی نەگونجاو، بە واتایەکی تر لە خاڵە لاوازەکانی دوژمن دەگەڕێن و کاری لەسەر

دەكەن." شەڕی نەگونجاو یان نابەرابەر" ماوەیەكی زۆرە لە لای شارەزایانی بواری لەشكری زانراوە. ئەم ڕاستییەش ئاشكرابوو كە ئەم تاكتیكە لە لایەن تیرۆرستان بەكار دێت بۆ بردنەوە و زاڵبوون بەسەر لەشكری وەستاو، بەهەمان شێوەی كە (دێڤید بە تاقە بەردێك پاڵەوانە عملاقەكەی كوشت) (چیرۆكی كتابی پیرۆز). بەڵام چینییەكان ئەم مەسەلەیان چاكتر بەكار هێناوە لە تیرۆرستان. بیرمەند و پلان دانەرە چینییەكان ڕێگای تازەیان دۆزیوەتەوە بۆ زاڵبوون بەسەر تەكنەلۆژیای بەرزی نەیارانیان (وشەیەكی جوانە كە ماناكەیشی ئەمریكایە).

ساڵانە خەرجییە سەربازییەكانی چین ١٠٪ زیاد دەكات (ڕاپۆرتە هەواڵگەرییەكانی ئەمریكا مەزەندەی دەكات كە ئەم ژمارە دوو تا سێ جار زیاترە لەم ژمارەیە) بۆ جێ بەجێ كردنی ئارەزووە سەربازییەكانی وڵات. بەڵام تازە كردنەوەی لەشكر كە بریتییە لە دروستكردنی كەشتی تازە و كەشتی ژێر ناوی " Submarines " جگە لە كڕینی نەوەی چوارەم لە فڕۆكە جەنگییەكان ...و٩٠٠ موشەكی دوور هاوێژی ڕوو لە تایوان كردووە- ئەمەشی مانای لاسایی كردنەوەی ئەمریكا نییە. ئامانجەكەیشی بریتییە لە دۆزینەوەی ڕێگای هەرزان بۆ بێ بایەخكردنی ئەو باڵادەستییەی سوپای ئەمەریكی هەیەتی. لە جیاتی ڕكابەریكردنی USA لەسەر خاك و پرنسیپەكانی ئەمریكا، بەیجین دەیەوێت یارییەكی جیاواز بكات كە ڕەنگە بەیجین بیباتەوە.

بۆنموونە، لە تایوان لە جیاتی ئامادە كردنی لەشكری گەورە و چەكی پێشكەوتوو بۆ زاڵبوون بەسەر تایوان. بەیجین وایكرد كە نرخی پارێزگاری كردن لە تایوان لە لایەن ئەمریكاوە بەرزتر بێت لە حاڵەتی ڕوودانی شەڕ لەم دورگەیە.

بیست ساڵ لەمەوبەر USA دەیتوانی بە پیادە كردنی ستراتیژیەتێكی پارێزگاری قەڵغانێك لە چوار دەوری تایوان دروستبكات. بەڵام لە دەرئەنجامی تازە كردنەوەی لەشكری چینی ئەم ستراتیژیەتە بێ سوودە. ئێستا ئەمریكا لە بارێك دایە كە حەسوودی پێ نابردرێت، بۆ ئەوەی بتوانێت پارێزگاری لە تایوان بكات، دەبێت هێرش

بکاتە سەر خاکی چین. جموجۆڵەکانی ئاسمانی دەرەوەی چینی بەهەمان شێوەیە. بەیگین ئامانجی نییە کە شەڕێکی ئەستێرەکان بەرپا بکات دژ بە USA . لە جیاتی ئەوە دەیانەوێت بن کۆڵی پرنسیپی سەربازی ئەمریکا بکەن لە ڕێگەی دروستکردنی چەکی تازە کە توانای تێکشکاندنی سەتەلایتەکانی ئەمریکایان هەیە، کە بڕبڕەی پشتی هەواڵگەری سوپای ئەمریکییە. ئەو پلانە بوێر و پڕ مەترسییەی بەیگین دەبێتە هۆی کوێر کردنی سوپای ئەمریکی بە خستنە خوارەوەی سەتەلایتەکانیان و لە دەستدانی زانیاری هەواڵگەری زۆر گرنگ بۆ شەڕی لەم جۆرە. هیوای بەیگین بریتییە لەوەی ئەستەم بێت بۆ ئەمریکا خۆی بخاتە نێو هەر کێشەیەك لەسەر تایوان یان ژاپۆن.

گرنگترین فاکتەر لە هەوڵی چین تا ببێتە سوپەر هێزێکی نەگونجاو، ئەوەیە کە ئەم کارە لە دەرەوەی هەموو بنەماو پرەنسیپێکی دنیای هێزی سەربازی ئاسایی دایە. وردەکارییەکانی ئەم بۆچوونە لە کتێبێکیدا هاتووە بەناوی شەڕی فراوان یان شەڕی دیاری نەکراو"Unrestricted Warfare"کە یەکێك بوو لەو کتێبانەی زۆرترین ژمارەیان لێفرۆشراو لە ساڵی ۱۹۹۹ ئەم کتێبە لە لایەن دوو کۆلۆنێلی سوپای ئازادیخوازی میللی نووسراوە "Peoples Liberation Army" . لە سەرەتادا تەنها سەرنجی شارەزایانی سەربازی ڕاکێشا. بەڵام دوای هێرشی ئوسامە بن لادن بۆ سەر سەنتەری بازرگانی جیهانی زیاتر بەدەرکەوت و ناسرا. کە تیادا هاتووە: شك و گومانی ئەمریکا بۆ زاڵبوونی سەربازی وەدەستهێنانی تازەترین کەلوپەلی سەربازی لاوازترین خاڵی وڵاتە.

(ئەمریکا)، کە ئەمەش بۆتە هۆی چاوبەستانی سیاسەت داڕێژەکان بۆ وێنە گەورەکەی ستراتیژیەتی سەربازی: کە بەکار هێنانی چەکی ئابووری، یاسایی و سیاسی دەگرێتەوە. کتێبەکە کۆمەڵێك ستراتیژیەت دادەڕێژێت بۆ شەڕەکانی تر (ناسەربازی)، گفتوگۆ لەسەر ئەوە دەکات کە سەربازان شەڕیان پاوەن نەکردووە (مۆنۆپۆلیان بەسەر شەڕدا نییە).

لیستەکەیان بە شەڕی ئابووری دەستپێدەکات، بە نموونە باس لە تەنگو چەڵەمەی دراوی ساڵی ١٩٩٧ دەکات، هەر دوو نووسەرەکە زۆر بە ترسەوە باس لە هێزی بازرگانانی دراو دەکەن وەك جۆرج سۆرۆس "George Soros" کە چۆن توانی بنکۆڵی ئەوانەی پێیان دەگوترا پڵنگەکانی ئاسیا بکات، ئەو شەفافیەتە ئابوورییەی کە رۆژگارێك بوو بووە مایەی سەرسوڕمان و دڵخۆشکەری جیهانی رۆژئاوا، لە ناکاو بووە هۆی دڵتوندی"Depression"، هەروەك گەڵای دار لە شەوێکی پایزدا بە بایەکی بەهێز هەر هەمووی هەڵوەری. ئەگەر تاکە کەسێك وەك سۆرۆس بتوانێت ئەم زەرەرو زیانە گەورەیە دروستبکات تەنها بۆ قازانج، ئایا چین کە خاوەن ١٠٠٠ ملیار دولاری ماملەی بازاڕە دەتوانێت چ جۆرە زیانێك بە ئەمریکا بگەیەنێت. هەردوو نووسەر وەك دوور بینی یان پێشبینی کردن باسی مەترسی سوپەر تیرۆرزمیان کردووە و چاوەڕوانی کارێکی لەو جۆرە بوون کە ئوسامە بن لادن ئەنجامیدا دژ بە سەنتەری بازرگانی جیهانی دوو ساڵ بەر لە رووداني. زۆر بە راستیش پێشبینی ئەوەیان کرد بوو کە کاردانەوەی ئەمریکا زەرەر و زیانێکی زۆر بە ئەمن و ئاسایشی وڵاتەکەیان دەگەیەنن کە زۆر زیاترە لە خودی هێرشی تیرۆرستان: هەندێك جار دژەکەت یا بەرامبەرەکەت هەندێك هەنگاوی ئاسایی بگرێتە بەر بۆ بەکار هێنانی هێزی ئاسایی و پێوەری ئاسایی وەك باشترین هێز دژ بە نەیارانی... ئەمەش وەك ئەوە وایە فیلە بەرەڵاکانی لە دوکانێکی چینی بەرەڵلایە و هیچ کۆنترۆلیکت لەسەری نییە... فیلەکەشی ناتوانێت سوود لە هەموو هێزە زۆرەی خۆی وەرگرێت.

سەرنجراکێشترین فەرمزیەت بریتییە لەو بیرۆکەی کە رەنگە چین بتوانێت یاسای نێودەوڵەتی وەك چەك بەکار بهێنێت، یان شەڕی یاسایی بکات. نووسەرەکان دەڵێن هاوڵاتیانی وڵاتە دیموکراسییەکان هەمیشە داوا لە وڵاتەکانیان و حکومەتەکانیان دەکەن بە گوێرەی یاسای نێودەوڵەتی هەڵسوکەوت بکەن.بە تایبەتیش پەیوەندیدار بە مافی مرۆڤ و هەڵسوکەوت لە کاتی شەڕ. کەواتە حکومەتەکان بەستراونەتەوە بە رێکخراوە هەرێم و نێودەوڵەتییەکان، وەك ASEAN EV ، رێکخراوی یارمەتی

دراوی نێودەوڵـــەتی"IMF " بـــانکی جیهـــانی WTO و نەتـــەوە یـــەکگرتوەکان. نووسەرەکان دەڵێن چین دەبێت کۆپی نموونە و مۆدێلی ئەورووپایی بکاتەوە.

لە بەکار هێنانی یاسای نێودەوڵەتی بۆ راگرتنی USA . چوار هێزی مەزن هـەن کە بە ئاشکرا هێزو سوود وەردەگـرن لـە ڕێکخـراوە نێودەوڵەتییـەکان و " Supra- national "، و ڕێکخراوە ناحکومییەکان" Non state Players "بۆ زیـادکردنی دەسەلات و کاریگەریان. ئـەوان پێیـان وایەچـین دەتوانێـت نەتـەوە یـەکگرتووەکان و ڕێکخراوە هەرێمییەکان بەکار بهێنێت بۆ گەیاندنی دید و بۆچوونی چین بـۆ جیهـان- ئەمەش وادەکات کە USA ناچار دەکات چیتر نەتوانێت زلهێزی و توانای خۆی بخاتـە گەڕ بۆ کۆ کردنەوەی پاڵپشتی نێودەوڵەتی بۆ شەڕ وەك عێراق.

چەند لایەنێك لە شەری دیاری نەکراو

| سەربازی | TRANS-نێوان MILTARY | ناسەربازی |
|---|---|---|
| شەری ئەتۆمی | شەری دیپلۆماسی | شەری دارایی Financial |
| شەری ئاسایی | شەری شانسی Net work | شەری بازرگانی |
| شەری بایۆ- کیمیاوی | شەری زانیاری (جاسوسی) | شەری سەرچاوە سروشتییەکان |
| شەری ژینگە | شەری دەروونی | شەری یارمەتی ئابووری |
| شـــەری ئاسمـــانی (ئەستێرە) | شەری تاکتیکی | شەری ڕێکخستن |
| شەری ئەلیکترۆنی | شەری قاچاغچێتی | شەری یاسادان |
| شەری پارتیزانی | شەری دەرمانی قاچاغ | شەری میدیا |
| شەری تیرۆریستی | شەری واقیعی (بەرهەم دانەوە) | شەری ئایدۆلۆژی |

سەرچاوە: کیاژلیانگ Qiao Liang و وانگ زیانگسوی Wang Xiangsui ، Unrestricted Warfare (Berjing: PLA Literature and Arts Publisging House 1999)

زۆر لەو ستراتیژییە نەگونجاوانە خەریکە دەردەکەون، هەروەك (شی پنهۆنگ)ی لیبرال نەتەرناسیۆنالست دەڵێت وا USA لە شەڕی سەربازی لە ناوچەی پاسفیك سەرکەوتن وەدەستدەهێنن، بتکە سەربازییەکانیان بە هێز دەکەن لە گوام Guam ، توکیناوا Okinawa ، هاوای Hawaii.

چین ئەمەی پێخۆش نییە، بەڵام چین ئەم یارییە ناکات.بەڵکو یارییەکی تر دەکات کە پشتی پێ بەستووە بە وەبەر هێنانی ئابووری،بازرگانی، کۆچ کردن و دیپلۆماسیەتی خەندە "Smile diplomacy". USA ناتوانێت ئەمە راگرێت. بەم جۆرەش یاری چین دەدۆزرێتێت. ناتوانێت بووژانەوەی چین راگرێت. ئەوەی شی پنهۆنگ مەبەستیەتی ئەوەیە، چین لە هەوڵدایە بۆ گۆڕینی بنەماکانی یاری و پێشبڕکێ بۆ باڵادەستی لە رۆژهەڵاتی ئاسیا، لە جیاتی رووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ ئەمریکا سەربەسەر ، ئەوا چین مانۆڕ دەکات و لە چوار دەوریدا دەسوڕێتەوە بۆ دۆزینەوەی خاڵی لاواز. ئەمەیش وەك ئەوە وایە کە ئەمریکا تیمێکی زۆر بەهێزی تێنسی سەر زەوی هەبێت، بەڵام چین دەیەوێت یارییەك لەگەڵ ئەمریکا بکات کە خۆی تێیدا باش بێت بۆیەش دەیەوێت یاری تێنسی سەر مێز بکات کە تیمی وان زۆر چاکن بە هیوای ئەوەی بتوانن لێیان ببەنەوە. چین زۆر بە هێمنی و زمانێکی شیرین توانیویەتی کاریگەری ئەمریکا لە هەندێك وڵات کەمکاتەوە، وەك کۆریای باشوور. لەبەر ئەوەی بە زمانی هاریکاری و گۆڕینەوەی بازرگانی و هاوکاری نێودەوڵەتان قسە دەکات ترس و گومانی لای دراوسێکانی دروستنەکردووە.

## چین بەرەو کوێ دەچێت؟

چین وەك مەکینەیەکی کاتی زۆر گەورە بە (آلە الـزمن-Time Machine) کە چەندین سەدەیە بیر لە چۆنیەتی وەدەستهێنانی هێز دەکاتەوە. هەروەك ئەوروپا، چین زۆر لە نیشانەکانی خاڵە پرشنگدارەکانی هەیە بۆ بەڕێوەبردنی چەرخی بیست و یەك. سەرکردەکانی بیروباوەڕی سەقامگیری و بە یەکەوە ژیان بڵاو دەکەنەوە. دەپلۆماتکارە

کانیشیان دوای هەمە لایەنی دەکەن (تعددیە) لە جیاتی تاك لایەنی. ستراتیژ دارێژەرەکانیشان زۆر پشت دەبەستن بە بازرگانی لە جیاتی شەڕ بۆ پەیدا کردنی دۆست و لایەنگیری تازە و داگیرکردنی شوێنی تازە لە جیهاندا. ئەمڕۆ چین بەیەکسانی تا رادەیەك یەکسانە لەگەڵ ئەمریکا لە چەرخی بیست ویەکدا، پارەیەکی زۆر خەرجدەکەن لە تازە کردنەوەی لەشکر، پاراستنی سەروەری و بە حەماسێکی نەتەوە پەرستی پاس لە یەکگرتنەوە دەکەن لەگەڵ تایوان.

چینی چەرخی بیست ویەك وایکرد کە خەڵك باوەڕ بە ئاماجە ئاشتیخوازیەکانیان نەکەن و خۆشیان تووشی نیگەرانی و هەڵوێستی دژ بە یەك بکەن و ترسیان یەکجار زۆر بێت لە دوژمنەکانیان، هەر چەندەی بچووك بن، بە تایبەت دورگەیەکی بچووکی ۲۰ ملیون کەس، ئاشتیخواز ترین پیاو لەسەر رووی زەمین، کە پێیدەڵێن هەرشەی دلای لاما"Dalai Lama"، خۆی تایفەیەك کە ناسراون بە چا خواردنەوە و خواردنی سەوزە (Falun Gong). مەترسی لە بەدەستدانی تایوان و سەربەخۆ بوونی بوونەتە هۆی زیادکردنی خەرجییە بەرگرییەکانیان بە جووت ژمارەیی و ئامادە کردنی ۷۰۰ رۆکێت و مووشەك دژ بە تایوان. چینییەکان زۆر مەترسییان هەبوو لە تایوان نەوەك ئەم نەرمییەی چین بقۆزێتەوە بۆ راگەیاندنی سەربە خۆیی، ئەمەش لە ژێر کاریگەری" بووژانەوەی ئاشتیخوازی" . تایوانیش تەنها یەکێکە لەو "پێنج ژەهرەی" کە چین لێیان تۆقیوە نەوەك ببن بە هۆی هەڵوەشانەوە و لەت لەت بوونی چین و نەتەوەکەی- ئەوانەی تریش بریتین لە جوداخوازە موسڵمانەکانی ختجیانگ Xinjiang ، تبت Tibet ، مەنگولیا و هەرێمەکانی دەوروبەری کۆریا. زۆر لەو مەسەلانەی کە بوونەتە هۆی دروستبوونی گرژی لە نێوان چین و رۆژئاوا وەك پێشبڕکێ بۆ سەرچاوەکانی وزە، رۆڵی چین لە ئەفریقیا، راگرتنی پیتاندنی ئەتۆمی لە ئێران و کۆریای باکوور دەکرێن خاو بکرێنەوە بە تاکتیکی نەرم نواندنی لە لایەن هەردوولاوە. بەڵام سەرەڕای ئەم قسە زۆرەی سەبارەت" هەمە لایەنی و هێزی نەرم" و پشت بەستن بە یەکتر (Interdependence)، ترسی تایوان بۆتە تەگەرەیەکی مەزن لە بەردەم

چین تا بە راستی ئەم هەموو دروشمانە جێ بەجێ بکات و بۆ بوون بە بەشێك لە جیهانگیری. هەر چەند گوێ بیست دەبم کە چینییەکان گفتوگۆ لەسەر تایوان دەکەن وتەی" مایکل کۆلیون" م دێتەوە یاد لە فلیمی (العرب) کە دەڵێت: لەو کاتەی وامدەزانی من وازم هێناو دەرچووم، ئەوا جارێکی تر پەلکێشیان کردە ناوەوە. بۆ میللەتێکی کە بایەخ و گرنگییەکی زۆر دەدات بە مێژوو و لێکۆڵینەوەی مێژوویی (Longue-duree)، ئەوا بیرمەندە چینییەکان زۆر شەرمنن سەبارەت بە داهاتوویان. کاتێك لێیان دەپرسێت گەورەترین یان لوتکەی هێزی چین چۆن دەبێت

(Hyper-power)؟ ئەوان لە وەڵامدا زۆر خۆشحاڵن و تووشی سحر دەبن بەم پرسیارە، لیستە یەك لە کێشە ناوخۆییەکان دەخەنە روو، لەو کاتەی زۆر راستگۆن لە وەڵامەکانیان، ئەوابیرمەندەکانی سیاسەتی دەرەوەی چین دوو رێگاو دوو ئەگەر دەخەنە روو. لیبرال ئەنتەرناسیۆنالیستەکانی وەك زهینگ بیجیان Zheng Bijian یان کن یاکینگ حەز لە باسکردنی ئەوە بکەن کە چۆن چین دووبارە بەشداری دنیا کرد و هاتەوە ریزی وڵاتان، هەروەها چۆن وردە وردە بڕوایان هێنا بە بەها جیهانییەکان و فێری ئەوە بوون بەشدارییەکی پۆزەتیڤ بکەن لە سیستەمی جیهانی. ئایا دەزانیت ماو چەند جار سەفەری بۆ دەرەوەی وڵات کرد لە کاتی سەرۆکایەتی چین؟ ئەوە پرسیاری یەکێك لە برادەرەکانم بوو لە لیبڕال ئەنتەرناسیۆنالیستەکان. کاتێك لە بەیگین بووم ئەم پرسیارەی لێکردم: هەر خۆیشی وەڵامی دایەوە. تەنها دوو جار. یەکەم جار بۆ مۆسکۆ لە ١٩٥٠، جارێکی تریش هەر بۆ مۆسکۆ لە ١٩٥٧. دیسان پرسی: ئایا دەزانی سەرۆك هیوجینتاوز"Hu-Jintao" چەند سەفەری دەرەکی ئەنجامداوە لەم ساڵ؟ پرسیارێکی خیتابی بوو، چونکە تەنانەت برادەرەکەیشم وەڵامەکەی نەدەزانی، تەنها لەو حەفتەیەدا سەرۆکە پەرچەم بە بریقەکە کۆبوونەوەی لەگەڵ سەرۆکی کۆمەڵێك لە وڵاتانی دنیای ئەنجامدابوو، لەوانەش: جەزائیر، بەرازیل، کەنەدا، فەرەنسا، هیند، ژاپۆن، مالیزیا، سویسراو USA. لە دارفۆرەوە بۆ تەهران، کەرەکاس بۆ هاڤانا، پیۆنگ یانگ بۆ دەلهی، هەراری بۆ لواندا، دەنگی چین

دەبیستریت. حەزو پێویستییە لە بن نەهاتووەکەی چین بۆ وزە، سەرچاوە سروشتییەکانی و بازاڕ سەرۆکی ئەم وڵاتەی بۆ هەر چوار قوژبنی دنیا برد، بۆ گەڕان بەدوای هەموو ئەوانەو دابینکردنیان بۆ ئەم مەبەستەش دەیان هەزار میل لە ئاسمان بێت.

هەر چەندەی چین زیاتر تێکەڵ بە جیهان دەبێت، هەروەك دەڵێن زیاتر هەوڵی چارەسەر کردنی کێشە جیهانییەکان دەدات. لەم ساڵانەی دواییدا چین لە رێگە شەش لایەنەکە خەریکی چارەسەر کردنی کێشەی ئەتۆمی کۆریای باکوورە، لە لایەکی تریش لەگەڵ وڵاتانی یەکێتی ئەوروپا و رووسیاو USA کار لەسەر ئێران دەکەن، هەڵوێستی چارەسەر خوازیان وەرگرتووە سەبارەت بە قەیرانی گۆڕانی ژینگە لە کۆنفرانسی ڤانکۆڤەر، رەوانەکردنی ٤٠٠٠ بۆ کاری ئاشتی پارێزی UN تەنانەت بۆ ئەو کارانەی کە چین خۆیشی لەگەڵ رۆژئاوادا زۆر کۆك نییە، وەك دەست تێوەردان بەهۆی هۆکاری مرۆیی- هەڵوێستی چین، چین گۆڕانێکی کەمی بەسەردا هاتووە. کاتێك رۆژئاوا ویستی دەستێوەردان بکات لە کۆسۆڤۆ چین دژی وەستا بە بەهانەی ئەوەی ئەنجامدانی ئەم کارە پێشێلکردنی" بنەمای دەستێوەرنەدانە لە کاروباری ناوخۆی وڵاتان". هەروەها لەسەر مەسەلەی دارفۆر دوای ئەوەی چین بۆ چەندین مانگ بوو بوو بە رێگر لە بەردەم کردنی هەر پرۆژە بڕیارێك، بەڵام لە کاتی سەرۆکایەتی کردنی ئەنجوومەنی ئاسایشی چین دەنگی دا بۆ ناردنی هێزی ئاشتی پارێز بۆ دارفۆر. لەسەر عێراق دەنگیان نەدا. زۆر لە چینییەکان دەڵێن بەیگین وردە وردە هەڵوێستی دەگۆڕێت سەبارەت بە سەروەری و دەستێوەردان لە کاری ناوخۆی وڵاتان لە ژێر بەهانەی مرۆیی. ئەمەیش لە قازانجی پاراستنی مافی مرۆڤە بە گشتی. لە لایەکی تریش، کۆمۆنیستە تازەکانی Neo-coomms وەك یان خیوتۆنگ بە ئاشکرا دەڵێن کە ئەوان بیر کردنەوەی مۆدێرن و هاوچەرخ بەکار دەهێنن بۆ ئەوەی چین بە خەونە هەمیشەییەکانی بگات. ئامانجی سەرەکیشیان گێڕانەوەی چینە بۆ ریزی دەوڵەتە زلهێزەکان، بۆ ئەوەی سیستەمێك دروستبکات بە گوێرەی دیدو تێڕوانینی خۆی. هەروەك زۆربەی لێکۆڵەرە چینییەکان زۆر بە وردی هێزی کۆنی چین

دیراسەت دەکەن، یان دەڵێت:" بەم دواییە هەموو ئەوکتێبە کۆنانەم خوێندنەوە کە لە لایەن لێکۆڵەرە چینییەکان نووسرا بوون و بۆم دەرکەوت کەم پیاوانە بە راستی زیرەکن، بیرۆکە و بیروباوەڕەکانیان زۆر لە تیۆر و میتۆدی پەیوەندییە نێودەوڵەتییە هاوچەرخەکان گونجاوترن".

ئەوەی سەرنجی راکێشام ئەو جیاوازییە بوو کە لێکۆڵەرە چینییە کۆنەکان لە نێوان دوو جۆر نیزام (Order) کرد بوو: ژانگ و (Wang) و با (Ba) سیستەمی وانگ (Wang) خۆی لە چوار دەوری سوپرهێز دەدۆزێتەوە (Super Power) بەڵام ئەولەویەت تیایدا لەسەر بنەمای نەرم و میانی حکومەت بوو، لە جیاتی ترس و تۆقاندن و فراوان بوونی هەرێمی بە پشت بەستن بە شەڕ و جەنگ. سیستەمی با (Ba) لە لایەکی تر بریتیبوو لە کۆنترۆڵکردنی کلاسیکی کە بریتیبوو لە فەرز کردنی بەهێزترین نەتەوە و فراوانکردنی دەسەڵاتی بەسەر دەوروبەری لە رێگای هێز. یان باسدەکات چۆن چینییە کۆنەکان هەردوو سیستەمیان بەکار هێناوە. لە بەشی ئاسیای چینیدا سیستەمی وانگ بەکار دەهات، لە دەرەوەیشی کاتێك مامەڵەی لەگەڵ بەربەریەکان دەکرا سیستەمی هێزو فەرز کردنی دەسەڵات لە رێی هێزەوە پیادە دەکرا. ئەمەیش دەقاودەق ئەو سیستەمەیە کە ئەمڕۆ USA پیادەی دەکات، کە لەگەڵ رۆژئاوادا سیستەمی وانگ پیادە دەکات و هێز بەکار ناهێنێت بۆ فەرز کردنی جووت پێوەری (Double Standards) بەڵام لەسەر ئاستی جیهانیشدا، USA لە رێگای هێزەوە دەسەڵاتی فەرز دەکات و هێزی سەربازی بەکار دەهێنێت بۆ پیادە کردنی جووت پێوەری (المعیار المزدوج).

یام خیوتۆنگ دەیەوێت جارێکی تر چین بگەڕێتەوە بۆ پیادە کردنی سیستەمی وانگ لە ئاسیا، بەڵام لەسەر بنەمای یەکسانی و سەروەری یاسا. بەڵام کێشەی چین لەوەدا خۆی بەدیدەکات کە ئەم کارە ئەنجامبدات بەبێ ئەوەی شەڕ و ئاژاوە نە لەگەڵ هندستان و نەلەگەڵ ژاپۆن بەرپا بکات. وەڵامی یان خیوتۆنگ دەچێتە ناو جەرگەی گرفتەکە. ئەو هۆکارەی کە وادەکات وڵاتانی تر ئەم کارە قەبووڵبکەن دەگەڕێتەوە بۆ

ئەوەی ئێمە یەکەم جار دەبێت ئەم سیستەمە لە سیاسەتی ناوخۆ پیادە بکەین تا ببین بە کۆمەڵگایەکی نموونەیی و خەڵك بیەوێت چاویان لێبکات و لاساییان بکەنەوە. بەڵام چاری ئەوەمان نییە. حاڵی حازر هەموو تەنها هێزی ئابووریمان بۆتە جێگای سەنجراکێشانی دنیا، بەڵام ئەمەیش بەردەوام نابێت. پەرستنی پارە بەس نییە وەك سەرنجراکێشان، بەڵکو پێویستمان بە هێزی ئەخلاقی هەیە (Moral Power). ئەوە فەرەزیەتی کە باس ناکرێت ئەوەیە چین پێویست بە گۆڕینی سیستەمی سیاسی هەیە تا بتوانێت ببێت بە هێزێکی فرە لایەن (Hyper-Power). یان خیوتزنگ ئەوەی قەبووڵە کە زۆر سەختە بۆ چین شەرعییەت لەسەر ئاستی جیهان وەدەستبهێنێت بەبێ ئازاد کردنی سیستەمی سیاسی لە چین. بەڵام بە دڵنیاییەوە ئەوسا ژاپۆن سیستەمی وانگ بە سەرکردایەتی چین قەبووڵ ناکات؟ یان خیوتزنگ پێیوایە کە میکانزمی ئەم هێزە رەها دەبێت (Absolute)، ژاپۆن پێشوازی لەم پەیوەندییە ناکات، بەڵام دوای بەسەر چوونی کات یانەی چینی هێندە بەهێز دەبێت کە ژاپۆن خۆی دەیەوێت ببێت بە ئەندام. ئەمەیش هەروەك UK و EU دەبێت: ئەندامێکی نابەدڵ، بە گوێرەی یان خیوتزنگ: چین دوو رێگای لە بەردەم دەبێت کاتێك وزر بەهێز دەبێت. رەنگە ببێت بە بەشێك لە سیستەمی "وانگ"ی رۆژئاوا، کە ئەمەیش مانای ئەوەیە سیستەمی سیاسی خۆی بگۆڕێت. رۆژئاوا پێی لەم رێگایە دەکەن بەڵام ئەم رێگایە زۆر زەحمەتە پیادە بکرێت و نەستەمە. رێگاکەی تریش ئەوەیە کە چین سیستەمی خۆی دروستبکات.

ئەو بار گرژییەی نێوان لیبراڵ ئەنتەرناسیۆنالیستەکان و کۆمونیستە تازەکان جۆرێکی ترە لە لەتبوونی سەردەمی بورژواو سیاسەتی شۆرشگێری دەرەکی. بۆ چەند ساڵێکی داهاتووش چین لە بڕیارەکانیدا بۆرژوازی دەبێت. دوو روو دەبێت، هەر بۆیەش تێکەڵ بە ئابووری جیهان و دەزگاکانی بووە

(Institutions). ئاماننجیش بەهێز کردنیانە بۆ ئەوەی ئەمریکا بەستێتەوە بە عەرز تا کەشو هەوایەکی ئارام بخولقێنێ. بۆ پێشکەوتنی چین. بەڵام لەمەودای دووردا

هەندێك چینی ئاواتەخوازن کە بتوانن سیستەمێکی جیهانی دامەزرێنن بە گوێرەی دید و بۆچوونی چین. بۆ ئەنجامدانی ئەم کارەیش بە لایانەوە گرنگە کە بەگژ هیچ لایەکدا نەچن و رووبەرووی هیچ لایەك نەبنەوە لەو کاتەی کە بە هێمنی فاکتەرەکان لەسەر ئەرزی واقیع دەگۆڕن. هەر بەهەمان شێوەی گۆڕینی سیاسەتی ناوخۆ کە ئێستا خەریکی گۆڕینن، ئاواتەخوازن کەلێرە و لەوێ ئەلتەرناتیڤ دروستبکەن بە گوێرەی پرەنسیپەکانی چین، نەك ئەوەی رۆژئاوا دەیانەوێت.بە گوێرەی ئەم بۆچوونە رێکخراوی هاریکاری شەنگەهای لە رۆژهەڵاتی ئاسیا بووە بە کۆمەڵگای زیڕا رەنگ کراوەکان بەڵام بە پێچەوانە. بە رووکەش لە نموونەی فرە دەوڵەتی یان فرە لایەنی تێکەڵبوونی رۆژئاوایی دەچێت. هەروەك یەکێتی ئەورووپا EU . بەڵام لە راستیدا وەك تۆزی یان ناوەرۆکی سیستەمی جیهانی چینن کە تیادا سەروەری دەوڵەت مانای هەیە و...

مافی وڵاتان بۆ جموجۆڵ پارێزراوە، بەمێ ئەوەی زۆرینایەکی دەرەکی هەبێت دەستێوەردان لە کاروباری وڵاتان بکات لە ژێر سایەی مافی مرۆڤ و هەر هۆکارێك سەبارەت بە مافی هاوڵاتیان.

## دەرئەنجام

### جیهانی دوای هەڵسانەوەی چین:

بـەم دوایـیـە گفتوگۆیـەکی زۆر کـراوە لەسـەر چـۆنیەتی مامەڵـە کـردن لەگـەڵ هەڵسانەوەی چین...

ئەمـەیش هەسـتی کـۆنترۆڵکردن و سەرسـوڕمان پێدەبەخـشێت، باڵادەسـتی باوکایەتیش. بە هێمنی و بەڕێوە بردنێکی ژیر و بـەردەوام لـە لایـەن ئێمـەوە، ئـەوا پاپۆرە زەبەلاحەکەی چین بە سەلامەتی و ئارامی لە کەنارێکی هێـمن رادەگیردرێـت، دەشبەسترێتەوە... بەڵام هەرگیز ناکرێت و ناتوانرێت، هـەروەها خـودی چـین خـۆی نایەوێت تێکەڵ بە سیستەمێکی سیاسی و ئاسایشی ببێت کە چـین رۆڵـی داڕێـژتن و دامەزراندنی نەبێت؟... چین وەك هەر هێزێکی هەڵساوەی تری رابردوو، بـە ویلایەتـە یەکگرتووەکانی ئەمریکاشەوە، دەیەوێت دووبـارە سیـستەمی جیهـانی جـارێکی تـر دابڕێژێتەوە بە جۆرێك کە گونجاو بێت لەگەڵ ئامانجەکان و هێزە تازەکەی.

رۆبەرت کاگەن واشنتۆن پۆست یەکشەمەی ١٥/٥/٢٠٠٥

Robert Kagan,Washington post,Sunday,15 May 2005.

جیهانی رۆژئاوا پڕە لە قسە و باس سەبارەت بە مامەڵە کردن لەگەڵ هەڵسانەوەی چین، چ گۆڕانێك بەسەر (چین)دا بێت بۆ ئەوەی زیاتر ماڵی بکرێن، یان چی بکەین تـا وەك ئێمەیان لێبێت. چۆن دەتوانن کارێك بکەن کە بە سەلامەتی دونیا بـەرەو هەمـە لایـەنی و بـە دەزگـا بـوون (Institutions)، دیموکراسـی و رۆڵ و سـەروەری یاسـا بکرێت؟ هەموو ئەو پرسیارانە کە دیپلۆماتکاران پیاوانی دەوڵـەت دەیـان خەنـە روو بوونەتـە بنـەمای بیروبـاوەڕو دڵنیـا بـوون و بـۆ ئـەوەی ئێمـە وا هەسـتبکەین کـە پێشکەوتنی چین و گەشەسەندنی بە دەست ئێمەیە بە چ ئاقارێکیدا ببەین. ئەم جـۆرە بیرکردنەوە و خستنە رووی کێشەکە بەم جۆرەی کە وەك ئەوەیە قـسە لەگـەڵ خۆمـان بکەین و پێمان وایە" چین"ی تازە بە گوێرەی دید و بۆچوونی ئێمە دروستبێت. بـەڵام

ژمارەیەکی کەم لە رۆژئاواییەکان دەزانن کە مەترسییەکانیان سەبارەت بە چین هەمان مەترسی لای چین دروستکردووە... دەقاودەق رەنگدانەوەی بەرامبەری هەیە لە بەیگین وەك ئاوێنە.

گفتوگۆیەکی پڕ حەماس لە نێوەندە ئەکادیمی و نێوان لێکۆڵەرەوەکان دەستپێکردووە، تەنانەت هەندێك بەرپرسیشی گرتۆتەوە کە چۆن خۆ ئامادە دەکەن و مامەڵە لەگەڵ ئاواز بوون، پووکانەوەی رۆژئاوا بکەن. ئەوان دەپرسن: چۆن دەتوانن هەڵسوکەوتی هێزی رۆژئاوا بە جۆرێك رێکبخەن کە گونجاو بێت لەگەڵ بەرژەوەندی و بەها چینییەکان.

ئەم گفتوگۆیە پڕ جەمسەرو پڕ کێشەیە کە چەندین رای جیاجیا قەبووڵدەکات بە ئاشکرا لە ساڵی ٢٠٠٦ دەستپێکرد بەسەر وتارێکی پڕ کێشەی وانگ یوی"Wang Yiwei" کە لێکۆڵەرەوەیەکی گەنجی زانکۆی" فوودان"دە"Fudan" کە دەپرسێت: چۆن دەتوانین رێگە بگرین لە داڕمان و رووخانی خێرای USA ؟ ئەو پرسیارەی وانگ یوی Wang Yiwe کاردانەوەیەکی زۆر گەرمی دروستکرد هەرلە لای کۆمۆنیستە تازەکانەوە تا لیبراڵ ئەنتەرناسیۆنالیستەکان. یەکێك لە هاوڕێکانی وانگ یوی لە زانکۆی فودان بە ناوی شین دنگلی، ئەم رووبەڕوو بوونەوەیەی (تحدی) یە یەی زۆر بە وردتر وەسفکرد: ئایا خەڵك ئەو پرسیارە لە خۆیان کردووە داخوا ئەگەر ئەمریکا هەرەسی هێنا چی روو دەدات؟ هەروەها دەپرسێت ئایا چین، رووسیا، یەکێتی ئەوروپا، ئەڵمانیا یان ژاپۆن دەتوانن ئەو کەلوپەلە گشتییانە دابینبکەن کە ئەمریکا دابینیدەکرد؟ یانیش رێکخراوی نێودەوڵەتی و دەزگای ئابووری دابمەزرێنن؟ شین دینگلی پێیوایە بەیگین ئێستا ئامادە نییە بۆ رۆڵێکی وا گرنگ، بەڵام ئامانجی سەرەکی ئەمڕۆ دەبێت ئەوە بێت کە بتوانێت ئەمریکا بە جۆرێك رێکبخات کە ناچار بێت بۆ هاریکاری کردن لەگەڵ جیهان، بۆیە چین پێویستە رێگایەکی تێکەڵ بگرێتەبەر لە مامەڵە کردن و چوار دەوردانی ئەمریکا (Containment) بۆ رێکخستنەوەی ئەمریکا تا ببێت بەهێزێکی بەرپرسیار: ئەم بۆچوونەیش دەقاودەق هەمان بۆچوونی

ئەمریکایە بۆ چین. ئەم گفتوگۆیانە ئەوە نیشاندەدەن کە بووژانەوە و هەڵسانەوەی چین پرۆسەیەکی میکانیکی ئاسان نییە لە ژێر کۆنترۆڵی سیاسەت دارێژەرانی رۆژئاوا نییە. بەڵکو چین لە هەلی ئەوە دایە کە خۆیان لە حاڵەتی کۆنترۆڵدا بن لە کاتی پرۆسەی گۆڕان. لەوەش زیاتر ئەو گەشەسەندنە گەورەیەی کە چین لە بواری ئابووری بە خۆوە دەبینێت وەك شەپۆلێکی زەبەلاحی سووناسی وایە کە گەورەترین (تحدی) بە رووبەرووی جیهان بۆتەوە و دەرئەنجامەکانیش دیار نییە. لە ساڵی ٢٠٠٥ برادەرەکانم لە بەیگین تووشی حەپەسان هاتن بە بینینی بابەتێکی بەرگی (The Economist) لە ژێر ناونیشانی "چۆن چین ئابووری جیهان بەڕێوە دەبات". لەم بابەتەدا هاتووە کە لە چەند ساڵی داهاتوودا لە وڵاتە گەشەسەندووەکاندا.

رێژەی ئاوسان (تضخم- Inflation) و نرخی قازانج (Interest rates) لە قازانج بەرزتر دەبێت، نرخی ئەوت تەنانەت خانووبەرەیش رەنگە لە چین دیاریبکرێن. بەڵام تەنها دوای دووساڵ، کاریگەری ئابووری چین بووە بە هەواڵێکی کۆن.بەم زووانە لە بەرگی گۆڤارە رۆژئاواییەکاندا ئەوە رادەگەیەنن کە" چین سیستەمی سیاسی جیهانی بەڕێوە دەبات. من دەتوانم پێشبینی ئەوە بکەم کە سەر وتار بیبینم کە گفتوگۆ لەسەر ئەوە بکەن کە گۆڕانی کەش و هەواو ژینگە، پاکتاو کردنی ئەتۆمی تا مافی مرۆڤ و هەژاری لە سەرتاسەری جیهان و سیاسەتی جیهانی لە بەیگینەوە دادەڕێژرێت و بەڕێوەدەبرێت. بیروباوەڕی چین بۆ جیهان سیستەمی، جیهانی تازە کاریگەری یەکجار زۆریان دەبێت لەسەر سیاسەتی دەرەکیمان، هەروەك کاریگەری کەل وپەل و کاڵا هەرزانە چینییەکان بەسەر ئابووریمان.

## جیهانی بە گشتگیری چین:

هەنووکەیی ترین دەرئەنجامەکانی هەڵسانەوەی چین کە چاوەڕوان کرابوو"بە جیهانی کردنی سیستەمی رۆژئاوایی گەیشتە باری مەنتق. دەوڵەتی چینی، کە پێنجیەکی دانیشتوانی دنیا پێکدەهێنن، لەو رێگایە لایدا کە وا چاوەڕوان دەکرا

پێیدا بڕوات، بەرەو سیستەمی سیاسی و ئـابووری ڕۆژئاوایـە. هـەر چـەندەی ئەگـەر وڵاتانی تری جیهان بەردەوام بن لە گەشەسەندن، بەڵام ئەمە بەبێ هیچ گومانێك پێش بینی فرانسیس فۆکۆ یامای سەبارەت بە کۆتایی مێژوو سەراو ژێر کردەوە.

قۆناخی داهاتووی گەشەسەندن و پێشکەوتنی چین ڕەنگـە زۆر زیـاتر درامـاتیکی بێت. یەکەمین سی سـاڵی پرۆگرامی چاکـسازی کۆماری میللی بە شێوەیەکی بنـەڕەتی بریتی بوو لە تێکەڵ کردنەوەی چین بـە جیهـان، تێگەیـشتن و فێـر بـوونی کـە چـۆن ئابووری ڕۆژئاوا و سیـستەمی سیاسی و سیاسەتی دەرەکیان بەڕێوەدەچن. چیرۆکی سی ساڵی داهاتوو بریتی دەبێت لە متمانە هێنانی چین بۆ خۆی و تا چ ڕادەیەك جیهان بە گوێرەی ئارەزوو و بەرژەوەندییەکانی خۆی جیهان ڕێکدەخاتـەوە. بـۆ حکومەتـەکانی ئەفریقیا، ئاسـیای ناوەڕاسـت، ئـەمریکای لاتـین و تەنانـەت ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـت هەڵسانەوەی چین مانای ئەوەیە کە چیتر تەنها دوو ڕێگایان لە بـەردەم نییـە، ڕێگـای تێگەیشتن و فێر بوون لـە ڕۆژئـاوا (Assimilation) و گۆشـەگیری. چین پێناسـەی سیستەمی تازە ناکات بە گـوێرەی دیـدی خـۆی، بـەڵام سـەنتوقێکی تـری دەنگـدان دابیندەکات لەگەڵ فەلـسەفەیەکی تـازە کـە ڕێگـا و جێگـای خۆیـان دەکەنـەوە لـە تەكUSA لە هەوڵێکدا بۆ دروستکردنی هاو هێزییـەك یان پارسەنگێکی تازەی هێـز لە قازانجی دیموکراسی، ئەوروپییەکانیش زۆر پەرۆشی هەمەلایەنن، ئیـسلامییەکانیش بە هیوای دامەزراندنی حکومەتێکی ئایینین (Theocratic).

ئەو پەتە زێڕینەی کە چینی بەستۆتەوە بـە بیروبـاوەڕی جیهـانگیری بریتییـە لـە ئـارەزووی وەدەسـتهێنانی دەسـەڵات و کـۆنترۆل. بیرمەنـدە چـینییەکان دەیانـەوێت جیهانێك دروستبکەن کە تیایدا حکومەتـە نیـشتمانییەکان بـاڵا دەسـت بـن بەسـەر مەسەلە ناوخۆییەکان، نەك بکەونە ژێر فشاری ئارەزوو و حەزی سەرمایەی جیهانی و سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکی. چین سەرمایە و وەبەرهێنان، تەکنەلۆژیا و بـازاڕی لـە هەموو جیهان دەوێت، بەڵام نایانـەوێت بـەها ڕۆژئاواییـەکان کاریـان تێبکـات، بـە واتایەکی تر بەها ڕۆژئاواییـەکانیان گەرەك نییـە. ئامانجیان نییـە چـین دابـبڕن بـەڵکو

دەیانەویت چین بە تەواوەتی تێکەڵ بە جیهان بێت، بەڵام بەمەرجی چینی. بە کورتی نایانەویت چین لە ژێر جیهانگیریدا پان بێتەوە. کاپیتالزمی رووباری زەرد، دیکتاتۆریەتی راوێژکاری و بەسەرتاسەری کردنی هێزی نیشتمانی، ئەمانە بناخەی دروستکردنی فەلسەفەی چینی تازەن بۆ جیهانگیری کە جێگاو رێگا خۆشدەکەن بۆ وڵاتە نەتەوەییەکان (Nation States) بۆ کۆنترۆڵکردنی ئابووری و بەڕێوە بردنی سیاسی و رێکخستنەوەی ئەجندای سیاسەتی دەرەکی. سەرکردە چینییەکان دەستیان کردووە بە بەکار هێنانی ئەم بیروباوەڕە خشت لەسەر خشت، بۆ دروستکردنی سیستەمێکی ئەلتەرناتیڤی جیهانی، جیهانی دیواردراوی چین.

**(Tributaries- رووبارەکانی ڕووباری زەرد)**

لە بەهاری ۲۰۰۷ هیوجینتاوۆ زۆر بە شانازییەوە دروستبوونی "ناوچەی ئابووری تایبەتی" راگەیاند. لە پرێس کۆنفرانسێکی زۆر قەلەبالغ کە پڕ بوو لە رۆژنامەنووسی بزنس وسەرۆکی کۆمپانیا گەورەکان و بە زەردە خەنەیەکەوە شاوی ئەو لایەن و وڵاتانەی راگەیاند کە یارمەتی پارەو ئابووریان بۆ دەرچووە جگە لە بەخشینی بەشێك یان تەواوی باج و وەبەرهێنان لە بواری رێگاوبان وسکەی قیتار و ناردنی کەل و پەل لەسەر ئاستی پیشەسازی بۆ ناوچە تازەکان. بەڵام سەرەڕای ئەمەش ئەم ناوچە ئابوورییە تایبەتە جیاوازە. نە لەسەر کەناری رۆژهەڵاتی چین و نە لە رۆژئاوایدا بوو. ئەم خێوەتگە سەرمایەداری چین لە ناو جەرگەی ئەفریقیا دەبێت. لە پشتێنی مایەکانی (فهم) مس ی زامبیا (Zambia). سەرۆکی زامبی لیڤی موانە واسە (Levy Mwanawasa) لە تەك سەرۆکی چین هوجینتاوۆ وەستا بوو کە رایگەیاند بە دامەزراندنی" ناوچەی ئابووری تایبەت" لە چامبیش (Chambishi) چین ۸۰۰$ ملیۆن دۆلار وەبەر دەهێنێت و ئابووری ئەم وڵاتە بەهێز دەکات و دەبێتە هۆی پێشکەوتنی وڵاتەکەمان. ناوچەی ئابووری تایبەت لە زامبیا تەنها یەکێکە لەو پێنج ناوچە کە بەیگین بەڵێنی دامەزراندنیانی داوە لە ئەفریقیا، کە ئەمەیشی ناردنە

دەرەوەی نهێنییەکانی کاپیتالزمی رووباری زەرد لە دەرەوەی سنووری چین. چین وا خەریکی چاندن و گواستنەوەی سەرکەوتنە ئابوورییەکەیەتی بۆ کیشوەری ئەفریقیا لە رێگەی دروستکردنی کۆمەڵێك سەنتەر و بنکەی پیشەسازی ئازاد لە باج، ئەمانەمش لە رێگەی هێڵی شەمەندەفەر و جادە و رێگای ئاسایی دەریاییەوە بە جیهان دەبەسترێتەوە. زامبیا دەبێتە سەنتەری ئاسن و سەرچاوەی ئاسن، مس، کۆبالت (Cobalt)، ئەلماس، تەنەکە و یۆرانیۆم بۆ چین. ناوچەی دووەمیشی دەکەوێتە مۆریشیۆس (Mauritius) کە دەبێتە سەنتەری بازرگانی بۆ چین کە رێگە بۆ چل (٤٠) بزنسی چینی خۆشدەکات مامەڵە لەگەڵ بیست دەوڵەتی ئەندامی بازاڕی هاوبەشی رۆژهەلات و باشووری ئەفریقیادا بکەن، هەر لە لیبیا تا زیمبابۆی، جگە لە رێگای ئاسان بۆ ئۆقیانوسی هیندی و بازاڕی باشووری ئاسیا. سێیەم ناوچەش (ناوچەی شەحن کردن-Shipping hub)، کە رەنگە بکەوێتە پایتەختی تەنزانیا، (دار و سەلام). نایجیریا و لایبیریا و دورگەکانی کەیپ ڤێردی- (Cape Verde) زۆر بەگەرمی خەریکی پێشبڕکێن بۆ وەدەستهێنانی دوو ناوچەکەی تر.

لەو کاتەی بەیگین ئەم ناوچانە دروستدەکات، دەبێتە هۆی بەیەکەوە بەستانەوە و گرێدانی سەراپای کیشوەرەکە لە رێگەی شەقام و هێڵی شەمەندەفەر.چین وا خەریکی هێڵی شەمەندەفەری تانزامTanzam نۆژەن دەکاتەوە چین لە سالانی ١٩٧٠ دروستیکردبوو بۆ بەستنەوەی زامبیا بە تەنزانیا. هەر لە هەمان کاتیشدا هێڵی شەمەندەفەری بینگۆلیا نۆژەن دەکەنەوە کە زامبیا بە ئەنگۆلای دەوڵەمەند بە نەوت دەبەستێتەوە. هەروەك یەکێك لە باشووری ئەفریقیا دەڵێت: ئەنانەت ئەو وڵاتانەی کاتی خۆی ئەفریقیایان داگیر کردبوو نەیانتوانی خۆیان گرێدراوی هیچ وەعدێك بکەن بۆ وەبەرهێنان بەم ئەندازە گەورەیە بۆ دروستکردنی ژێرخانی ئابووری، رەنگە هەر نەشیان توانیبوایە کاری بەم جۆرە ئەنجامبدەن. زۆر لە داگیرگەرە کۆنەکانی ئەفریقیا تووشی سەرسوورمان هاتوون لە رێژەی بەرزی بەرژەوەندی چین لەم کیشوەرەدا. لە نۆڤێمبەری (مانگی١١) ٢٠٠٦ سەرکردەی چل و هەشت وڵاتی ئەفریقیایی ئامادە

بوون لە بەیگیێ بۆ بەشداری کردن لە کۆبوونـەوەی لوتکـە کـە لەلایـەن هیوجینتـاوز داوەت کرابوون، لەم کۆبوونەوەیەدا سەرۆکی چین زۆر بە هۆشیارییەوە هەوڵیدا مزلیدە لەسەر رۆژئاوا بکات کاتێك رایگەیانـد یارمەتییـەکانی چـین بـۆ ئـەفریقیا دووقـات دەکرێت لە ساڵی ۲۰۰۹ دا (ساڵێ زووتر لەو ماوەیەی کە بۆب گیلدۆف-گۆرانی بێژ- گروپی بۆنۆ-Bono دا وایان لە حکومەتە رۆژئاواییەکان کرد لە کاتی کۆبوونەوەکانی G8 ): ئەمەیش پێنج ملیار دۆلار یارمەتی بـۆ ئـەفریقیا داینـدەکات، جگـە لـە٥ ملیاری تر لە شێوەی زەوی بە شێوەی ئیمتیاز وەبەرهێنان، دانانی پارە لـە حیـساب، لابردن و سڕینەوەی قەرز بۆ ۳۲ وڵات و هەزاران زەماڵەی خوێندن جگە لـە پـلان بـۆ دروستکردنی قوتابخانە و نەخۆشخانە لەسەرتاسەری کیشوەرەکە.

ئەوەی جێگای سەرنج و سەرسامی دڵ و مێـشکی ئەفریقیاییەکانـە ئـەو ئامـادە بوونە بەهێزەی چـینە کـە بۆتـە هـۆی گـۆڕینی بنـەماکانی پێشکەوتنی ئـابووری. سەرکردەکە هەڵبژێردراوەکانی و حکومەتەکانی جیهان مەترسییەکی یـەکجار زۆریـان هەبوو لە سندووقی دراوی نێودەوڵەتی (IMF) و بانکی جیهانی. (جێفـری سـاش)ی (Jeffrey Sachs)ی شارەزا و پسپۆری بواری گەشەسەندن و پێشکەوتن بەراوردێکی زۆر بە ناو بانگی هەیە بۆ (IMF) و دەڵێت زۆر لە حکومەتی بەدیل دەچێت: بۆ ۷۵ وڵاتی تازە پێگەیشتوو، کە هیچ کارێك ئەنجام نادەن بەبێ راوێـژکاری کردنیـان. ئـەو کاتـەی کـە داوای راوێـژیش دەکـەن ئـەوا ژیانیـان دەکەوێتـە دەسـت بازاڕەکـانی سەرمایەداری و یارمەتی بیانی و رێز و پلەیەمان دەخەنە ژێـر پرسـیار. بـەڵام ئـەمڕۆ بەرپرسەکانی (IMF) لە گرفتدان ناتوانن واله هەژارترین وڵاتانی ئەفریقیا بکـەن تـا گوێیان لێبگرن. (IMF) چەندین ساڵ خەریکی دانووستان بـوون لەگـەڵ ئـەنگۆلا بـۆ ئەوەی حکومەتی ئەم وڵاتە پیادەی پرەنسیپی شەفافیەت بکات بەرامبەر یارمـەتی و قەرز، بەڵام تەنها چەند سەعاتێك بەر لـە ئیمـزا کردنی رێکەوتننامەکە بەرپرسانی لوانڈا رایانگەیاند چیتر پێویستیان بەم قەرزە نییـە و رێکـەوتن ئیمـزا ناکـەن. هـۆی ئەومیش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەنگۆلا توانی دوو ملیار دۆلار قەرزی بـێ قـازانج

دابینبکات لە چین. ئەم چیرۆکە چەندین جار لەم کیشوەرە دووبارە بۆوە هەر لە جەزائیر بۆتشاد، ئەسیوبیا، نایجیریا، سودان، یۆگەندا، زامبیا و زیمبابوی.

لەو کاتەی بالانسی ئابووری لە جیهاندا لە قازانجی (چین)دا دەشکێتەوە کە سەرمایەکەیان ١٣٠٠ ملیار دۆلارە، ئەوا IMF لە بچووك بوونەوەی بەردەوام دایە و دەچێتە ناو تەنها ٣٥ ملیار دۆلاریان هەیە. بەهێزترین رێکخراوی گەشەسەندن و پێشکەوتن لە دونیادا تووشی گیروگرفتی زۆر هاتوون لەبەر پێشبڕکێ لەگەڵ چین. لە جێگای مەرجە سەختەکانی ئەوەی پێیدەگوترێت یەکدەنگی واشنتۆن Washington Consensus)، زۆر لە وڵاتانی ئەفریقیایی دەرس و پەندەکانی سەرمایەداری، رووباری زەرد لە ئامێز دەگرن و لاسایی دەکەنەوە. لەو کاتەی یەکدەنگی واشنتۆن دژ بە دەستێوەردانی دەوڵەتە، لە ئابووری و لە قازانجی بە تایبەتی بوون (Privatizqtion) و بە توندی لەگەڵ مافی مولکایەتی تایبەتن و پاڵپشتی پرەنسیپی چارەسەری ئابووری کت و پڕن

(Shock Thereapy)، ئەوا سەرمایەداری رووباری زەرد هاندانی بەکار هێنانی پارەی گشتی دەکات بۆ داهێنان، پاراستنی مولکی گشتی و پێشکەوتنی قۆناخ بە قۆناخی ناوچەی ئابووری تایبەت.

باق و بریقی سەدای سەرکەوتنی نمونەی چین زۆر زیاتر رۆیشتووە لە سنووری کیشوەری ئەفریقیا. لە گەڕاندا بەدوای لاسایی کردنەوەی سەرکەوتنەکانی چین، وڵاتانی جیاواز وەك بەرازیل، روسیا و ڤیتنام کۆیی سیاسەتی جموجۆڵە پیشەسازییەکانی بەیگین دەکەن لە بەکار هێنانی پارەی گشتی و وەبەر هێنانی دەرەکی بۆ دروستکردنی و دانانی بەردی بناغەی پیشەسازییەکەی چری سەرمایە. ئەم وڵاتانە بەخۆدا چوونەوە و رێزبەندیان کرد دژ بە پرەنسیپی یەکدەنگی واشنتۆن، خاو کردنەوە، بگرە بەڵکو هەڵگەڕانەوە لە پرۆسەی بە تایبەتی کردن (Privatizqtion) کە لە ساڵانی ١٩٩٦ دا دەستیان پێکرد بوو. هەروەك چین هەتا ئەمڕۆش ئەم وڵاتانە کۆنترۆلی کەرتی گشتی دەکەن لە ئابووری وڵات چونکە بە

یەکجار گرنگی لە قەڵەم دەدەن بۆ بەرژەوەندی نیشتمانی (پێناسە یان بۆ بەرژەوەندی نیشتمانی لە فراوان بوون دایە کە خزمەتگوزاری گشتی، وزە، و تەنانەت بەروبوومی کشتوکاڵیش دەگرێتە خۆ). هەروەك چین پێیان وایە ئەگەر دەزگاکان و کۆمپانیاکانی کە حکومەت بەڕێوەیان دەبات بە عاقڵانە و پلان بەڕێوە ببردرێن دەبن بە سەرچاوەی زۆر باش بۆ قازانج بۆ حکومەت، کە دەکرێت دووبارە وەبەر بهێنرێت بۆ وەدەستهێنانی ئامانجی سیاسی و کۆمەڵایەتی (لە ڕێگەی ئەم کارەشی حکومەت دەتوانێت سەروەری خۆی بپارێزێت لە دەستێوەردانی کۆمپانیا زەبەلاحەکانی کەرتی تایبەت کە گەورەترین (تحدی) بن بۆ دەسەڵاتی دەوڵەت). هۆکاری جۆراوجۆر هەنە لە هەڵگەڕانەوە لە یەکدەنگی واشنتۆن، کێشەی ناسەقامگیری بانکی و دراوی لە روسیا، ئەمریکای لاتین و ئاسیا، ئازادی ئابووری نەتەوایەتی سەروەت وسامانی سروشتیان هەیە و دەوڵەمەند بوونیان و هەڵسانەوە و بووژانەوەیان لە هەموو بەشەکانی جیهان- بەڵام لەهەر هەموویان گرنگتر ئەوەیە گەشەسەندن و بووژانەوە و هەڵسانەوەی هێزی ئابووری چین بەشێکی دانەبڕاوە لە ڕێنە و ڕووداوە گشتییەکە. ئەوەی جێگای سەرسوڕمانە جۆری بڵاو بوونەوەی سەرمایەداری رووباری زەرد زۆر لەوە زیاتر و دوورترە کە وەبەرهێنە چینییەکان چاوەڕوانیان دەکرد. سەرکەوتنی نموونەی چینی لە پێشکەوتن و گەشەسەندنی قۆناخ بە قۆناخ بوو بەهۆی بڵاو بوونەوەی بە پەلەی ناوچەی ئابووری تایبەت لە هەموو جیهان. بە گوێرەی مەزەندە کردنی بانکی جیهانی، لە ساڵی ۲۰۰۷ دا پتر لە ۳۰۰۰ پرۆژە لە قۆناخی ئەنجامدان بووە لە ۱۲۰ وڵاتی جیهاندا. زۆربەی ئەم پرۆژانەش بە شێوەیەکی زەق دووبارە کردنەوەی نموونەی (چینی)ین. نموونەی چینی سەرنجی زۆربەی وڵاتانی گەشەسەندوویان ڕاکێشاوە. لێکۆڵەرەوەکانی حکومی هەر لە ئێران، میسر، ئەنگۆلا، زیمبابۆی، کازاخستان، روسیا، هندستان، ڤیێتنام، بەرازیل تا فەنزەوێلا لە شارو گوندەکانی چین دەسووڕێنەوە لە گەڕاندان بە دوای پەند و وانە تا لە تاقیکردنەوەی بەیگین فێربن.

چین تەنها لە مەیدانی گەشەسەندنی ئابووری سەرکەوتنی وەدەست نەهێناوە، بەڵکو ئەم سەرکەوتنەی بۆتە هۆی کۆنترۆلکردنی سیاسەتی ئابووری وڵات. بە پێچەوانەی پڵنگەکانی ئاسیا لە ساڵانی ۱۹۸۰ دا، کە بە تەواوەتی پشتیان بەستبوو بە یارمەتی رۆژئاوا، چین بە تەواوەتی خۆی ئازاد کرد لە دەستێوەردانی دەزگاکانی پارە و پوولی رۆژئاوایی، هەروەها توانیان دان بە خۆدابگرن لە بەردەم هەموو ئەو قەرزە مەرجدارانە و فشارەکانی ئەمریکا بۆ دووبارە دەستنیشانکردنی نرخی گونجاو بۆ پارەی چینی. لەبری ئەوەیش چین بە ئاشکرا رایگەیاند کە ئەگەر کارێکی لەم بابەتە بکەن ئەوا تەنها بە مەرجی خۆیان بە ئەنجامی دەگەیەنن. بۆ وڵاتانی تری دنیاش ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە دەتوانن مەرجە قورسەکانی بانکی جیهانی قەبوول نەکەن و رەتیبکەنەوە، بۆنموەی کاری لەم بابەتە تەنها لە بەرژەوەندی نیشتمانی ئەنجامبدەن. ئەمەش مانای ئازادییە. یەکێك لە رۆژنامەنووسە ئایبیرییەکان دەنووسێت و دەڵێت:

حکومەتی چینی دەزانێت چ بۆ هاوڵاتیانی باشە، هەر بۆیەش ستراتیژیەتی ئابووری لەسەر ئەم بنەمایە دادەڕێژێت. ستراتیژیەکەیشی بە گوێرەی یەکدەنگی واشنتۆن نییە(Washington Consensus). چین رێگای ئەدا بە (IMF) و بانکی جیهانی تا مەرجەکانی خۆیان و لیبراڵی تازەیان (Neo- Libral)بە سەردا بسەپێنێن...

چونکە ستراتیژیەتی چین پێك نەهاتووە لە زێدەڕۆیی لە لیبرالیزمی تازە و هەڵوەشانەوەی یاساکان و کەمکردنەوە یانیش بڕینی خەرجییە کۆمەڵایەتییەکان، بە تایبەتی کردنی (Privatization) هەموو شتێك لە ژێر تیشکی خۆر و قەدەغە کردنی هەموو جۆرە پالپشتی و یارمەتییەك بۆ کاڵا کشتییەکان. چونکە کاڵا وشەیەك نییە ئامانج تیادا تەنها و تەنها قازانج بێت، بەڵکو بۆ خزمەتی خەڵکە.

بۆ چەندین ساڵ وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان زۆر ناڕەحەت بوون بە فەلسەفەی جیهانی یانی یەکدەنگی واشنتۆن. بەڵام تەنها بەم دواییە بۆیان دەرکەوت کە

ڕێگایەکی تر هەیە لە تێکەڵکردنی چاکسازی ئابووری قۆناخ بە قۆناخ کە لە ژێر دەسەڵات و کۆنترۆڵی دەوڵەتدا بێت لە بەرژەوەندی خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتییەکاندا و لە سایەی سەرمایەداری ڕووبـاری زەرد دا. جیهـانگیری دەیوایـە ببێتـە هـۆی سەرکەوتن و خۆشـی لـە بەرژەوەنـدی بـازاڕی ئابوورییـدا، بـەڵام چـین سـەلماندی کـە سەرمایەداری دەوڵەت سوودمەندترین لایەنە لەم قۆناخەدا.

### دیکتاتۆرییەتی ڕاوێژکاری:

لەو کاتەی بیروباوەڕی بازاڕی ئازاد بڵاو بۆوە لەسەر تاپای جیهان، لەگـەڵ خۆیـدا بیروباوەڕی دیموکراسی لیبراڵیشی بڵاو کردەوە. تەنها لە سی ساڵی ڕابـردوودا شەسـت وڵات بەرەو دیموکراسی چوون و باوەشـیان بـۆ بیروبـاوەڕی لیـبراڵ کـردەوە.لێکۆڵـەری ئەمەریکی سـامۆیل هـانتنگتۆن (Samuel Huntington) ئەمـە بـە قۆنـاخی یـان شەپۆلی سێهەمی دیموکراسـیەت بـوون وەسـفدەکات (شـەپۆلی یەکـەم لـە سـەرەتای ساڵانی ۱۸۰۰ بوو هی دووەمیشی ڕاستەوخۆ دوابەدوای شەڕی جیهانی دووەم بـوو). تەنانەت لە سی سـاڵی ڕابردووشدا خۆپیشاندانی بە ناوبانگمان بەچاوی خۆمـان بینـی کـە داوای دیموکراسـی دەکـەن لـە شـەقامەکانی جۆرجیـا، ئۆکرانیـا، لوبنـان و قەرغیزستان، کە بە شۆڕشی ڕەنگاوڕەنگ ناونرابوون.

بـەڵام بەرپرسـە حکومییـەکانی بـەیکین زۆر دڵـڕەق و بـێ بـەزەیین بەرامبـەر گەشەسەندنی لیبراڵ دیموکراسی. من کاتێ شۆڕشی پرتەقاڵی ئۆکرانیا و شۆڕشی گـوڵ (Tuilp)ی قەرغیزستان لە چین بووم. بەرپرسـە چینی و برادەرەکـانی مـن لـە چـین تووشی سەرسوڕمان هاتبوون و بڕوایان نەدەکرد کە چۆن مۆسکۆ شکسـتی هێنـا لـە داکۆکی کردن لە کاندیدەکانی خۆی و بەردەم مانگرتوان و خۆپیشاندەران چۆکی دادا. بۆ ئەوەی تووشی هەمان هەڵەی ڕوسیا نـەبن بەرپرسـە چینییەکان یەکیـەتییـەکیان (Unit) پێکهێنا بۆ چاوخشاندنەوە بەکاری ڕێکخراوە ناحکومییە بیانییـەکان بکـەن (NGO) لە چین، لە هەمان کاتیشدا یەکێك لە گرنگترین دەزگای بیرمەندانی چینی

سەر بە حکومەت چەندین لێکۆڵەری نارد بۆ ئۆزبەکستان، قەرغیزستان، ئۆکرانیا، جۆرجیا، بەر لە رووسیا بۆ هەڵسەنگاندنی رۆڵی رێکخراوە ناحکومییەکانی هاندەر بۆ دیوکراسیەت بزانن و کاریگەریان چی بووە لە بەرپا بوونی ئەم جۆرە شۆڕشانە، ئەمەیش بۆ رێگە گرتن لە هەر کارێکی وا لەداهاتووی چین، حکومەتی چین بریاری دا کە ئەوان بە هیچ شێوەیەك نایانەوێت ببینن شۆڕشی رەنگاورەنگ لە بەرچاوی وان رووبدات، هەربۆیەش دەستیان کرد بە فشار خستنە سەرو قەدەغە کردنی رێکخراوە بیانییە ناحکومییەکان (NGO)، لە هەمان کاتیشدا تیمیان رەوانە کرد بۆ مەشق پێکردنی حکومەتەکانی ئاسیای ناوەڕاست بۆ بەرەنگار بوونەوەی قەڵەبالغی و پەرتکردنی خۆپیشاندان.

ئەمرۆ لە نێوەندە دیوکراتخوازەکانی رۆژئاوادا زۆر بەگەرمی باس لە هەڵگەڕانەوە لە دیوکراسیەت و بلاوکردنەوەی دەکرێت. رێکخراوی ماڵی ئازادی ( Freedow House) لە رێکخراوێکی ناحکومییە دەڵێت:" ئازادی لە قۆناخی مت بووندایە" چونکە ژمارەی ئەو وڵاتانەی ئامێز بۆ دیوکراسیەت دەکەنەوە زیاد نەبوونە. بنکەی یارمەتیدانی نیشتمانی بۆ وتووێژی دیۆکراسی دەڵێت: گروپە دیوکراتخوازەکان لە ژێر هەڕەشەدان و زۆر بە زەحمەت دەتوانن یارمەتی دەرەکی وەرگرن بۆ درێژەدان بە خەباتیان و ئەگەر توانای داراییشیان هەبێت ئەوا ناتوانن بە ئازادی سوودی لێوەرگرن. نووسەری بە ناوبانگی دیوکراسی تۆم کارۆسەرس (Tom Carothers) وەسفی ئەم حاڵەتە دەکات و دەڵێت: هەڵگەڕانەوە لە دیوکراسی دەگەڕێتەوە بۆ هێرشی دەسەڵاتە ناوەندییە سەرکوتکەرەکان دژ بە میدیای ئازاد و کۆمەڵگای مەدەنی و گروپەکانی داکۆکی کردن لە مافی مرۆڤ.

لە راستیشدا خەتاکە تەنها هی چین نییە، بەڵکو بەرنامە و ئەجیندای حکومەتی جۆرج بۆش بۆ ئازادی کە لە ژێر دروشمی دیوکراسی رژێمی عێراقی گۆڕی بوو بە هۆکارێکی زۆر گەورە بۆ لەدەستدانی شەرعییەت و مین چاندن لە رێگای بلاوکردنەوەی دیوکراسی هەلێکی چاکی دا بە حکومەتەکان بۆ لەناو بردن و سڕکردنی

ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤ و دیموکراسی. سەرۆکی رووسیا فلادیمیرپۆتین دەستیکرد بە لەناوبردنی میدیای ئازاد و ئازادی سیاسی لە ولآتەکەی، لە هەمان کاتیشدا پالپشتی لە رژێمەکانی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو کرد بۆ ئەنجامدانی هەمان تاکتیك. ئەمانە و جگە لە زۆر لە هەڵگەڕانەوەکانی دیموکراسی وەك کودەتای سەربازی لە تایلند و کۆنگۆ برازەڤیل (Cong- Beazzavi;:e) چ پەیوەندییەکیان بە چین نەبوو. بەڵام سەرەڕای ئەمەش چین کەم یان زۆر کاریگەری بەسەر ئەم ڕووداوانەش هەیە.

ئەگەر چین لە رووی عەمەلی هیچ کردارێکیش ئەنجام نەدات لە جیهان، بەڵام هێزی چین وەك نموونە بۆتە هاندەرێك بۆ رووبەڕووبوونەوە و بەرەنگار بوونەوەی بانگەشەی دیموکراسی. جیاوازی نێوان گەشەسەندن و پێشکەوتنی هەمە لایەنەی چین بە بەراورد لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت متمانە و بڕوایەکی بڵاو کردەوە کە چین چاکسازی ئابووری دەخاتە پێش چاکسازی سیاسی.

ئەمە بۆتە بەربەستێکی مەزن لەبەردەم بانگەواز خوازان و بلاوکەرەوەکانی دیوکراسیەت، فشاریان لەسەر زۆر لە ولآتان لابرد بۆوە بۆ ئازاد کردنی سیستەمی سیاسییان. ئەوەی زیاتریش نیگەرانی کردوون ئەو پێشکەوتنە ئابوورییەی چینە کە هاوکێشەی نێوان دیموکراسی و گەشەسەندنی سەراوژێر کردووە. تەنانەت ڕێکخراوەکانی پارمەتی بەخشینیش لە ولآتە دیموکراتییەکان وەك دەزگای (DID) بەریتانی (Department for International Developmet) بە ئاشکرا رایدەگەیەنن کە هیچ بەڵگەیەك نییە بیسەلمێنێ کە دیموکراسیەت بەشدارە لە گەشەسەندنی ئابووری. ئەگەر بێت و ئاشکردنەوەی دیکتاتۆریەتی راوێژکاری و راپرسی گشتی لە چین سەریان گرت ئەوا بەبێگومان دیکتاتۆرەکانی جیهان زۆر بە چاکی ئەم ئەزموونە دەقۆزنەوە، ئەمەش مانای ئەوەیە دەوڵەتی تاکە حیزبی دەتوانێت بەردەوام بێت لە سەردەمی جیهانگیری و میدیا راگەیاندندا ( Mass Comwunication). زۆر کەس گفتوگۆ لەسەر ئەوە دەکەن ئایا چین بانگەشە و پڕوپاگەندە بۆ سیستەمی ناوەندی سەرکوتکار دەکات (Autocracy)، یانیش تەنها

له هەوڵی پاراستنی بەرژەوەندی ئیشتمانی چینی دان. وەڵامەکە هەر کامێکیان بێت ئەوا ئەمرۆ چین لە رێگای پەیوەندییە ئابووری و سیاسییەکانیەوە لەگەڵ رژێمە پڕ کرفتەکاندا بۆتە گەورەترین پاڵەوانی سیستەمە تۆتوکراسییەکانی دنیا. رێکخراوی مافی مرۆڤی جیهانی (Human Rights Watch) گلەیی ئەوە دەکات کە چین لە رێگای بەرنامە زیاد بوونە دەرەکییەکانی دەرگایەکی تری لە بەردەم دیکتاتۆرەکانی جیهان کردۆتەوە، کە جارێن بە تەواوەتی پشتیان بەستبوو بەم یارمەتییانەی بە مەرجی پێشکەوتن لە بواری مافی مرۆڤ پێشکەشدەکران. یارمەتییەکانی چین تەنها ئابووری نین کە زۆر بە سەخاوەتەوە دابەشیاندەکەن، بەڵکو یارمەتی سیاسی لە UN و ئەنجوومەنی ئاسایش پێشکەش بە هەندێ وڵات دەکەن، وەك مەشق پێکردنی دژە تیرۆر و تەنانەت بەخشینی کەل و پەلی هەستیاری سیخوریش دەگرێتەخۆ.

چین یارمەتی سیاسی و سەربازی و تەکنیکی پێشکەش بە رژێمی سەرۆك رۆبەرت مۆگابی سەرۆکی زیمبابۆی کرد. تەنانەت بوو بە بەربەست لە UN دژ بە لێکۆڵینەوە لە سیاسەتی " تۆپەراسیۆنی پاککردنەوەی پیسی" کە بوو بوو بە هۆی دەرکردنی ٧٠٠ هەزار لە خەڵکی هەژاری شارەکان لە زیمبابۆی، بەیگین هەروەها کەل و پەلی سەرکوتکردنیدا بە مۆگابی وەك: تەشویشی رادیۆ و راگرتنی پەخش، سانسۆر کردنی ئیمەیل و پەرتکردنی خۆپیشاندان. دوابەدوای ئەوەی حکومەتی ئۆزبەکستان سەدان کەس لە خۆپیشاندەران کوشت لە ساڵی ٢٠٠٥ لە ئەنجامدا ئەوا سەرۆکی وڵات ئیسلام کەریمۆف بە فەرشی سوور پێشوازی لێکرا لە بەیگین و گرێبەستێکی نەوتی ٦٠٠$ لەگەڵ مۆرکرا و وەعدی پێدرا کە هێزی پۆلیسی مەشقی تایبەتی بکات لەسەر بلاوکردنی قەڵەمباڵغی.

چین گەورەترین وەبەرهێنەرە لە بۆرما، حکومەتی بۆرما کە زۆر توند و سەرکوتکەرن یارمەتییەکی بێ وێنە لە چین لە هەموو لایەنێك وەردەکرن،یارمەتی گشتی، سەربازی و تەکنەلۆژی. چین قەرز بە قازانجێکی زۆر کەم دەدات بە حکومەتی بۆرما، دواتریشیان لە ساڵی ٢٠٠٦، ٢٠٠$ ملیۆنی دا بە پێنج وەزارەتی بۆرمی.

هەروەها ٩٠٪ چەکی بۆرما لە چینەوە دێت. لە لایەکی تریش بڕی ١,٦$ ملیار دۆلاری داوە بۆ تازەکردنەوەی هێزی سەربازی ئەم وڵاتە. چین چەندین تیمی راوێژکاری رەوانەی ئەم وڵاتە کردووە بۆ هاندانی دەسەڵاتداران تا چاکسازی لە وڵاتەکەیان ئەنجامبدەن بۆ کەمکردنەوەی فشاری نێودەوڵەتی. بە گوێرەی هەندێك سەرچاوە هەوڵەکان بە ئاراستەی ئەوەن تا تاقیکردنەوەی کۆنگرەی میللی نیشتمانی چینی (پەرلەمان). (National People's Congress) بۆ دیموکراسی بگوازنەوە بۆ بۆرما. ئەم کارەی چین نەك تەنها نەیهێشت رژێم بڕوخێت، بەڵکو بوو بەهۆی ئەوەی هندستان واز لە سیاسەتی ئابلوقەدان و دابڕینی ئەم وڵاتە بهێنێت. (دەڵێی ترسی ئەوەی هەبوو کە رانگون (بۆرما) بکەوێتە ژێر کاریگەری چین).

چین نایەوێت داکۆکی لە رژێمە رووخاوەکان بکات. لە ژێر کاریگەری و فشاری رۆژئاوا، چین تاکتیکەکانی خۆی گۆڕی سەبارەت بە سودان، زیمبابۆی و بۆرما. بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە چین پاڵپشتی لە سیستەمی فرە حیزبی و هەڵبژاردن و مافی مرۆڤ دەکات. چۆن بانگەشەی هەندێ ماف بکات بۆ بیانیان کە هاوڵاتیانی چین لێیان بێ بەشن.

**هێزی نیشتمانی سەربازی:**

تۆنی بلێری سەرۆك وەزیرانی پێشووی بەریتانیا لە ساڵی ١٩٩٩ بەم جۆرە وتارێکی پێشکەش بە ئەتەوەی ئەمەریکی کرد لەو کاتە جینوساید سەرتاپای کۆسۆڤۆی گرتبۆوە: زۆر سەختە، هەندێك جاریش تووشی ناڕەحەتییەکی زۆرت دەکات کە هەستدەکەیت بوویت بە کەرەستەی چارەسەرکردنی هەموو کێشەکان ، لە تۆش چاوەڕوان دەکرێت کە هەموو کاتێك و لە هەموو شوێنێك ئامادە بیت بۆ ئەنجامدانی هەر کارێك کە پێویستی بە ئەنجامدانە. تۆنی بلێر ئەم وتارەی بۆیە پێشکەشکرد تا هانی ئەمریکا بدات بۆ راگرتنی کاری قەتل و عام و جینوساید. بەم جۆرەش بانگەوازی بۆ پرەنسیپ و بیروباوەڕە تازەکەی دەکرد" کۆمەڵگای نێودەوڵەتی" کە

ڕێگا بە دەوڵەتە گەورەکان دەدات دەستێوەردان بکەن لە کاروباری وڵاتانی تر لە حاڵەتی جینۆسایددا، چونکە ناکرێت جینۆساید بە مەسەلەیەکی ناوخۆی وڵاتان لە قەڵەم بدرێت، هەروەها مافی مرۆڤیش.بەڵام ئەمڕۆ کە USA لە عێراق و ئەفغانستان چەقیوە، زۆربەی هەرە زۆری کێشە جیهانییەکان و ئەو گروپانەی بە دوای چارەسەر بۆ قەیرانەکان دەگەڕێن ڕوویان کردۆتە بەیگین بۆ دۆزینەوەی چارەسەر. بەشداریکردنی چین لە دۆزینەوەی ڕێگاچارە بۆ کێشەی کۆریای باکوور و بۆرمای دراوسێ جێگای سەرسوڕمان نییە، بەڵام کێ بیری لەوە دەکردەوە کە چین دەبێتە سەرچۆپی کێشی گفتوگۆی جیهانی سەبارەت بە گۆڕانی ژینگە و کێشەی ئەتۆمی ئێران و چاکسازی لە زیمبابوی؟ لە هەمووشی گرنگتر پێشهاتەکانی کێشەی دارفۆرە کە بەیگین ڕۆڵی یەک لاکەرەوەی تێدا دەبینێت.

هەڵگری مەدالیای زێڕینی ئۆلۆمپی ئەمریکی جۆی چیک Joey Cheek بە سەرۆکایەتی وەفدێک لە مانگی حەفتی ۲۰۰۷ دا سەردانی باڵیۆزخانەی چینی کرد لە واشنتۆنDE . بۆ ئەوەی داوا لە چین بکات توانای خۆی بەکار بهێنێت بۆ چارەسەر کردنی کێشەی دارفۆر، چونکە ئەم پێیوایە پەیوەندی تایبەتی چین بە خەرتووم فاکتەرێکی زۆر گرنگە بۆ چارەسەر کردنی ئەم تەنگژەیە کە تەنها بە چین دەکرێت. ئەمەش دەرفەتێکی زۆر باش بوو بۆ حکومەتی چین بۆ ئەوەی نیشانی هەموو دنیا بدە کە ئەوان دەتوانن شتێک بکەن ڕۆژئاوا نەیتوانی ئەنجامیبدات، ئەمەش دووپاتکردنەوەی ئەو ڕاستییەیە کە چین هێزێکی ڕاستەقینەی جیهانی تازەیە. بەیگین لە ژێر فشار دایە بۆ بەکار هێنانی کاریگەری خۆی لەسەر حکومەتی سودانی، لە هەمان کاتیشدا چەك دەفرۆشێت بە حکومەتی سودان، دوو لەسەر سێی نەوتی ئەم وڵاتەش دەکڕێت و (6$) ملیار دۆلاری وەبەر هێناوە لەم وڵاتە. لە هەموویشی گرنگتر چین توانی لە ڕێگای دیپلۆماسیدا ڕێگا چارە بۆ کێشەی دارفۆر بدۆزێتەوە و ئاسایشی بگەڕێنێتەوە بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان لە نیویۆرك، چەندین جاریش ڕێگای گرت لەبەردەم سەپاندنی سزا بەسەر حکومەتی سودان، حکومەتی

سودانیشی قایل کرد بە قەبوولکردنی هێزی ئاشتی پارێز (ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان تەنها توانی سزا بەسەر چوار بەرپرسی بچووك بسەپێنێ لە قەدەغە کردنی سەفەر و سڕکردنی پارە و پووڵیان لە کێشەیەکدا کە ٤٠٠ هەزار کەس بوون بە قوربانی و دوو ملیۆن کەسیش دەربەدەر بوون).

چین لە دارفۆر و کێشەکەی زۆر بە وردی و هەستیاری مامەڵەی کرد. هەوڵیدەدا کە خۆ بدۆزێتەوە و نکۆڵی لە تۆمەتی حکومەتی سودان بکات لە ئەنجامدانی کاری جینۆسایدا،لە لایەکی تریش چین نەیویست ببێتە ئاستەنگ لەبەردەم ناردن و دەستنیشانکردنی نێردراوی تایبەت بۆ دارفۆر لە ٢٠٠٧ و پاڵپشتی کرد لە بیرۆکەی ناردنی هێزی ئاشتی پارێز سەربە UN، هەروەها فشاری خستە سەر حکومەتی سودان بۆ ئەوەی دانووستان و وتووێژ ئەنجامبدات لەگەڵ بەرهەڵستکارانی دارفۆر. بەڵام لە هەمان کاتیشدا زۆر بە وردی کاریگەری خۆی بەکار هێنا، بە جۆرێك کە رازی نەبوو ئابلوقە و سزا بەسەر رژێمی سودان بسەپێنرێت، و پێیان داگرت لەسەر ئەوەی ناردنی هەر هێزێك بۆ سودان دەبێت بە رەزامەندی حکومەتەکە بێت. چین لە مامەڵە کردنی لەگەڵ کێشەی دارفۆر بە شێوەی هەمە لایەنە (Multilateralism) مامەڵەی کرد بۆ زیادکردنی هێزی خۆی و سودانی دۆستی، پێشیان داگرت لەسەر ئەوەی کە هەموو بڕیارەکان دەبێت لە رێگای ئەنجوومەنی ئاسایشی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکانەوە بێت (کە چین دەنگێکی هەیە)، و هەمیشە بانگەشە بۆ وتووێژی هەمە لایەنە دەکەن. هەر بەم جۆرەش چین مامەڵەی لەگەڵ کێشەی کۆریای باکوور و بۆرما کرد لە رێگەی وتووێژ و دایەلۆگ بۆ سەپاندن و سەقامگیری ئاشتی. زۆر بە زیرەکانە چین توانی هەر هێندە فشار بخاتە سەر ئەم حکومەتانە بۆ رازیکردنی رۆژئاوا، بەڵام نەبێتە هۆی مەترسی خستنە سەر رژێمە ناوەندییە سەرکوتکەرەکان (Autocratic) کە هەمیشە چاوەڕوانی یارمەتی لە چین دەکەن.

مامەڵە کردنی چینی لەگەڵ کێشەی دارفۆر نیشانەی ئەوەیە فەلسەفەی" جیهانی دیواردراو" شۆڕشێکە کاریگەری یەکجار زۆری هەیە لەسەر جیۆپۆلیتیك

(Geopolitics). له سەرەتای چەرخی بیست و یەکدا حکومەتە رۆژئاواییەکان و هاوڵاتیانیان لە ژێر کاریگەری کرداری جینۆساید بوون لە رواندا و کامپی تیرۆرستان لە ئەفغانستان و پیتاندنی ئەتۆمی لە ئێران، هەستیان بە بەرپرسیاریەتی بۆ دەستێوەردان لەو وڵاتانەی هەڕەشە لە مافی مرۆڤ و ئاسایشی نێودەوڵەتی دەکەن. بەڵام بەمیگین مەوکرە لەسەر داکۆکی کردن لە بیرۆکەی کۆنی سەروەری (Sovereignty) کە پێناسەکەیشی بریتییە لە پاراستنی سەروەری دەوڵەتان. بنەماکانی ئەم سیاسەتەش بریتییە لە داگیر نەکردنی وڵاتان، هەوڵنەدرێت بۆ رووخاندنی رژێمەکان و لە هەمرویشی گرنگتر دەستێوەرنەدان لە کاروباری ناوخۆی وڵاتاندا. لە شوێنی پرەنسیپی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی تۆنی بلێر ئەوان کار بۆ "هێزی نیشتمانی سەرتاسەری "دەکەن (Comprehensive National Power).

چین لە رێگەی پرەنسیپی تازە دۆزراوەی" هەمە لایەنی" یان فرە لایەنی (Multilateralism) و پرۆپاگەندە و بانگەشە بۆ بەرنامە نێودەوڵەتییەکە دەکات" هێزی سەرتاسەری نیشتمانی". بەهۆی پاڵپشتی کردن لە ئەتەوە یەکگرتووەکان و دروستکردنی رێکخراوی هەرێمی بەمیگین نەك هەر تەنها بەلانسی هێزی گۆڕیوە لە زۆر لە بەشەکانی جیهان بەڵکو رێزگرتنی لە سەروەری نیشتمانی دووپات کردۆتەوە. رێکخراوی یەکێتی ئەورووپی و ناتۆ NATO کە دامەزراوی رۆژئاواین بەوە پێناسە دەکرێن کە سەروەری نیشتمانی کەمدەکەنەوە لە بیری زیاد کردنیان، هەروەها هەردوو رێکخراوی چینی کۆمەڵگای رۆژهەڵاتی ئاسیا و رێکخراوی هاریکاری شەنگەهای لە ژێر کاریگەری ئەم پرەنسیپە دروستبوون. بەڵام چین دراوسێکانی دڵنیا کردۆتەوە لەوەی ئەم رێکخراوانە ئامانجی ئاشتیخوازی و هاریکاریان هەیە و هەڕەشە نین بۆسەر هیچ لایەك، مەبەستیش دروستکردن و پاراستنی بەرژەوەندی ئەندامەکانەکە پەیوەندی باشیان لەگەڵ ئەمریکا نییە. بەرپرسی پێشووی ئەمریکی سوزان شیرك (Susan Shirk) بەراوردێك دەکات لە نێوان وڵاتەکەی دوابەدوای جەنگی جیهانی دووەم و دیپلۆماسیەتی هەمە لایەنەی چینی ئەمرۆ، دەڵێت: ویلایەتە یەکگرتووەکانی

ئەمریکا توانی بڕوا بە وڵاتانی تر بهێنێت کە مەترسیان لەسەر دروست ناکات لە ڕێگای دروستکردنی دەزگا و دامەزراوی جیهانی هەمە لایەنە، بەڵکو خۆی (USA ) دەخاتە ژێر دەسەڵاتی ئەم دامەزراوانە. بە واستە بوونی ویلایەتە یەکگرتووەکان بە یاساو بڕیارەکانی ئەم دەزگایە USA توانی سەرکەوتوانە دەسەڵاتی خۆی بەسەر سیستەمی جیهانی بسەپێنێت. ئایا بەشدار بوونی چین لە دەزگا و دامەزراوە هەرێمی و جیهانییەکان هەمان دەرئەنجامیان دەبێت؟ کە ڕێگا بە چین بدات وەك هێزێکی جیهانی هەڵسێت و ببوژێتەوە؟

ئەتەوە یەکگرتووەکان بووە بە ئەمپلی فلیەر (Amplifier) بۆ تێڕوانینی چین بۆ جیهان. چین بە پێچەوانەی رووسیایە کە زۆر بە شانازییەوە هەڵسوکەوت دەکات و تام و چێژ وەردەگرێت کاتێك ئەنگۆو و بەربەست و گرفت لە بەردەم پلانەکانی USA و EU دروستدەکات، بەڵکو چین دەیەوێت وا خۆنیشاندات کە هەمیشە لە هەوڵێستی چارەسەر خوازیدایە. کاتێك کە بخوازێت ڤیتۆ بەکار دەهێنێت، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی دەیەوێت خۆی لە پەنای خەڵك بشارێتەوە، ئاستەنگ دروستبکات کەسیش گلەییان لێ نەکات. لە شەڕی دژ بە عێراق هەر چەند زۆر بە توندی دژی ئەم کارە بوو بەڵام ڕێگای بە فەرەنسا و ئەڵمانیا و رووسیادا کە سەرکردایەتی ئەم بەرهەڵستکارییە بکەن.کاتێك گفتوگۆ گەرم بوو لەسەر گەورە کردنی ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی لە ٢٠٠٥ چین هانی وڵاتانی ئەفریقیای دەدا تا داوای کورسییەك بکەن بەو مەرجەی مافی ڤیتۆیان هەبێت، بەم کارەشی داواکارییەکەی ژاپۆنی لەبار برد بۆ هەمان مەبەست پێشکەشیان کردبوو (ئەندامی هەمیشەیی لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی لەگەڵ مافی ڤیتۆ).بەهەمان ئەندازەش بەیگین ڕێگای بە ڕێکخراوی وڵاتە ئیسلامییەکاندا بۆ لاواز کردنی کۆمەڵەی مافی مرۆڤ (HR Council). ئەم دیپلۆماسییەتە ژێر وردبینە کاریگەرییەکی تێکدەر هەبوو لە بەشدار کردن لە کەم کردنەوەی کاریگەری USA : لە ساڵی ١٩٩٥ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە هەڵبژاردنەکانی کۆمەڵەی گشتی ئەتەوە یەکگرتووەکاندا ٥٠،٦٪ دەنگەکانیان هێنا،

بەلام لە ساڵی ٢٠٠٦ دا، ٢٣٪ یان هێنا، ئەنجامەکانیشی لە مافی مرۆڤ زۆر لەوە خراپتر بوون: ئەنجامەکانی چین لە ٤٣٪ فڕی بۆ ٨٢٪ . بەلام هی ئەمریکا لە ٥٧٪ هاتە خوارەوە بۆ ٢٢٪ . پەیامنێری رۆژنامەی نیویۆرک تایمز بۆ کاروباری نەتەوە یەکگرتووەکان جیمس تراوب (James Traub) سەرنجی داوە کە کارەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان و ئەنجوومەنی ئاسایش کاتێك ئەنجامدەدرێن ئەگەر ئەمریکا رێگا بدات. ئەم قسە راستەی جیمس رەنگە بەم زووانە چینیش بگرێتەوە. جیمس تراوب راستە کە دەڵێت تواناو کاریگەری چین لە نەتەوە یەکگرتووەکان لە زیاد بووندایە، رەنگە دوای ماوەیەك گلەیی لە دەسەلات و کاریگەری چین بکەین لە UN سەبارەت بە سیاسەتی گەورە و گرنگ لە جیاتی ئەوەی بڵێین ئەگەر ئەمریکا وای نەکردبوایە.

### نموونەی چینی:

لە ساڵەکانی ١٩٩٠ دا رۆمانتوسی (ساخر) وەنگ شوۆ (Wang Shuo) دەسەلاتدارانی چینی زۆر نارەحەتکرد بە بلاوکردنەوەی رۆمانێکی زۆر سەرکەوتوو کە ژمارەیەکی یەکجار زۆری لێفرۆشرا بە ناونیشانی "پێم مەلێ مرۆڤ" ( Don't Call me Human)، کە تیایدا خەیاڵی خۆی بەکار هێناوە بۆ نیشاندانی ئۆلۆمپیادی بەیگین کە میللەتانی جیهان لەم ئۆلۆمپیادەدا پێشبڕکێ لەسەر ئەوە دەکەن کە کێ زیاتر (ئەحولی ئیهانە دەکات)، لە جیاتی پێشبڕکێی وەرزشی و هێز. لەم پێشبڕکێیانەدا چین دەیەوێت بەهەر جۆرێك بێت پلەی یەکەم بەدەستبهێنێت.

پاڵەوانی رۆمانەکە کە شوفێرێکی (فاشل)ی تاکسییە کە ناوی (یوانبۆ)یە (Yuanbao) سەرۆکایەتی تیمی چین دەکات بەرزترین خاڵی بەدەستهێناوە هەر لە خولردنەوەی مێزی پێشبڕکێ کەرەکانی تر و هەتا بە زیندووی سڕیکەن بە بەستن لەناو تانکی ماسی گواستنەوەدا. رۆمانەکەی وەنگ شوۆ (Wang Shuo) زۆر وەحشیانە گاڵتە بە مەترسییەکانی وڵاتەکەی دەکات لە پاراستنی روو...

له کۆتایشدا له درامایەکی زۆر ناخۆشدا یوانباوۆ Yuanbao پاڵەوانی ڕۆمانەکە پێستی دەموچاوی دادەدڕێت تەنها بۆ بردنەوەی مەدالیای زێڕین.

دیمەنێکی زۆر ترسناکە،دژە پاڵەوانێکی (Anti- hero) بێ دەموچاو لەناو کۆمێك خوێن وەستاوە و پێستی دەموچاوی خۆی بەرز لە سەرسەری خۆی ڕاگرتووە وەك پاڵەوانێکی سەرکەوتوو. ئەم ڕۆمانە ڕەخنەیەکی زۆر قورس بوو هەوڵەکانی چین بۆ دروستکردنی هەستکردن بە گرنگی شانازی نیشتمانی. هەر بۆیە کەوتە ژێر هەڵمەتی دەزگای پیسبوونی ڕۆحی (Spiritual Pollution). وەنگ شوۆ لە ڕۆمانەکەیدا دەیەوێت بڵێت، بۆ ئەوەی چین ڕزگاری بێت لەو هەموو ئیهانە کردنەی کە لە لایەن بیانییەکانەوە پێیان کراوە دەبێت چینییەکان خودی ئیهانەکە لە ئامێزگرن (Toembrace thet humiliation it self).

ئەو بەچینەی کە وا خەریکی خۆ ئامادە کردنە بۆ ئۆلۆمپیادی ٢٠٠٨ جیاوازییەکی زۆری هەیە لەگەڵ وەسفەکەی وەنگ شاوۆ، چونکە ڕژێم ئەم یاریانە بە دووپاتکردنەوە و ناساندنی (چین)ە وەك زلهێز، ئەو ئەوەی کە دووچاری ئیهانە هاتن وا ڕێگا چۆڵدەکەن بۆ ئەومیەکی تر کە جگە لە سەرکەوتن هیچی تر نازانن نەبینیوە. لە دەرەوەش وڵاتانی دنیا خۆیان بە چین گرتووە تا ڕادەی (یادمان)، تەنها لە ساڵی ٢٠٠٦ دا نزیکەی نیوەی سەرگردەکانی وڵاتانی جیهان سەردانی چینیان کرد (ژمارەی وڵاتانی جیهان نزیکەی ١٩٢ وڵاتە). بەڵام سەرەڕای ئەمانەش بیرکردنەوەی چینییەکان تا ئەمڕۆش هەر بەرگریکردنە (Defensive). ئەم بەرگریکردنە و داکۆکی کردنە مێژوویەکی دووروودرێژی هەیە، فەیلەسوفە هاوچەرخە چینییەکان لە جیاتی ململانێ کردن لەگەڵ ڕۆژئاوا بە پێوەری ڕۆژئاوایی وا خەریکن پێوەر و بنەماکانی یاریکردن دەگۆڕن هەروەك کۆمیتەی ئۆلۆمپی ڕۆمانەکەی وەنگ شاوۆ، تەنها ئەو یاریانەش دەکەن کە خۆیان سەرکەوتنی تێدا بەدەستبهێنن و باڵادەستی خۆیانی تێدا دووپات بکەنەوە.

زۆربەی هەرە زۆری تەواتەی سەرداتی بەچین دەکەن، هەروەك مەراسیمی حەج تاسا سەرداتی" پەرستگای بەهەشت" یش دەکەن. منارەکەی وەك خەیاڵ دەروانینە پایتەختی چین، وەك کۆڵکە زێڕینەیەك وایە کە بە خەڵکەکە بەخشراییێت وەك خەڵاتی دوای مەرگ و زیندوو بوونەوە. تەلار سازییەکی یەکجار زۆر وردی تیا بەکار هاتووە و زۆر لێکدانەوەی فەلەکی بۆکراوە تا بەڕاست لاسایی کردنەوەی بەهەشت بچێت، لە نێو ژمارەیەکی زۆر لە پەڵە هەوری مەرمەڕی هەڵساوەتەوە بەر لە گەیشتن بە لوتکەی گردەکانی مەراسیمی بەهەشت"Altar of Heaven".

نەگێرە بوو ئەو ئیمپراتۆرەی کە ناسرابوو بە کوڕی بەهەشت قوربانی و دوعاو نوێژەکانی پێشکەش بە حاکمی گەردوون دەکرا (Ruler of the Universe)، ئەو یاسایانە کە ساڵانە دەریدەکردن دارێژرابوون بە جۆرێك کە بوو بوون بە سومبلی سیستەمی جیهانی لە چینی کۆن. لە ژێر سایەی پرەنسیپی "تیان خیا" Tian Xia یانیش هەموویان لە ژێر سایەی بەهەشت، ئیمپراتۆر هەموو سنوورەکانی دەبەزاند و بوو بوو بە سەنتەری سیستەمی جیهانی. سەرەڕای ئەوەی هەموو نارەزوو و ناماڵجەکانی خۆیانیان هێنابووە دی لە قازانجی پەرستگاکانیان، بەڵام ئیمپراتۆریەتی منگ Ming خەریکی دروستکردنی سومبلێکی نیشتمانی و نەتەوەیی مەزنتر بوون، دروستکردنی دیواری چین. لەو کاتەی باوەشیان بۆ دنیا کردبۆوە هەستیانکرد کە ئەم کارەیان مەترسیدار دەبێت سنوور دروستبکەن. وەك قەڵغان بۆ پاراستنی چین لە مەترسی بەربەری و بیانیان. خێزانی مینگی فەرمانڕەوا وەك هەموو دەسەڵاتدارانی تری چین ترسیان لێنیشتبوو ئەوەك نەتوانن چین بە یەك پارچەیی بهێڵنەوە لە مەترسی دراوسێکانیان. ئەویش کاریگەری هەبوو لەسەر چینییەکان هەر بۆیەش کەوتنە ژێر کاریگەری باری دەروونی دیواری مەزن. ئەو کاریگەریە هێندە زاڵە بەسەریان کە رەنگدانەوەی هەیە بەسەر ناسنامەی نیشتمانی، جۆری ژیان تەنانەت نەطف و بای نووسینی چینی. هەموو شارە چینییەکان ئەنراون بە دیوار، خانووی دێهاتەکانیان بریتییە لە خانوویەك چواردەوردراو بە دیوار لە هەمان کاتیش پیتی نووسینیشیان بریتییە لە چوار دیوار.

هەر چەندە مەترسییەکانی چین سەبارەت بە سەروەری و لەدەستدانی دەسەڵات کاتێک بوون کە چین لە داگیرکردنی دەرەکی دەترسا، بەڵام ئەم بیرۆکانە ئەمڕۆ روو لە وڵاتانی دەرەوە کردووە. عەقلیەتی دیواری مەزنی ئەمڕۆ چین مەترسی داگیرکردنی دەرەکی نییە، بەڵکو بریتییە لە بانگەشەی چین بۆ دیدو بۆچوونیان سەبارەت سەروەری. بەمەش بە گوێرەی پلانێکی دارێژراو روونادات. چین هێندە گەورە و چالاک و پراکتیکە و پراگماتیکە و هێندەش پێویستی بە سەرکەوتن هەیە، هەر بۆیەش سەرکردە سیاسییەکانیان بە بەردەوامی خەریکی تاقیکردنەوەی رێگای تازەن بۆ ئەنجامدانی کارەکانیان. ناوچەی ئابووری تایبەت بەکار دەهێنن بۆ تاقیکردنەوەی فەلسەفەی تازە و جۆراوجۆری بازاڕ.

هەر ئێستا هەزار جۆر بیرۆکە تاقیدەکەنەوە. هەر لە راوێژکاری گشتی هەتا هاوپەیانی هەرێمی.بەڵام هەر لەم تاقیگە مەزنەدا بۆ تاقیکردنەوە کۆمەڵایەتییەکان تێڕوانین و دیدێکی تر بۆ جیهان سەری هەڵدا کە لە داهاتوو بە مودیلی چینی دەناسرێت. ئازاد بوونی چین لە ژێر کاریگەری رۆژئاوا خۆی لە خۆیدا بووە بە ئەلتەرناتیڤ، رێگایەکی تری غەیرە رۆژئاوایی بۆ وڵاتان و کەسانی تر کە رێچکەی بگرن. بیرۆکەی (جیهانی دیواردراو) لە دەوڵەتی نەتەوەیی (Nation States) کۆنترۆڵی داهاتووی ئابووری و سیاسەتی سیاسی و سیاسەتی دەرەکی خۆی دەکات و وەك رکابەرێکی ئایدۆلۆژی رووبەرووی فەلسەفەی ئەمریکی بوو "جیهانی پسان" و هەمە لایەنی لیبراڵی ئەورووپی بۆتەوە. لەم کەش و هەوایە پڕ"منافسەیە" دارێژەرانی سیاسەتی رۆژئاوایی دەبێت بیروباوەڕی خۆیان لە باوەشگرن و بیانکەن بە کردار ئەگەر بە راستی بیانەوێت بانگەشە بۆ بیروباوەڕی لیبراڵ بکەن.

چەرخی بیست ویەك نابێت بە چەرخی چینی کە تیایدا ماکدۆناڵدز بگۆردرێت بە مانتاووMantou (چێشتخانەی خێرای هەرشتە یان نوودڵی چینی) وەك بە ناوبانگترین خواردنی جیهانی، یانیش CCTV چینی جێگای CNN بگرێتەوە. یانیش نیوومێڤ New Wave جێگای هۆلیود بگرێتەوە. بەڵام چین شان بەشانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و یەکێتی ئەورووپا دەبێت بە رێکخەری سیستەمی جیهانی. ئەحەددای کاریگەری

و بەرژەوەندییەکانی رۆژئاوا دەکات لە ئەفریقیا، ئاسیا، رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ئەمریکای لاتین و کۆمارە کۆنەکانی یەکێتی سۆڤیەتی جاران بە نموونەیەکی تازە لە جیهانگیری.ئەگەر چین بەردەوام بێت لە گەشەسەندن ئەوا رەنگە لە داهاتوودا خۆپیشاندەرانی بەردەم رێکخراوی بازرگانی جیهانی گلەیی لە یەکدەنگی بەیگین و واشنتۆن لە یەك کاتدا بکەن. هەروەها رەنگە گرنگی بدەن بە وتارەکانی سەرۆکی چین بۆ کۆنگرەی میللی چینی شان بە شانی وتاری سەرۆکی ئەمریکی بۆ نەتەوەی ئەمریکی "Stat of the Union". ململانێی خای و لیXi and Li رەنگە وەك ململانێی نێوان (نیکۆلای سارکۆزی و سیگۆلین رۆیال و رەدی جوولیانی و هیلاری کلینتۆن) یان لێبێت.

پلانەکانیان بۆ ئاسیای ناوەڕاست بێت، هەروەك ماوەیەکی زۆر خەریکی سیاسەتی پارێزگارە تازەکانی ئەمریکی بوونNeo-Cons سەبارەت بە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست. هەروەها رەنگە بۆنۆوBono بۆب گیلدۆفBob Geldof جاری داهاتوو بۆ پاراستنی ئەفریقیا، رەنگە گەورەترین کۆنسێرت لە یاریگای ئۆلۆمپی بەیگین بگێڕن لە جیاتی هاید پارکی لەندەن. رێگای چین بۆ بوون بە زلهێزی ئاسان نابێت. رەنگە نموونەی چینی بۆ دەوڵەتی سەرمایەداری و بازاڕی کراوە و سیستەمی سیاسی داخراوە زۆر درێژ خایەن نەبێت. بەلام جێگای وەبیرخستنەوەیە کە تاقیکردنەوەی ئابووری سۆڤیەتی جاران سێ نەوەی پێچو تا رووخاو هەرەسی هێناو لە مەیدانی عەمەلی فەشەلی هێنا، سەرەڕای ئەوەش تاقیکردنەوەی سۆڤیەتی بوو بوو بە ئەلتەرناتیڤێك کە ململانێی لەگەڵ بیروباوەڕی دیموکراسی لیبراڵی رۆژئاوادا دەکرد.

پێشکەوتنی چین حاڵی حازر بەڵاتی ئابووری و سەربازی گۆڕیوەتەوە، ئێستاش بیرو بۆچوونی جیهان بۆ سیاسەت و ئابووری و سیستەمی جیهانی دەگرێت. ئەوانەی پێیان وابوو کە دەوڵەمەند بوونی چین وادەکات چینییەکان زیاتر بەرەو رۆژئاوا بێن بە هەڵە دەرچوون. بۆ یەکەمین جار دوای شەڕی سارد، ئەورووپاو ئەمریکا رووبەڕووی ئەلتەرناتیڤێکی زەبەلاح و ترسناك دەبنەوە ئەویش بریتییە لە نموونەی چینی" The Chinese Model".

## چەند کەسایەتییەکی ئەم کتێبە

سوی زهایوان: Cui Zhiyuan: پرۆفیسۆری سیاسەت و بەڕێوەبردنی گشتی لە زانکۆی تسنگهوەTsinghua لە بەیجین. یەکێکە لە سەرکردەکانی چەپی تازە، لە ڕێگەی هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی ئەلتەرناتیڤ بۆ بیری لیبراڵی تازەی سەرمایەداری زۆر بە چاکی لە نێوەندی بیرمەندان سەری هەڵداو ناسرا. بە ناوبانگترین بەرهەمی کتێبێکە بە ناونیشانی گوندی نانجی" Nanjie"، جگە لە وتارێکی بە ناوبانگ کە بانگەواز بۆ " قۆناغی دووەمی ئازاد کردنی بیر". لە ساڵی ۱۹٦۳ لە دایك بووە و باوکی ئەندازیاری ئوکلیاری بوو لە سچیوان"Sichuan". سوی سەرەتا لە زانکۆی هونان Hunan خوێندنی دەست پێکرد لە پاشان خوێندنی ماستەری لە ئەکادیمیای زانستە سیاسییەکانی لە بەیجین CASS دەستپێکرد، بەڵام تەواوی نەکرد و تا ساڵی ۱۹۸۷ چوو بۆ زانکۆی شیکاگۆ. لە ساڵی ۲۰۰٤ گەڕایەوە بۆ چین لەبەر پیربوونی دایك و باوکی چونکە ئەویش تاقانەی دایك وباوکی بوو. گفتوگۆی هزری ساڵانی ۱۹۹۰ لەو شوێنە بوو کە لێکۆڵەرەکانی لێبوون چونکە دەیانتوانی بە ئازادی بیر بکەنەوە و بیروڕاکانیشیان بڵاوبکەنەوە، لەسەرووی هەموشیان هۆنگ کۆنگ. سوی دەڵێت کە لە دەرەوە بیت کاریگەریت زیاترە بە ئازادی خۆت قسە دەکەیت، بەڵام ئەمڕۆ ئازادترین، چونکە ئەتەرنێت کاریگەرییەکی زۆری هەیە، باسی هەر شتێك بکەیت ئاساییە بەڵام تەنها باسی بە پەلە لادانی پارتی کۆمۆنیستی فەرمانڕەوا نەکەیت.

فانگ نىنگ: Fang Ning :یەکێکە لە باشترین بیرمەند و هزرڤان لە بواری تیۆری سیاسی.باشترین کاری نووسینی بریتییە لەکتێبێك بە ناونیشانی ڕێگای چین لە ژێر سێبەری جیهانگیریدا". Chinas Raad under the Shadow of Globdiziantion (1999) " کە لەگەڵ وەنگ خیاودۆنگ Wang Xiaodoug بە هاوبەشی نووسی بوویان و لە ساڵی ۱۹۹۹ بڵاو کرایەوە.فانگ ننگ زۆر شانازی بەو

وتاره دەكـات كەلـه ١٩٩٧ نووسـيبووى بـه نـاوى سۆشـيالیزم بریتییـه لـه بەیەکـەوه گونجان"Socialism is abaut Harmany".

کەیەکێك بوو لەوانەی بلی لە پەیوەندی نێوان سۆشیالیزم و گونجاندن بکەن و دەڵێت ئەم بلیەتەی من بوو بە هـۆی هاتـدان و سـەر هەڵـدانی درووشـمی سیاسـی ئـەمڕۆ لـە" کۆمەڵگای گونجاو و جیهانی گونجاو".

جێگری سەرۆکی دەزگای سیاسیە لە ئەکادیمیای زانستە کۆمەڵایەتییەکانی چینی و یەکێکە لە بە بەرهەمترین نووسەری بواری تیۆری سیاسی و دیمۆکراسی.

لە حکومەت زۆر نزیکـه و لـه زۆر لـه پرۆژەکانیـان بەشـداره، دواترینیـان راپـۆرتی حکومی سەبارەت بە دیموکراسی سالی٢٠٠٦٥ ."White Paperon Democracy".

گـان یـانگ: GanaYang: ئـەکادیمێکی هـەواداری چـەپی تازەیـه. حـالی حـازر پارمەتیدەری لێکۆڵەرەوەیە لە سەنتەری لێکۆڵینەوە ئاسیاییەکانی زانکۆی هۆنگ کۆنگ. دوابەدوای هەلاتنی لە چین بەهۆی خۆپیشاندانەکانی مەیدانی تیانیانمێن Tiananmen چـوو بـۆ USA دکتۆراناماـەی PhD لـه زانکـۆی شـیکاگۆ وەدەسـتهێنا. لـەکارە بـه ناوبانگـەکانی ئێمـە رێـــا دروسـتکەین 1989 Weare Creating Tradition . هەروەها چەند بۆ چوونێك لەسەر لیبرالیـزم 1997 Reflections on Liberalisms. گانگ یانگ خەلکێکی زۆری لە راستی تازە تووڕە کرد بە بەکار هێنـانی دەسـتەواژەی" کاولکاری داهێنـەر"Creative destraction" بۆ وەسفکردنی شۆڕشی کەلتووری.

هونانگانگ: Hu Angang: پیاوێکی زۆر ناناسایی ئـابووری چـینییە، خـۆی قـژە ئالۆزەکە و جل وبەرگە نافەرمییەکانی بەهـەمان حەماسـەتی مۆسـیقاژەن و مایـسترۆی بەریتانی" Nigel Kennedy" و کاریگەریەکەی بەسەر جیهانی مۆسیقای کلاسیکییە. بە هاوبەشی لەگەڵ وانگ شاوۆ گوانگ"Wang Shaoguang" لـە ژێـر ناونیـشانی" توانای دەوڵەتی چینی" "Chinas state Capacity" بلاو کردەوە کە بـە یـەکێك لـه کاریگەرترین راپۆرت دەژمێردرێت لە ٢٠ ساڵی رابردوودا نووسراییێت و کاریگەری یەگجار زۆری هەبێت بەسەر حکومەت و سیاسەتی ئابووری چینی بۆ بەهێز کردنی رۆڵی دەوڵەت.

زیاتر له ٤٠ بابەت و نامیلکەی بڵاو کردۆتەوە راوێژکارێکی بەردەوامی حکومەتی ناوەندی و حکومەتی هەرێمەکانە. ئێستاش پرۆفیسۆر و بەڕێوەبەری سەنتەری لێکۆڵینەوەی چینییەکانە لە قوتابخانەی سیاسەتی گشتی و بەڕێوەبردن لە زانکۆی تسنگهوە. لە کاتی خوێندنی دکتۆرای لە زانکۆی یەلیYale وانگ شاوۆ گوانگی ناسی، هەر لەو کاتەوە پرۆفیسۆری بە سەردانەVisiting Professor لە ژمارەیەکی زۆر لە زانکۆکانی رۆژئاوا.

کاریگەرترین ئابووری ناسی چەپی تازەیە و سەر چۆپیکێشی لێکۆڵەرەوەی چینییەکانە سەبارەت بەباروودۆخی نیشتمانی، ئەم ئارەزوومشی دەگەڕێتەوە بۆ سالی (١٩٨٥)ی ئەکادیمیای زانستی چینی.

پان ویی: Pan Wei پرۆفیسۆرە لە قوتابخانەی لێکۆڵینەوە نێودەوڵەتییەکان و بەڕێوەبەری سەنتەری چینی و مەسەلەجیهانییەکانە لە زانکۆی بەیجین لە ئەستێرە گەشەکانی ئەکادیمیای چینی. لە پرۆژەیەکی لە ژێر ناونیشانی " راوێژکاری سەروەریی و دەوڵەتی یاسا" "Consultative Ruleat Law" کە تیایدا داوا دەکات چین سوود لە نموونە تاقیکردنەوەی سەنگافورە بکات لە جیاتی لیبرال دیموکراتی رۆژئاوایی. ئەو رایەشی کاریگەرییەکی زۆر گەورەی هەبوو. دکتۆرایەکەی لە سالی ١٩٩٦ لە زانکۆی بێرکلیBerke ley ی کالیفۆرنیا وەدەستهێنا. یەکێکە لە هزرڤانە داهێنەرەکانی چاکسازی سیاسی و پەرەپێدان و گەشەسەندنی ئابووری لە لادێی چینی. پان ویی مەیلێکی محافزکارانەی هەیە و بانگەشە بۆ نموونەیەکی چینی لە گەشەسەندنی سیاسی و ئابووری دەکات.

کن یاکنگ: Qin Yaqing: پرۆفیسۆر و جێگری سەرۆکی " زانکۆی چینی بۆ مەسەلە بیانییەکان"،"Chinas Foreign Affaies auaniversity" ناو بانگێکی زۆر چاکی دەرکرد وەك پسپۆری سیاسەتی دەرەوەی چینی. لە سالی ١٩٩٤ دکتۆرای لە زانکۆی میسۆریMissouri وەدەستهێناوە. رۆڵێکی دوو سەرەی زۆر گرنگی بینی لە دەزگایەك کە لە لایەن حکومەتەوە پالپشتی لێدەکرا. زانکۆی مەسەلە بیانییەکانە لە

لایەن وەزیری پێشووی دەرەوەی چین زهۆو ئین لای Zhou En Lai دامەزرا هەمان رۆڵی قوتابخانەی ناوەندی حیزبی بینی لە سیاسەتی ناوخۆ، بەڵام ئەم دەزگایە تایبەتە بە سیاسەتی دەرەوە و بە تومێتی ئەوەی پەل بهاوێژێت بۆ پەیوەندیە نێودەوڵەتییەکانیش. پرۆفیسۆر کن یاکنگ بەشدارییەکی بەرچاوی هەبوو لە دارشتنی سیاسەتی دەرەکی حکومی و راوێژکاری حکومەتی کردووە سەبارەت بە رێکخراوی رۆژهەلاتی ئاسیا بۆ تێکەڵبوونی هەرێمی.

شی ینهۆنگ: Shi Yinhmng: پرۆفیسۆری پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانەوە لە زانکۆی میللی بەیین. یەکێکە لە سەرنجڕاکێشترین بیرمەندی چینی سەبارەت ستراتیژیەتی چین.

مشتومڕێکی زۆری دروستکرد کاتێك بانگەوازی کۆتایی هێنانی بارکرژی کرد لە گەڵ ژاپۆن. مامۆستای سەفەر کردوو بووە Visting Fellow لە زۆر لە زانکۆکانی ئەمریکا، وەك زانکۆی هاروڤارد Harvard و باکووری کارۆلاینا و دینڤەر. پسپۆرە لە بواری " ستراتیژی گشتی" "Grand Stratgy" "یانیش ستراتیژیەتی مەزن".

شی ینهۆنگ ئینتەرناسیونالیستێکی لیبراڵە و زۆر کراوەیە داوای کۆتایی هێنان بە بارکرژی نێوان وڵاتەکەی و هەریەك لە ژاپۆن و ئەمریکا دەکات.

وانگ هوی: Wang Hui: پرۆفیسۆری لێکۆڵینەوەیە لە زانکۆی تسنگهوە Tsinghua و جێگری سەرنووسەری گۆڤاری هزری و بیرمەندی دووشوو بووە، لە ١٩٩٦-٢٠٠٧. یەکێك بوو لە سەرکردە ناسراوەکانی چەپی تازە لە چین و داوا لە حکومەت دەکات کە بایەخی زیاتر بدات بە چارەسەرکردنی کێشەی نایەکسانی و پیسبوونی ژینگە. لە دایك بووی ١٩٥٩ یە لە کیانگسو "Jiangsu"، وە لە خێزانێکی زیرەك پەروەردە کراوە. لە سەردەمی شۆڕشی کلتووریدا لە کاریگەریەکی جل و بەرگ بۆ ماوەی ٢٠ مانگ کاری کردووە دواتر چووە بۆ زانکۆی خینگدو Xingdu و دواتریش دکتۆرای PhD لە ساڵی ١٩٨٥ لە ئەکادیمای زانستە کۆمەڵایەتییەکانی چین وەدەستهێناوە. بەشداریکردووە لە خۆپیشاندانەکانی گۆڕەپانی تیانیانمین Tiananmenی

١٩٨٩. له پاشان چوو بۆ هارڤارد له ساڵی ١٩٩٢ لـه پاشـان ماوەیـەکی لـه زانکـۆی کالیفۆرنیـا له لۆس ئەنجلس بەسەر بردووە. دەڵێت کاتێـك لـه قوتابخانـەی ناوەنـدی بـووم هەموو پایزێك دەچووین بۆ کارکردن لەگەڵ جوتیاران تا شارەزای بـەرووبوومی کـشتوکاڵی بین.

وانگ شاوز گوانگ: Wang Shaoguang: یەکێکە له بەهرەمەندترین بیرمەندانی چـەپی تـازە. پرۆفیـسۆرە لـه زانکـۆی چـینی لـه هـۆنگ کـۆنگ و سەرنووسـەری گۆڤاری"China Review" ،، پتر له ٢٠ ساڵە لـه دەرەوەی چـین ژیـاوە، کۆنەنـدامی گـاردی سـوورە و دکتـۆرای لـه زانکـۆی کۆرنێـل لەسـەر بابـەتی شۆرشـی کـەلتووری وەدەستهێناوە له ١٩٩٠، له نێوان ١٩٩٠-٢٠٠٠ له زانکۆی یەك وانەی وتووە بەرلەوەی بچێت له هـۆنگ کـۆنگ جێگیر بێـت. لـه سـاڵی ١٩٩٣ لەگـەڵ" هونانگـانگ" بـه هاوبەشی"China`s State Capacity Report".

که تیایدا مشتومرێکی زۆر گەورەیان دروستکرد له کۆتاییشیدا ئەم راپۆرتـه بـوو بـه هۆی ئەنجامدانی گۆرانکاری بنەرەتی له سیـستەمی باجی وڵات. هـەر لـەو کاتـەوە ئـەم جووتە کۆمەڵێك راپۆرتی زۆر گرنگیـان نووسـیوە و بـڵاو کردۆتـەوە کـه بوونەتـه هـۆی دەرکردنی فشار و کاریگەرییەکی زۆر لەسەر بریارەکانی حکومەت سەبارەت به سیاسەتی ئابووری وڵات بەم دواییەش بەهاوکاری یان ویی و گان یانگ خەریکی پرۆژەی راپۆرتێکـه سەبارەت و نموونەی تاقیکردنەوەی چینی"Chin Model".

وانگ خیاودۆنگ: Wang Xiaodong: به ناریانگترین نەتەوە پەرستی تونـدرەوی چینییە، بەشی هەرە زۆر جارەکان له سەنگەری پێشەوەی گفتوگۆکـانی پەیوەنـدی نێـوان چین و ئەمریکا و چین و ژاپۆندایە، یـانیش ئەوانـەی سـەبارەت بـه کێـشەکانی ژینگـە. کتێبێکی به هاوبەشی لەگەڵ فانگ ننگ Fang Ning نووسی به ناونیـشانی" رێگـەی چین لـه ژێـر سـێبەری جیهانگیریـدا" "Chian`s Road under the Shadowaf Globaliziation" لـه ١٩٩٩ کـه بریتییـه لـه مـانیفێستۆی شـەپۆلی تـازەی نەتـەوە پەرستەکانی چینییە لـه سـەردەمی جیهانگیریـدا. هـەر چـەندە لەگـەڵ هێڵـی گـشتی

سیاسەتی دەرەکی چین کۆك نییە، بەڵام ڕێزێکی زۆری لێدەگرێت و پەیوەندیەکی زۆری لەگەڵ میرە بچکۆلەکان هەیە، کە بریتین لە منداڵەکانی بەرپرسە پایە بەرزەکانی حکومەت.

یان خیوتۆنگ: Yan Xuetong: بە ناوبانگترین سەرکردەی کۆمۆنیستە تازەکانە "Neo- comm" و لە هەمانکاتدا بە دڵنیاییەوە نەتەوە پەرستە و داوای واقعیەت دەکات سەبارەت بە تایوان و ژاپۆن و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. بەڕێوەبەری دەزگای لێکۆڵینەوەی نێودەوڵەتییەکانە لە زانکۆی تسنگهوە. بە ناوبانگترین بیرمەندی سیاسەتی دەرەکی چینییە. دکتۆرای لە زانکۆی کالیفۆرنیای بێرکیلی لە ١٩٩٢ وەدەستهێناوە. لە دەزگای چینی بۆ پەیوەندییە هاوچەرخەکانی بەیین لە ١٩٨٢-١٩٨٤ وە ١٩٩٢-٢٠٠٠ کاریکردووە.

یانگ یاو: Yang Yao: یەکێکە لەو ئابووری ناسانەی کە لێکۆڵینەوەی کردووە لەسەر کاریگەری هەڵبژاردنەکان و دیموکراسی لەسەر خۆشگوزەرانی. پرۆفیسۆر و جێگری بەڕێوەبەری سەنتەری چینی بۆ لێکۆڵینەوەی ئابووری لە زانکۆی بەیین. دکتۆرانامەی PhD لە ١٩٩٦ لە زانکۆی ویسکۆنسن مادسن Wisconsin Madison وەدەستهێناوە. یانگ یاو خۆی بە دوور دەگرێت لە ئوندڕەوەکانی بازاڕ، کە ئەوانیش بەشی هەرە زۆری ئابووری ناسەکانی ڕاستی تازەن، هەروەها خۆیشی لە هەڵ پەرستەکانی چەپی تازەش دەپارێزێت. یانگ دەڵێت ئابووری ناسە چینییەکان زیاتر ڕاسترەون لە وانەی ئەوروپا و ئەمریکا، منیش چەپڕەوم چونکە دکتۆرانامەکەم لە Wisconsin وەدەستهێناوە کەمترتە سۆشیالسترین ویلایەتی USA . کاتی خۆی ئەمدەزانی Wisconsin چ کاریگەریەکی بەسەر منەوە دەبێت.

یانگ یی: Yang Yi: لە ساڵی ١٩٦٨ چووە ریزی هێزی دەریاوانی چین و لە پاشان کرایە نوێنەری دەریاوانی (ملحق بحري) لە باڵیۆزخانەی چین لە واشنتۆن لە ١٩٩٥-٢٠٠٠. ئێستاش بەڕێوەبەری دەزگای لێکۆڵینەوە ستراتیژییەکانە. لە زانکۆی بەرگری نیشتمانی. سەرۆکی بەشی لێکۆڵینەوەکانی زانکۆیی" ستراتیژیەتی نێودەوڵەتی چینی"

و "ستراتیژیەتی ئاسایشی نیشتمانی"یە. ریزی تایبەتی خۆی هەیە وەك ئەفسەرێك و لێکۆڵەرەوەیەك، هەروەها دەسەڵاتێکی زۆری هەیە لە مەسەلەی سیاسەتی ئاسایشی چینیدا. لەم چەند ساڵانەی دواییدا چەند وتارێك و بابەتی زۆر کاریگەری بڵاوکردەوە سەبارەت بەئاسایشی نیشتمانی لە "Global Times" کە بوو بە جێگای سەرنجێکی زۆر لە ناو چین، هەروەها لە دەرەوەیشی.

یوکیپینگ: Yu Keping: جێگری بەرێوەبەری بەرزی دانان و وەرگێرانی ناوەندییە. ئەم سەنتەرە پێشەنگە لە بزاڤی هەڵسەنگاندن و بڵاوکردنەوەی ئەو دەرس و پەندانەی تاقیکردنەوەی دیموکراسی سەرەتایی هەڵبژاردن و راوێژکاری گشتی وەدەستهاتوون. بەوە ناسراوە کە پارمەتیدەرو بە هانای سەرۆك هوجینتاوۆ دەچێت. یوکیپینگ مشتومڕێکی زۆری نایەوە کاتێك هەندێك وتاری لە کتێبەکەی بڵاوکردەوە بە ناونیشانی" دیموکراسی شتێکی باشە" لە ٢٠٠٦. دکتۆراناکەی لە زانستە سیاسییەکان لە زانکۆی بەیجین لە ١٩٨٨ وەدەستهێناوە، ئەستێرە گەشەی تیۆری سیاسی پارتی کۆمۆنیستە. جگە لە پۆستە ئەکادیمییە زۆرەکانی پسپۆری سەرەکی حکومەتە بۆ لێکۆڵینەوەکانی مارکسیزم. کە دەزگاو سەردەمێکی تازەیە بۆ ژمارەیەکی زۆر لە تیۆرستە سیاسییەکانی چین. هەروەها پۆستی جۆراوجۆری حکومی پێ سپێردراوە و لە نێوەندە ئەکادیمییەکان ریزێکی زۆری لێدەگیرێت بۆ لێکۆڵینەوەکانی.

ئەو لەگەڵ چەند کەسێکی تر لە تیۆرستە چینییەکان هەمیشە لەبەر چاون و هەست بە کارەکانیان دەکرێت سەبارەت بە نمونەی دیموکراسی چینی.

زهینگ بیجیان: Zheng Bijian: یەکێکە لە کاریگەرترین بیرمەندی بواری سیاسەتی دەرەکی و چاکسازی سیاسی. پۆست و پیشەی زۆر گرنگ و سەرنجراکێشی وەرگرتووە هەر لە مامۆستا لە زانکۆی میللی و جێگری وەزیری پروپاگەندە بۆ راپەراندنی کاروبار تا دەگات بە جێگری سەرۆکی قوتابخانەی ناوەندی حیزب. دەکوترێت کە راوێژکاری سەرۆکی چینی" جینتاوۆ" بێت. لە ساڵانی ١٩٧٠-١٩٨٠ وەك پاڵەوانێکی چاکسازییەکان دەرکەوت، ئەوسا زۆربەی وتارەکانی حیزبی دەنووسی و ئامادە دەکرد. لە

هەمورویشی گرنگتر ئەو وتارەی نووسی کە دینگ خیاو پینگ پێشکەشیکرد لە ۱۹۹۲ لە گەشتە بەناوبانگەکەی بۆ باشووری ولآت کە بانگەوازی چاکسازی ئابووری کرد دوابەدوای بە ئاگا هاتنەوەکەی تیانیانمین. لە ۲۰۰٤ پرۆژەی لێکۆڵینەوەیەکی ڕێکخستن بۆ بانگەشەی بووژانەوەی ئاشتی خواز"Peaceful Rise ". هەر چەندە بووژانەوەی ئاشتیخواز سەرکەوتنی وەدەستنەهێنا، بەڵام ئێستاش کاریگەری ئاوەڕۆکی بابەتەکە تا ئەمڕۆش لەسەر ئێوەندەکانی داڕشتنی سیاسەتی دەرەکی چین هەرماوە.ئێستاش سەرۆکی مونتەدای چاکسازی چینییە" China Reform Forum. کە راوێژکاری پێشکەش بە حکومەت دەکات. لە تازەترین کاریشدا لە پرۆژەیەك کاردەکات کە پێیدەڵێن پرۆژەی تازە کردنەوەی کەلتووری چینی.

زهانگ وییینگ:Zhang Weiying: بە ناوبانگترین ئابووری ناسی چینییە و یەکێکە لە سەرکردەکانی راستی تازە، یەکەم راگری قوتابخانەی بەڕێوەبردنی گوانگهوە Guanghua لە زانکۆی بەیجین و بەڕێوەبەری " دەزگای لێکۆڵینەوەی بزنس". لە زانکۆی بەیجین و سەنتەری بزنسی ئەلەکترۆنی e-Business.

لە ساڵی ۲۰۰۲ بە پیاوی ئابووری چینی دەرچوو لە لایەن کەناڵی تەلەفزیۆنی ناوەندی ولآت (CCTV). لە زۆر کۆمیتەی حکومی کاردەکات. دکتۆرانامەی PhD لە زانکۆی ئوکسفۆردی بەریتانی لە ژێر سەرپەرشتی هەڵگری خەڵاتی نوبل جەیمس میرلیس James Mirrlees دەستی هێناوە لە ۱۹۹٦. بەر لە چوونی بۆ ئوکسفۆرد لە ۱۹۹۰ وەك لێکۆڵەرەوە لە تیۆری سیاسەتی چاکسازی ئابووری کاریکردووە، کە ئێستا دەزگایەکی مردووە بە ناوی" لیژنەی دەوڵەت بۆ چاکسازی دەزگایی). یەکەمین کەس بوو کە پێزکەی " جووت ڕێگای نرخ دانانی داهێنا" بۆ چاکسازی. بەرزترین دەسەڵاتە سەبارەت بەتیۆری پرۆژەیی لە چینEnterpeise Theory و کاریگەری زۆری هەیە بەسەر ئێوەندە ئەکادیمییەکان و حکومەت و بزنس. بە پاڵەوانی قوتابخانەی لیبراڵە تازەکانی چین ناسراوە بۆ سیاسەتی گەشەسەندنی ئابووری لە چین. سەرەڕای ئەم هەمووەش ئەمڕۆ لە هەموو ئابووری ناسەکانی تر رەخنەی توندی لێدەگیرێت.

## سەرنج

ژمارەیەکی زۆر لە خواستنەوەکانی Quatations ئەم کتێبە لەو دیدار و چاوپێکەوتنانە هاتوون کە نووسەر لەگەڵ هزرڤان و بیرمەندە چینییەکان ئەنجامیداوە. ئەمویست راستەوخۆ لە خوارەوەی هەر لاپەرەیەك بیان نووسم نەوەك خوێنەری پێ بارگران بکەم.

## پەراوێز

ل.٥: بوونی خودی چین "China's very existence" گانگ یانگ، سێ ڕێسا مەزنەکەی سەردەمی تازە: تێکەڵبوونی سێ ڕێساکە و دووبارە سەرهەڵدانەوەی شارستانیەتی چینی، کۆڕێك بوو لە زانکۆی تسنگهوە لە بەیجین لە ٢٠٠٦. (و لە لایەن زهانگ فینگ وەرگێردراوە)

ل.١٠: خەونێك دروستکە، ڤکتۆر هیوگۆ، نامەیەکی کراوەیە کە ڤکتۆرهیوگۆ کە تیایدا کرداری سووتاندنی کۆشکی یوانیگیان Yuanming yuan ڕیسوا مەحکوم دەکات کە لە لایەن هێزە فەرەنسی و بەریتانییەکان ئەنجامدرابوو لە ١٨٦٠. ئەم بابەتە لەم سایتە دەستدەکەوێت بە ئینگلیزی

.hhh:# www. Pbase.com/ chlorophy/imag/6q1581z1

ل.١٢: خەونی ئەمریکی بەرزترین ئامانجە: یوکیپینگ:

The American dream is the highest ideal: by Yu Keping

Americanization ,Westernization, Signification,

Modernization Or Globalization of China?

ل.١٤: ڕەگەزپەرستی پێچەوانە "Revere Racism" : وانگ خیودۆنگ نەتەوەپەرستی چینی لە ژێر سێبەری جیهانگیریدا . کۆڕێکی بلاوەنەکراوەیە لە قوتابخانەی ئابووری لەندەن ٧ ڕەشەمەی ٢٠٠٥.

ل.١٤: بیرمەندە چینییەکان Chinescintellectuals سەری زەمەلیران Cui Zhiyuan. ئازادی دووەمی بیر. هونگ کۆنگ (Oxford University Press 1997).

ل. ١٤: لە ساڵی ١٩٨٠دا چووم: وانگ خیاودزنگ Wang Xiadong

In the 1980`s I went، ئەتەوە پەرستی چینی لە ژێر سێبەری جیهانگیریدا. کۆڕێکی بڵاوەکراوەی فۆتابخانەی ئابووری لەندەن ٧ ڕەشەمەی ٢٠٠٥.

ل. ١٥: ئەمڕۆ دەتوانین ببینین گان یانگ Today we can see: سێ ڕێسا مەزنەکەی سەردەمی تازە: تێکەڵبوونی سێ ڕێساکە و دووبارە سەرهەڵدانەوەی شارستانیەتی چینی، کۆڕێک بوو لە زانکۆی تسنگهوە ٢٠٠٦ لە پەیپین، وەرگێڕانی زهانگ فینگ.

بەشی یەکەم:

ل. ٢١: پەنجا ساڵ بەرلە دەستکردن بە دروستکردن، فرانز کافکا، دیواری مەزنی چین (Landon: Penguin, 2005).

ل. ٢١: p.21 وەك خۆی بە زمانی ئینگلیزی بنووسرێتەوە.

ل. ٢١: 131 of 274 inde pendent directors، زهانگ هۆنگی Zhang HONGYI، سەرمایەداران و ئابووری ناسان لە چینی تازە ئیڤان جۆنس Evan Jones.

ل. ٢١: derisively known as fanshipai or whateverists، دوای مردنی ماو، هوەگوۆفینگ Hua Guofeng هاتە جێگای و بە ئاشکرا بەردەوامی "سیاسەتی هەر چۆنێك بێت" ڕاگەیاند "Two Whatevers Policy" (ئەم سیاسەتە بریتییە لە پابەند بوونی حیزب بە هەموو سیاسەتەکانی سەرۆك ماو و جێ بەجێ کردنی هەموو بڕیارەکانی).

دوابەدوای هاتنی دینگ خیاوپینگ وەك سەرۆکی چین ئاماژکارەکە لە ڕاقەکانی کە پابەندی ئەم سیاسەتە ماوبە بوون بە دەستەی هەرچۆنێك بێت ناودەبران.

ل. ٢٣: Zhang weiying has a Favouriter E.S.steinfeld: "ئەسپەرمنگ کراوەکان" کەلتووری چاکسازی و دیاردەی بەشێك چاکسازی "Parcial Reform" MIT ئۆکتۆبەری ٢٠٠٢، لە لایەن Edward.S.steinfeld بڵاو دەکرێتەوە .

."China`s Market Visions"

ل. ٢٣: تیۆری جووت ڕێگای نرخ دانان "Dual-track prring" فان گانگ Fan Gang.